چاپی دووەم




مەریوان وریا قانیع

# لە چ ئیستایەکدا دەژین؟





# ناواخن



## بەشی یەکەم

## کۆمەڵگا وەک بازاڕێکی گەورە: دەربارەی بەرخۆری وەک دیاردەیەکی جەماوەری لە کۆمەڵگای ئێمەدا

## بەشی دووهەم

## ئیسلامی ئیخوانی و ئیسلامی سەلەفی: دوو پرۆژەی دینی لە کوردستاندا

## بەشی سێهەم

## کورد و پرۆژە گەورەکان



## بەشی چوارەم

## کورد و پرۆژە گەورەکان: پرۆژەی ئێران و خەونی بوونی ئێران بە هێزێکی ئەتۆمی

## بەشی پێنجەم
## کورد و پرۆژە گەورەکان: عەرەبستانی سعودیە و خەونی بەسەلەفیکردنی ناوچەکە



## بەشی شەشەم
## کورد و پرۆژە گەورەکان: ئیسرائیل و ئەمەریکا: تێکەڵبوونی ترس و نەوت و قازانج بەیەکتری

# پێشەکی
## لە کام ئێستادا دەژین؟

ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە سێ لێکۆڵینەوەی درێژە دەربارەی دۆخی ئێستای کۆمەڵگای ئێمە و دۆخی ئێستای دراوسێ گەورەکانمان لە ناوچەکەدا. ئەو ئێستایەش کە ئەم کتێبە قسەی لەسەر دەکات هەم "ئێستایەکی مێژووییە،" واتە ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییە مێژووییەیە کە لە ئێستادا ئامادەیە، بێگومان بە سەرجەمی ئەو بکەرانەوە کە لەو ئێستایەدا ئامادە و دەستبەکارن. هەم ئەو ئێستایە "ئێستایەکی تیورییە،" واتە ئێستایە وەک کێشەیەکی فیکری، وەک کۆمەڵێک پرسیاری تیوری و مەعریفی و وەک کۆمەڵێک چەمک و میتۆدی بینین و ڕاڤەکردنیش. هەر سێ نووسینەکەی ناو ئەم کتێبە لەنێوان ئەم دوو ئاستە جیاوازەی مامەڵەکردنی ئێستادا دێن و دەچن، چەند قسە لە مێژوو دەکات، ئەوەندەش هێما بۆ فیکرێکی تیوری دەکات، کە ئەو مێژووە دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵێک چەمک و وێنە و پێدراوی فیکری.

لە لێکۆڵینەوەی یەکەمدا، کتێبەکە باس لە دیاردەی

بەرخـۆری، واتـە ئیسـتیهلاک، دەکات، دیاردەیـەک کـە بـە بۆچوونـی مـن بـۆ یەکەمیـن جـارە لـە مێـژووی ئێمـەدا ببێـت بـە ئـاکاری سـەرەکیی کۆمەڵگای ئێمـە و لـە قۆناغەکانـی بـەر لەمرۆکـەی ئـەو کۆمەڵگایـەی جیـا بکاتـەوە. لـە کوردسـتانی ئەمڕۆدا بەرخۆری بووە بە دیاردەیەکی جەماوەریی بەرفراوان و لەوە کەوتـوە ئاکاری ئـەم یـان ئـەو گروپـی تایبەتـی نـاو ئـەو کۆمەڵگایە بێت بەتەنها. هـەم چینەکانـی خـوارەوە و هـەم چینـی ناوەڕاسـت و هـەم ئـەو نوخبـە دەسـەلاتدار و دەوڵەمەنـدەی بـە شـێوەیەکی ئەفسـانەیی لـە سـاڵانی ڕابـردوودا دەوڵەمەنـد بـووە، هەموویـان بەشـێکن لـەو شـەپۆلی بەرخۆرییـەی لـە وڵاتەکـەدا دروسـت بـووە. ئـەم بەرخۆرییـە ڕووی لـە هەمـوو ئاراسـتەکانە، وەک چـۆن بەرخـۆری ڕووبەرێکـی گـەورەی لـە چالاکییـە دونیایی و عەلمانییەکانی ئینسـانی ئێمـەی گرتوتـەوە، بـە هەمـان شـێوە چالاکییـە دینییەکانـی دونیـای ئێمـەش ڕوکارێکـی بەهێـزی بەرخۆرییـان وەر گرتـوە. وەک چـۆن کەرتـە نەخوێنـدەوار یـان کـەم خوێندەوارەکانـی دونیـای ئێمـە لـە بەرخۆرییـەوە ئـاڵاون، ئـاواش بەشـە خوێنـدەوار و ڕۆشـنبیرەکەی وڵات بەرخـۆرن. هەمـوو یەکـە کۆمەڵایەتییەکانیش بەرخـۆرن، هـەم خێـزان، هـەم خێڵ، هـەم حیـزب، هـەم مزگـەوت، هـەم دەزگاکانـی کۆمەڵگای مەدەنـی و هـەم دەزگاکانـی دەوڵـەت خۆیـان. بەکورتـی کۆمەڵگای ئێمـە چەنـدە کۆمەڵگایەکـی عەلمانیـی بەرخـۆرە، ئـاواش کۆمەڵگایەکـی دینیـی بەرخۆرییشـە، هـەم ڕووکارە عەلمانییـەکان و هـەم ڕووکارە دینییەکانـی ژیانـی ڕۆژانـەی ئـەو کۆمەڵگایـە لەنـاو چالاکیـی بەرخۆریـدا نوقمـن. گەورەبوونـی لەپڕ و چاوەڕواننەکراوی شـارەکانی کوردسـتان ئـەو

چوارچێوە مەدەنییەیە کە ئەم دیاردەی بەرخۆرییەی گرتۆتە خۆی. پێداگرتن لەسەر ئەم ئاستە سۆسیۆلۆژییە وەسفییەی دیاردەی بەرخۆریی، بەشێکی پەیامی ئەم کتێبەیە، بەشەکەی تری، وەک وتم، قسەکردنە لەسەر ئێستاییبوونی ئەو دیاردەیە وەک کێشەیەکی تیوری. لەم ڕووەوە ئەو پرسیارە تیورییانەی لە وتاری یەکەمی ئەم کتێبەدا دەیکەم و دەمەوێت وەڵامی بدەمەوە ئەمەیە: ئایا دەشێت بەرخۆری هەندێک دەرەنجامی کۆمەڵایەتی و کولتووریی پۆزەتیڤی هەبێت و ئایا دەشێت وەک ئەگەرێک بۆ دروستبوونی گۆڕانکاریی پۆزەتیڤ کار بکات؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە لەدوای خوێندنەوەی کتێبەکە ئاشکرا دەبێت.

خاڵێک کە گرنگە لەم سەرەتایەدا جەغتی لێ بکەم ئەوەیە، کە دیاردەی بەرخۆری دیاردەیەکی "خۆبەخۆ" و "سروشتی نییە" و گەشەکردنێکی خۆڕسکی کۆمەڵگای ئێمە دروستی نەکردوە، بەڵکو دیاردەیەکی سیاسی و ستراتیژیەتێکی تایبەتی کارکردنی دەسەڵات و مۆدێلێکی تایبەتی دەسەڵاتدارێتی دروستی کردوە و ئاراستەشی دەکات. لە ئەدەبیاتی زانستیدا ئەوەی لە پشتی ئەم سیستمە بەرخۆرەوە وەستاوە ئابووری و ڕژێمێکی سیاسی "ڕەیع"ییە، کە لەسەر فرۆشتنی کەرستەی خاو کار دەکات، لە دۆخی کۆمەڵگای ئێمەدا لەسەر فرۆشتنی نەوت، لە بازاڕەکانی جیهاندا و خەرجکردنی پارەی ئەو نەوتە، دەژی. ئابووری "ڕەیع"ی بەو جۆرە ئابوورییە دەگوترێت کە داهات تیایدا لە ڕێگای بەرهەمهێنانەوە بەدەست نایەت، بەڵکو لە ڕێگای بازرگانیکردن بەو کەرەستە خاوانەوە بەدەست دەهێنرێت کە

لە وڵاتەکەدا هەن. پارەی ڕەیع، پارەیەکی ئاسانە، ئیشی زۆر و ماندووبوونێکی ئەوتۆی ناوێت، بەدەستهێنانی ئەو پارەیە زیاتر ئاکاری دیاری و پاداشت وەر دەگرێت، تا ئاکاری پەیداکردنی لە ڕێگای کار و بەرهەمهێنانەوە، وەک وتیشم پەیداکردنیشی پێویستی بە ماندووبوون و ئارەقڕشتنێکی ڕاستەقینە نییە. خاڵی هەرەسەرەکی ئەم ئابوورییە بەگشتی و بەتایبەتیش ئەو ڕژێمە سیاسییەی لەپاڵ ئەم جۆرە ئابوورییەدا دروست دەبێت، ئەوەیە کە چارەنووسی سیاسی و ئابووریی ئەو ڕژێمانە لەدەستی خۆیاندا نییە. ئەوەی دەست دەکەوێت و پەیدا دەکرێت پابەستی کۆمەڵێک هۆکاری دەرەکییە، کە نە کۆمەڵگاکە خۆی و نە سیستمە سیاسییەکە، هێز و دەسەڵاتیان بەسەریدا ناشکێت، ناتوانن ئاراستە و کۆنترۆڵی بکەن و بەو شێوەیە بیجووڵێنن کە لەگەڵ سوود و قازانجە گشتییەکانی کۆمەڵگاکەیاندا تەبا بێت. سەرجەمی سیستمە سیاسییەکە خۆشی پشت بەو داهاتانە دەبەستێت کە فرۆشتنی ئەو کەرەستە خاوانە مەیسەری دەکەن و هەر قەیرانێک لە فرۆشی ئەو کەرەستە خاوانەدا دروست ببێت، لە هەر ئاستێکدا بێت، ڕاستەوخۆ قەیرانی گەورە بۆ سیستمە سیاسییەکە دروست دەکات. بە شێوەیەکی گشتییش ئەو شێوازە لە دەسەڵاتداریتی دروست بوو لەپاڵ نەوتدا لەسەر بچووککردنەوەی ڕۆڵی کۆمەڵگا و سڕینەوە و سنووردارکردنی تواناکانی کۆمەڵگا لە بڕیارداندا کار دەکات. لە هەموو ئەو مەسەلانەشدا کە پەیوەندییان بە ئێستا و ئایندەی ئەو کۆمەڵگایەوە هەیە، دواهەمین کەسێک بتوانێت قسە بکات و ڕا دەربڕێت کۆمەڵگایە. ئەمەش وا دەکات هەم سیستمە

سیاسییەکە لەق و ناجێگیر بێت و هەم کۆمەڵگاکەش بێئیرادە و بێئامانج و بێپلان بکرێت و نەهێڵدرێت لانی هەرەکەمی توانای لێپرسینەوە و بە بەرپرسیارکردنی ئەو هێزانەی هەبێت، کە بڕیار بۆ هەمووان لەو کۆمەڵگایەدا ئەدەن. لەم دۆخانەدا لەباتی ئەوەی کۆمەڵگا دەسەڵاتی بەسەر دەسەڵاتداران و دەزگاکانی حوکمڕانی و شێوازی بەڕێوەبردنی ئابووری و سیاسی و ئیداریدا بشکێت، خۆی دەکەوێتە ژێر زەبر و فشار و جەبری ئەو هێزانەوە کە حوکمی دەکەن.

ئەو هێزانەش کە شارەگەکانی ئەم جۆرە ئابوورییەیان بەدەستەوەیە، کۆمەڵێک کەسایەتیی سیاسی و نوخبەیەکی بازرگانی و هەندێک خێزان و بنەماڵەی دەسەڵاتدارن، کە بە لۆژیکێکی مافیایی بەشی هەرەزۆری توانا ئابوورییەکان مۆنۆپۆڵ دەکەن و بەشی هەرەزۆری دەسەڵاتەکانیش لە دەستی خۆیاندا کۆ دەکەنەوە. شێوازی دابەشکردنیان بۆ داهاتی نەوت و داهاتەکانی تر بە ڕادەیەکی گەورە نایەکسان و نادادپەروەرە کە جیاوازی و بۆشای و ململانێی کۆمەڵایەتیی هێجگار گەورە دروست دەکات لەنێوان ئەوانەی هەیانە و ئەوانەی نیانە. ئەم دۆخە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا فراوانتر و بەهێزتر دەبێت و ئەو مەسافەیەش کە دروست بووە و دروست دەبێت، ڕۆژانە گەورەتر دەبێت. ئەم بۆشاییە کۆمەڵایەتییە دەگۆڕێت بۆ بۆشاییەکی ڕەمزیی و بۆشاییە ڕەمزییەکەش لە گەشەی خۆیدا دەبێت بە پراکتیکی کۆمەڵایەتی، بە کردەی بێزاربوون و نارەزاییدەربڕین و یاخیبوون. ئەم دۆخە کە ڕێگا سەرەکییەکانی پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی مۆنۆپۆلکراون و بەتەواویش پڕ کراون لە ڕێگری

گەورە لەبەردەم گەشەکردن و پێگەیشتنی سەربەخۆدا، هەموو ئەو هێزانە تووڕە دەکات کە ناتوانن گەشەیەکی سەربەخۆ و کراوە بکەن، کە ناتوانن ژیانی خۆیان بەو شێوەیە ڕێک بخەن کە لەگەڵ لانی کەمی حەز و چاوەڕوانی و ویستە کۆمەڵایەتییەکانیاندا بگونجێت.

ئەم نەخشە و تۆڕە کۆمەڵایەتییە تایبەتە سیستمێکی سیاسیی دەسەڵاتگەر، ئەوتۆریتێر، دروستی کردوە، کە ڕۆژبەڕۆژ ئاکارە سولالی و بنەماڵەییەکەی دیارتر و فراوانتر دەبێتەوە و گەر گۆڕانکاریی ڕاستەقینە و فرەلایەن ڕوو نەدات لە دەساڵی داهاتوودا، کۆمەڵگای ئێمە گیر دەخوات بەدەست نەوەی دووهەمی ئەم بنەماڵە سیاسییانەو. نەوەیەک کە نە ئارەقی لە شۆڕشەکانی کوردستاندا ڕشتوە و نە ئاگای لە گۆڕانە گەورەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی هەیە و نە سەریش لەو دونیایە دەر دەکات کە بەدەوروبەریدا دروست بووە. نەوەیەکی گەنج، کە ژمارەیەکی زۆریان لەناو بەملیۆنێربوونی خێرای دونیای دوای ڕاپەڕیندا چاویان کردۆتەوە و گەورە بوون. ئەم نوخبەیە لە دونیایەکی نیولیبرالدا دەژی و تێکەڵ بە زۆرێک لە گەمە سیاسی و ئابووری و ماڵییە مافیایی و نیمچەمافیاییەکانی ئەم سیاسەتی نیولیبرالە بووە و لەپاڵ ئەودا دەژی و بەهێز دەبێت. ئەو تێزەی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەرگری لێ دەکات ئەوەیە، کە بەرخۆری لەم دۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییە تایبەتەی کوردستاندا کراوە بە ئایدیۆلۆژیای باڵادەست و بە یەکێک لە پایەکانی مانەوەی ئەو دەسەڵاتدارێتییەی کە دەیەوێت لە ڕێگای بەرخۆرییەوە درێژە بە مۆدێلە مافیاییەکەی حوکمڕانیی خۆی بدات. لەم

دۆخەدا بەرخۆری بە هەموو مانا نێگەتیڤ و پڕ هەڕەشە و کێشەکانیەوە ئامادەیە، هەوڵی بەڕەهاکردنی هەڵپەی گەورە بەدوای دەوڵەمەندبوونی خێرا و سەرفکردندا ئەدات، بە جۆرێک بتوانێت جۆرێک لە تاکگەراییی خۆپەرستی نەرجسی فووتێکراوی ناسیاسی و نارەخنەیی دروست و باڵادەست بکات. تاکگەراییەکی نارسیستیی پەرگیر، کە نەک تەنها لە هەموو ڕەهەندێکی سیاسی و ڕەخنەیی داماڵدرابێت، بەڵکو لە زۆر ئاستیشدا پەیوەندییە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکانی دونیای ئێمە وێران بکات و ئەو ڕۆحی هاریکاری و بەدەمەوەچوون مشوورخواردنەی کۆمەڵگای ئێمە بە درێژاییی چەندان سەدەی کاری پێکەوەیی و ئەزموونی پێکەوەژیانێکی بەرپرسیارانە دروستی کردوە، وێران بکات. ئەم تێزە یەکێکە لە تێزە سەرەکییەکانی ئەم کتێبە، بەڵام تاقە تێزێکی کتێبەکە نییە. لە لێکۆڵینەوەی یەکەمدا لەسەر بەرخۆری تێزەیەکی تریش پێشنیار کراوە کە بەکردەی بەرخۆری هەندێک ئاکار و ئەگەری پۆزەتیڤ دەبەخشێت. لێرەدا بەرخۆریزم، سەرەڕای ئەو ڕۆڵە ئایدیۆلۆژییە نێگەتیڤەی باسمان کرد، کۆمەڵێک ئەگەری نوێش دەکاتەوە بۆ دروستبوونی جۆرێک لە تاکەکەس و شێوازێکی نوێی تاکگەرایی کە دەشێت هەڵگری وزەیەکی کۆمەڵایەتی و ئینسانیی نوێ بن و وەک شێوازی نوێی بەرگریکردن و ئامرازی نوێی گۆڕانکاری لەدایک ببن. خاڵێک کە پێویستە لە ئێستاوە بۆ هەموو خوێنەرێک ئاشکرا بێت، باسکردنی ئەم ڕەهەندە پۆزەتیڤەی بەرخۆریزم بانگەشەکردن نییە بۆ ئەخلاق و ئابووری و سیاسەتی بەرخۆریزم، دیتنی بەرخۆریزم نییە وەک ئایدیۆلۆژیایەکی

گۆڕانخوازی پۆزەتیڤ لە دونیای ئێمەدا. بە پێچەوانەوە ئەم لێکۆڵینەوە بەشێکی گەورەی ئەو دیدە فیکرییانەی قبوڵە کە بەرخۆریزم وەک یەکێک لە دیاردە ترسناکەکانی دونیای ئەمڕۆ وێنا دەکەن، وەک یەکێک لەو دیاردانەی ئینسانی بێباک و ناسیاسی و داخراو بە ڕووی دونیای کۆمەڵایەتی و خاوەنی نەرجسیەتێکی فووتێکراو دروست دەکات. بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیە بەرخۆریزم تەنها بۆ ئەم ڕەهەندە خراپ و وێرانکەرە کورت ناکاتەوە، بەڵکو هەوڵ ئەدات لە ڕەوتی کۆمەڵگای ئێمەدا ئەگەری ڕۆڵە پۆزەتیڤەکانی ببینێت، بۆ نموونە ڕۆڵی بەرخۆریزم لە دوورکەوتنەوە لە مۆرال و ئەخلاق و سیستمی بەهای دەستەجەمعیی پڕوکێنەری ناسیۆنالیزم و دین و ئەخلاقیاتی تەقلیدی و هاریکاریکردنی لەدایکبوون و دەرکەوتنی سەرەتاکانی جۆرێکی نوێ لە تاککەرایی هێمن و بەرپرسیار کە بشێت و بتوانێت هەڵوێستێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی جیاوازی هەبێت، لەوەی دەسەلاتداران چاوەڕوانن بەرخۆریزم لەناو ئینسان و کۆمەڵگای ئێمەدا دروستی بکات.

کۆمەڵگای ئێمە ئەمڕۆکە تێکەڵێکی ئاڵۆزە لە تازەبوونەوە و تەقلیدیەت، لە دین و عەلمانیەت، لە دەسەلاتی پاتریارکی و دەسەلاتی دیسپلینکەری مۆدێرن. هاوکات ئەو کۆمەڵگایە لە یەک کاتدا هەم پڕە لە تابۆ و حەرامی دینی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسی و هەم پڕیشە لە کردەوە و ئاکار و پراکتیکی شکاندنی هەریەکێک لەو تابۆ و حەرامانە، بەلام زۆربەی کات بە شێوازێکی نهێنی و جارنەجاریکیش بەئاشکرا. ئیتر لە شکاندنی تابۆکانی دەوروبەری جنس

و خۆشەویستی و پەیوەندییەکانی نێوان نێر و مێ و نێر و نێرەوە بیگرە، بۆ پیادەکردنی شێوەژیانی جیاواز لە شێوەژیانی باڵادەست و شکاندنی ئەو تابۆیانەی بە ڕووی شێوازی ئامادەبوون لە فەزای گشتیدا بەرز کراوەتەوە. یەکێک لە خاڵە دڵخۆشکەرەکانی ئەمڕۆکەی ئەو کۆمەڵگایە لەوەدایە کە ڕەخنەی سیاسی چیدی ڕەخنەیەکی نهێنی نییە، هەندێک جاریش ڕەخنەی دینی خەریکە دەبێتە ڕەخنەیەکی ئاشکرا، ئەگەرچی هێزە ئیسلامییەکان تا ئێستا هەمووشتێکیان کردوە و دەکەن بۆ ڕێگرتن لە دروستبوونی توانا و ویستی ڕەخنەکردنی دین لە کۆمەڵگای ئێمەدا. بەدیوی ئەودیودا چەندان دەنگی نوێش هەن کە ڕەخنەی خێزان و شێوەژیانی جنسی و پەیوەندییەکانی نێوان نێر و مێ دەکەن و ئاسۆی نوێ و دیدی نوێ بۆ ڕێکخستنەوەی ئەو پەیوەندییانە پێشنیار دەکەن. بە بۆچوونی من ئەمڕۆ پرۆسەیەکی گەورە و بەرفراوانی شکاندنی تابۆکان لە هەموو ئەو ئاستانەدا ئامادەیە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە زۆربەی هەرەزۆریان وەک کردەیەکی نهێنی و داپۆشراو ماونەتەوە، تا ئێستا ئازایەتی و چاوقایمیی کۆمەڵایەتی نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی بکرێت بەشێکی گرنگی ئەم تابۆشکێنییە بهێنرێتە ناو فەزای گشتیی کۆمەڵگاوە. لۆژیکی گەشەکردنی بەرخۆری ڕەنگە بتوانێت لە ساتێک لە ساتەکاندا هاریکاری ئینسانی ئێمە بێت بۆ ئانجامدانی ئەم کارە و ڕەنگە بتوانێت ببێت بە یەکێک لەو هۆکارانەی کە یارمەتی لەدایکبوونی ئەم ئازایەتی و چاوقایمییە کۆمەڵایەتییە بێت. دەڵێم بەرخۆری دەشێت بتوانێت ئەم ڕۆڵە ببینێت، ناڵێم بەرخۆری بەحەتمی ئەم ڕۆڵە دەبینێت.

خاڵێکی تر کە لێکۆڵینەوەی یەکەم بەرگری لێ دەکات ئەوەیە کە بەرخۆری بووە بە ئایدیۆلۆژیایەکی جەماوەریی بەرفراوان و لەزۆر ڕووەوە بەهێزتر و بەفراوانترە لە ئایدۆیۆلۆژیای ناسیۆنالیزم لە کوردستاندا. کۆمەڵگای ئەمڕۆکەی کوردستان شاهێدی دروستبوون و بەهێزبوونی کولتووری بەرخۆری و بڵاوبوونەوەیەکی خێرای بەها و ئەخلاقیاتی بەرخۆرییە. ئەمەش بۆتە هۆکاری دروستبوونی جۆرێکی نوێ لە خودسازی و بەتاکەکەسبوون کە لە زۆر ڕووەوە جیاوازە لەوەی کە پێشتر لەو کۆمەڵگایەدا لەئارادا بووە. تا ١٥ ساڵێک لەمەوبەر یەکەی هەرە گرنگ لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەو یەکە دەستەجەمعییانە بوون کە لە تاکەکەس گەورەترن، لەوانە خێزان، حیزب، خێڵ، پەیوەندییەکانی خزمخواهی. بە زۆر مانا ئەم شێوازە لە ئینتیمای دەستەجەمعی ڕێگر بووە و ڕێگرە لەبەردەم دروستبوونی ئینتیما بۆ کۆمەڵگا یان نەتەوەدا وەک دوو یەکەی گەورەتر لەو یەکە دەستەجەمعییە بچووکانە. ئەوەی ئەمڕۆ لە هەندێک ئاستدا ڕووی لە گۆڕانە، لاوازبوونی ئینتیمایە بۆ ئەو کۆمەڵە دەستەجەمعییانە و بەهێزبوونی ئیتیمایە بۆ خود یان بۆ تاکەکەس خۆی. ئەمەش لە ئێستادا شێوازێکی هێجگار ئاشکرا و بەرچاوی ئەنانیەت و خودئەڤینیی پەرگیری لە کوردستاندا دروست کردوە. وەک وتم ئەم دۆخە هەڵگری کۆمەڵێک ئاکاری نێگەتیڤ و خراپە و لە زۆر ڕووەوە کەسایەتیی ئینسانی ئێمە کورت دەکاتەوە و دەیگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی بەرخۆر بەتەنها، لەم ئاستەدا ئەم لێکۆڵینەوەیە گرنگییەکی تایبەت بە بۆچوونەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەدات لەسەر ڕووکارە نێگەتیڤەکانی

بەرخـۆری و گرنگی بـە بۆچوونەکانـی فەیەلسـوفی هۆڵەنـدی هـاری کونەمـان دەدات دەربـارەی دروسـتبوونی "کۆمەڵـگای منـی قەڵـەو و فووتێکـراو." کۆمەڵگایـەک جۆرێـک لـە "مـن"ی فووتێکراو و جۆرێک لـە نەرجسیەت و خودپەرستی دروست دەکات، کـە دەشـێت ببێتـە هـۆکاری وێرانکردنـی هەسـتکردن بـە بەرپرسـیاریەت و هاریـکاری و هاودەردیـی کۆمەڵایەتـی. بـەڵام وەک پێشـتریش وتـم ئـەم نووسـینە لـەم ئاستەشـدا دیـاردەی بەرخـۆری تەنهـا وەک کولتـووری گەوجانـدن و مێشکشـۆرینەوە وێنـا نـەکات، بەڵکو پـێ لەسـەر ئـەو ئەگـەر و توانـا و مـەودا پۆزەتیڤانـەش دادەگرێت کە بەرخـۆری دەشـێت بـە ئینسـان و کۆمەڵـگای ئێمـەی ببەخشـێت. بەتایبەتـی ئـەو ڕۆڵـەی کـە بەرخۆریـی دەتوانێت ببینێت لـە کردنـی "مـن" بـە پێدراوێکـی کۆمەڵایەتـی و کولتووریـی گرنـگ و لاوازکردنـی پێداگرتـن لەسـەر ئـەو "ئێمـە" کۆمەڵایەتییـەی کـە ڕۆحـی گـروپ و ڕۆحـی دەسـتەجەمعی بەسـەر ڕۆحـی تاکەکەسـیدا بـە شـێوەیەکی پەڕگیـر و ترسـناک زاڵ دەکات. بەکورتـی ئـەم وتـارە دەیەوێت ئـەوەش نیشـان بدات کـە بەرخـۆری دەتوانێت ببێتـە هـۆکاری دروسـتبوونی فەزایەکـی گشـتیی نـوێ، کـە تێیـادا تاکەکـەس گرنگییەکـی تایبـەت وەر بگرێـت، هەروەهـا بـۆ نموونـە، دەسـکاریی وێنـە تەقلییەکانـی پیاوەتـی بکات و لەپـاڵ ئـەو وێنانـەدا شـێوازی نـوێ و وێناکردنـی نـوێ و نەرمتـر بـۆ پیاوەتـی پێشـنیار بـکات.

تێزێکـی تـر کە ئـەم لێکۆڵینەوەیە لەسـەر بەرخۆریی بەرگری لـێ دەکات ئەوەیـە، کـە بەرخـۆری تەنهـا دروسـتکراوێکی ئایدۆلـۆژی و سیاسـی نییـە، ڕاسـتە ڕۆڵـی دەسـەڵات لـە

دروستکردنی ئەم ئایدیۆلۆژیایەدا ڕۆڵێکی هێجگار گرنگە، بەڵام ئەم ئایدیۆلۆژیایە لە بۆشاییدا کار ناکات، لە هیچ و لە سفرەوە دروست نەکراوە، بەڵکو ئەم ئایدۆلۆژیایە بناغەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووریی هەیە، بەشێکە لە پرۆسەی گەشەکردن و گۆڕانی کۆمەڵگای ئێمە لە کۆمەڵێک ئاستی جیاوازدا. ئەمەیە وا دەکات سەرەڕای ئەو دۆخە پڕ گەندەڵی و دزی و جەردەییەی کە هەیە، هێشتا ناڕەزایەتیی کۆمەڵایەتی نەیتوانیێت لە ئاستی گوتارەوە بگوازێتەوە بۆ ئاستی کردە و پراکتیکیی کۆمەڵایەتی و لە ئاستی بۆڵەبۆڵی کۆمەڵایەتییەوە نەبووبێت بە یاخیبوونی کۆمەڵایەتی.

بەکورتی بەرخۆری لەم لێکۆڵینەوەیەدا وەک دیاردەیەکی ئاڵۆز و فرەڕەهەند وێنا کراوە، ئەگەرچی دەسەڵات وەک ئایدیۆلۆژیای بێدەنگ و باسیڤکردنی کۆمەڵایەتی بەرهەمی هێناوە، بەڵام ئەگەری ئەوەشی تێدایە ببێتە ئایدیۆلۆژیای ناڕازیبوون و یاخیبوونی کۆمەڵایەتی. ئەمەش ئەوەم نیشان ئەدات کە کێشەی سیاسەتی کوردی کێشەی گۆڕانیەتی بۆ دایناسۆرێکی گەورە، بەڵام بە سەرێکی زۆر بچووکەوە، سەرێک کە توانای ئاراستەکردنی ئەو لەشەی نییە کە ڕۆژانە لەپاڵ گەندەڵی و خراپبەکارهێانی دەسەڵات و دزی و جەردەییدا بەردەوام لە گەورەبووندایە. بێگومان ئەم لێکۆڵینەوەیە بانگەشە نییە بۆ خۆشبینییەکی کاڵفامانە، بەڵکو هەوڵدانێکە بۆ بینینی ئاڵۆزیی دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی دونیای ئێمە و ڕزگاربوون لەو لۆژیکە ڕۆشنبیرییە دووجەمسەرەی کە دیاردەکان تەنها بە لۆژیکی ڕەش و سپی دەبینێت.

لێکۆڵینەوەی دووهەمی ئەم کتێبە دەربارەی بوونی دوو پرۆژەی دینیی گەورەیە لە کوردستاندا، پرۆژەی "ئیخوانی موسلیمین" و پرۆژەی "سەلەفیەتی دینی." پرۆژەی یەکەمیان خەریکی بەسیاسیبکردنێکی بەرفراوانی دینە و ڕۆحی ئەکتیڤیستی سیاسی بە دین بارگاوی دەکات، لە کاتێکدا پرۆژەی دووهەمیان سەرقاڵی نمایشکردنێکی ڕووکەش و بێناوەرۆکی دینە لە فەزای گشتیی کۆمەڵگادا. ئەگەر لۆژیکی بەسیاسیکردن لە پرۆژەی یەکەمیاندا باڵادەست بێت، ئەوا لۆژیکی ئیستیعرازکردن، واتە دەرخستنێکی شانۆیی، دین لە کۆمەڵگادا باڵادەستە. هەردوو پرۆژەکەش لە چەندان ڕووەوە نادیموکراسین و بە ناوی موقەدەسێکی دینیی ڕەهاوە دەدوێن. یەکەمیان موقەدەسێکی دینیی تایبەت دەباتە ناو سیاسەتەوە، ئەوی تریان ناو هەموو خانەیەکی کۆمەڵایەتییەوە. دوادەرنجامی ئەمەش دروستکردن و بەهێزکردنی لەشکرێکی گەورەی چالاکەوانی سیاسی و کۆمەڵایەتییە، کە بە ناوی ئەو موقەدەسە دینییانەوە شێوازێکی ترسناکی توندوتیژیی ڕەمزی لە کۆمەڵگای ئێمەدا پیادە دەکەن. هەردوو پرۆەژەکەش لەوەدا وەک یەکن کە هەوڵی ئەوە دەدەن خودی کۆمەڵگا خۆی بکەن بە ئامرازێکی گەورەی سانسۆرکردن. ئەم دوو پرۆژەیە تەنها کوردستان پڕ ناکەن لە جۆرێکی خراپ و نادیموکراسی و داخراوی دین، تەنها سیاسەت و موقەدەس بەیەکدی تێکەڵ ناکەن، تەنها دین لە هەموو مانایەکی قووڵ و ویژدانی بەتاڵ ناکەنەوە، بەڵکو هەوڵی ئەوەش ئەدەن ئەو دینە میللییەی کە هەیە، دینێک کە کراوەتر و لێبوردترە لە دینی ناو ئەو دوو پرۆژەیە، ویران

بکەن و بە دیدی خۆیان بۆ دین شوێنی بگرنەوە. بەکورتی کێشەکە لە بنەڕەتەوە کێشەی بەسیاسیکردنی دین نییە، یان کێشەی ئەوە نییە کە دین ڕۆڵی سیاسی ببینێت، بەڵکو کێشەی ئەوەیە دین کام سیاسەت دروست دەکات و کام ڕۆڵ دەبینێت. چۆن لە خۆی دەڕوانێت و چۆن لەناو فەزای گشتیی کۆمەڵگادا ئامادە دەبێت. ڕامان لە ئێستاییبوونی دین لە کوردستاندا خاڵی سەرەکیی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە.

لێکۆڵینەوەی سێهەمی ئەم کتێبە دەربارەی دراوسێ گەورەکانی کۆمەڵگای ئێمەیە. هەوڵدانێکە بۆ خوێندنەوەی ئێستاییبوونی ئەو دراوسێیانە، ڕامانێکە لە پلان و پرۆژە و نیازی ئەم دراوسێیانە بۆ ناوچەکە و شوێنی کۆمەڵگای ئێمە لەناو ستراتیژییە گەورەکانی ئەم دراوسێیانەدا. ئەم لێکۆڵینەوەیە گەرچی دەچێتە خانەی لێکۆڵینەوەی سیاسییەوە، بەڵام بەشێکە لە خوێندنەوەی ئەو ئێستایانەی کە کۆمەڵگای ئێمە لەمڕۆدا لەناویاندا جێگیرە. لێکۆڵینەوەکە باس لە ئەگەر و تواناکانی کۆمەڵگای ئێمە دەکات لەناو ئەو دونیا ئاڵۆزەی لەم دەیەی دواییدا لە خۆرهەڵاتی ناوڕاستدا دروست بووە. ئەو دراوسێیانەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەدرێژی باسیان کراوە بریتین لە تورکیا، ئێران، سعودیە و ئیسرائیل. ئەمانەش هێزگەلێکی بەهێزن و بە شێوازی جیاواز لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا ئامادەن.

وتاری دووهەم و سێهەمی ئەم کتێبە پێشتر بڵاو بوونەتەوە، بەڵام ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە دوای دەسکاریکردنێکی بەرچاوی هەردوو وتارەکەیە، بەڵام وتاری یەکەمیان یەکەم جارە بڵاو دەبێتەوە. وەک هەمیشە هیوادارم

وتارەکانـی نـاو ئـەم کتێبـە ببنـە مایـەی کەوتنـەوەی هەندێـک بەرخـورد و گفتوگـۆی فیکریـی بەرهەمهێـن و ببنـە هۆکارێـک بـۆ زیاتر تێگەیشـتن لـەو ئێسـتایەی هەموومـان تیایدا نیشـتەجێ و دەرگیریـن.

پاییزی ٢٠١٢
هۆڵەندا، ئەمستردام

## دەربارەی بەرخۆری وەک دیاردەیەکی جەماوەری لە کۆمەڵگای ئێمەدا

**سەرەتا**

کۆمەڵگای ئێمە خەریکە دەبێت بە یەکێک لە بەرخۆرترین کۆمەڵگاکانی ناوچەکە و چالاکیی سەرەکی ئینسانی ئێمەش خەریکە کورت دەبێتەوە بۆ چالاکیی بەرخۆری. ئەم دۆخە تایبەتەش [کۆمەڵگا تووشی کۆمەڵێک قەیرانی گەورە دەکات، بەڵام هاوکات هەندێک ئەگەری نوێی لەبەردەمدا دەکاتەوە.] ئەم نووسینە هەوڵدانێکە بۆ خوێندنەوەی دیاردەی بەرخۆری لەمرۆکەی ئەو کۆمەڵگایەدا بە هەموو کێشە و ئاڵۆزی و تەحەدا و ئەگەرەکانیەوە.

**بەرخۆری چییە؟**

بەرخۆری چالاکیی کڕین و بەکارهێنانی ئەو شتومەکانەیە کە ئینسان لە ژیانی ڕۆژانەیدا پێویستی پێیانە. شوێنی کڕینی ئەو شتومەکانەش بازاڕە، لێرەوە بەرخۆری و بازاڕ دەبنە دووانەیەکی لێکدانەبڕاو. لە هەر شوێنێکی دونیادا کە باسمان

لە بەرخۆری کرد باس لە بازاڕ دەکەین و کە باسیشمان لە بازاڕ کرد باس لە بەرخۆرییش ئەکەین. هەموو مرۆڤێک بۆ ئەوەی بژی و بمێنێتەوە پێویستی بەوەیە ڕۆژانە بڕێک بەرخۆری بکات. هاوکێشەکە لە ڕووی ئابوورییەوە زۆر سادەیە، ئەگەر کەسانێک نەبن نان لە نانەوایەک، یان میوە و سەوزە لە بەقاڵێک، یان جلوبەرگ لە کۆگایەک، یان گۆڤارێک لە کتێبخانەیەک، بکڕن، ئەوکات هیچ یەکێک لەو شوێنانە بوونیان نابێت و شتێکیش بەناوی ئابوورییەوە دروست نابێت. بەم مانایە ئابووری بۆ ئەوەی وەک کایەیەکی تایبەت لە کۆمەڵگادا بوونی هەبێت، دەبێت بەرخۆری هەبێت. ئەوەی من لەم وتارەدا هەوڵی تێگەیشتن و خوێندەوەی دەرکەوت و مانا و دەرەنجامەکانی ئەدەم ئەم ئاستە سادە و گشتییەی بەرخۆری نییە، ئەو ئاستەی بەرخۆری نییە کە ڕاستەوخۆ گرێ دراوە بە دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیانی ئینسانییەوە، واتە بەو ئاستەوە کە ئینسان پێویستی پێیەتی بۆ مانەوە و بەردەوامبوون. ئەوەی من لێرەدا خۆمی پێوە خەریک دەکەم: ئامادەگیی بەرخۆرییە وەک کولتوور، یان وەک ئایدیۆلۆژیایەکی جەماوەری. کە باس لە بەرخۆری وەک کولتوور یان وەک ئایدۆلۆژیا دەکەم دەمەوێت هێما بۆ ئارەزوو و حەز و سیاسەتێک بکەم کە بەرخۆری تیایاندا ئاستی تێرکردنی ئەم یان ئەو پێداویستیی بنەڕەتی تێدەپەڕێنێت و دەبێت بە دیاردەیەکی جەماوەریی گەورە و بەشێکی زۆری کۆمەڵگا بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات. ئەوەی بەرخۆری لەم ئاستەدا لە ئاستە سادەکەی جیا دەکاتەوە ئەوەیە لێرەدا "بەها سەرەکی و باڵادەستەکانی کۆمەڵگا لە

چالاکیی بەرخۆرییەوە سەرچاوە دەگرن." (Hayward 2004: 144) واتـە بوونـی بەرخـۆری بـە ئایۆلۆژیـا لـەو جێگەیـەدا بەرجەسـتە دەبێت کە بەرخۆری تیایدا دەبێت بە سـەرچاوەی شـووناس، دەبێت بـە سـەرچاوەی بەهـا باڵادەسـتەکان، دەبێت بـە بەشـێک لـە چاوەڕوانییـە سـەرەکییەکانی ئینسـان و دەبێت بـە بەشـێک لـەو پەیوەندییانـەی کـە کـەس و گـروپ و هێـزە کۆمەڵایەتییـەکان بەیەکـەوە گـرێ ئـەدات. لـەم دۆخانـەدا کۆمەڵـگا بەگشـتی وەک بـازاڕ یـان وەک مۆڵێکـی گـەورە دەر دەکەوێت تـا هـەر شـێوازێکی تـری پێکەوەبوونـی کۆمەڵایەتـی. لێـرەدا شـێوازە جیاوازەکانـی ژیانـی کۆمەڵایەتـی و ئوسـلوبە جیاوازەکانـی ژیـان، بـە بەرخۆرییەکـی بەرفـراوان گەمـارۆ ئەدرێت. لـە دونیایەکـی لـەو بابەتـەدا زۆربـەی پەیوەندییـەکان و بەهـاکان و شـێوازە جیاوازەکانی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی، دەبن بـە "شـتومەک"ی قابیلی فرۆشـتن و بەکارهێنـان، تەنانـەت بەشـێکی بەرچـاوی فیکـر و مەعریفـە و فێربوونیـش دەبنـە جۆرێک لـە شـتومەک و دەبنـە یەکێک لـەو ئامرازانـەی هەندێک گروپ و تاکەکەسـی تایبـەت بـە هۆیانـەوە تەعبیر لـە شـوێن و جێـی کۆمەڵایەتیـی خۆیـان دەکـەن.

لـە ڕووی مێژووییـەوە گۆڕانـی بەرخـۆری بـۆ کولتـوور و دیاردەیەکـی جەماوەریـی بەرفـراوان دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕۆژگاری دوای جەنگـی جیهانـی دووهـەم، بەتایبەتـی لـەو بەشـەی دونیـادا کـە بـە خۆرئـاوا ناسـراوە. لـە بەشـێکی زۆری ئـەم کۆمەڵگایانـەدا "بەرخـۆری" جێگـای "بەرهەمهێنـان" لـە پێناسـەکردنی ئـەو سیسـتمە ئابوورییـەدا دەگرێتـەوە کـە لەو کۆمەڵگایانەدا ئامادەیە، بەرخـۆر شـوێنێکی گرنـگ و ناوەنـدی لـە ژیانـی ئابـووری و

کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی ئەو کۆمەڵگایانەدا داگیر دەکات (Hall 2008: 109). لە بەشەکانی تری دونیادا، ئەم دیاردەیە، بەتایبەتی لە ئاستە جەماوەرییەکەیدا، دوا دەکەوێت بۆ دە یان بیست ساڵی ڕابردوو. ئەوەی بەرخۆریی خۆرئاوا لە بەرخۆریی بڕێکی زۆری کۆمەڵگاکانی دەرەوەی خۆرئاوا جیا دەکاتەوە ئەوەیە، کە بەشی زۆری ئەو بەرخۆرییەی خۆرئاوا، خۆرئاوا خۆی بەرهەمی دەهێنێت، یان لانی کەم کلیلە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی ئەو بەرخۆرییەی لەدەستدایە. لە کاتێکدا لە زۆرێک لە کۆمەڵگاکانی دەرەوەی خۆرئاوادا، بۆ نموونە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، بەرخۆریی لە کاتێکدا دەبێت بە کولتوور و بە ئایدیۆلۆژیا کە ئەو کۆمەڵگایانە خۆیان توانای بەرهەمهێنانی هیچی ئەوتۆیان نییە، ئەو سیستەمە ئەخلاقی و سیاسی و کۆمەڵایەییانەیان تێدا نییە کە بتوانێت هەم سوود لە هەندێک دەرکەوتی تایبەتی بەرخۆری ببینێت، هەم بە گژی هەندێک لە دەرکەوتە خراپەکانیدا بچێتەوە. لەم کۆمەڵگایەنەدا بەرخۆری بووە بە ئایدیۆلۆژیا، بەبێ بوونی ئەو ئامرازانەی کە دەتوانن بڕێک لە مەترسییەکانی ئەم ئایدیۆلۆژیایە لە ئاستە عەمەلی و کردەگییەکەیدا کۆنترۆڵ و چاودێری بکەن. لەم کۆمەڵگایانەدا هێشتا وشیاریی بەگژاچوونەوەی دەرکەوتە خراپەکانی بەرخۆری دروست نەبووە، چجای ئەوەی ئەو وشیارییە گەشەی کردبێت بۆ ئاکاری بەگژاچوونەوەی ئەو دیاردانە.

بەرخۆریی جەماوەری دیاردەیەکی سروشتی نییە، شێک نییە خودا بە ئینسانی دابێت، یان "جەوهەر"ێکی گریمانکراو کە ئینسانبوون دروستی کردبێت، بەرخۆری دروستکراوێکی

کۆمەڵایەتییە، دیاردەیەکە ڕادە و ئاکار و ماناکانی بەپێی هێزە کۆمەڵایەتییەکان و بەپێی کۆمەڵگا جیاوازەکان دەگۆڕێت. بەرخۆری بۆ چینە باڵادەستەکان مانایەکی هەیە جیاواز لە بەرخۆریی چینەکانی خوارەوە، بۆ خەڵکی خوێندەوار مانایەکی هەیە جیاواز لە خەڵکانی نەخوێندەوار، لە بەشێکی دونیادا مانایەکی هەیە جیاواز لەوەی لە بەشەکانی تردا هەیەتی. لە فەرهەنگێکەوە بۆ فەرهەنگێکی تر ماناکانی دەگۆڕێت.

بە بۆچوونی من دەکرێت دوو قۆناغی سەرەکی لە بەرخۆریی جەماوەریدا لەیەکدی جیا بکەینەوە. بۆ نموونە هەر کۆمەڵگایەک کە تازە دەچێتە ناو بەرخۆریی جەماوەرییەوە بە قۆناغی "هەڵپەی بەرخۆری" دەست پێ دەکات. لێرەدا جۆرێک لە پەتای بەرخۆریی بێچاودێری، بەرخۆریی بێقەیدوشەرت و بێسنوور دروستدەبێت کە بەشی هەرەزۆری کۆمەڵگا بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات. ئەمەش زۆر جار دوای تێپەڕین بە قۆناغێکی درێژی ژیانێکی پڕ نەبوونی و تەقەشوفدا دروست دەبێت. تێرکردنی ئارەزووەکان لە ڕێگای بەرخۆرییەوە دروشمی ئەم جۆرە قۆناغەیە، وەک ئەوەی ئەمڕۆ لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەئارادایە. ئەگەر بکرێت دەستەواژەیەک لە ئەفلاتونەوە قەرز بکەین، دەکرێت بڵێین ئەمە قۆناغی باڵادەستیی ئەو بەشەی کەسایەتیی ئینسانە کە بە سەرقاڵبوون بە تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانییەوە پەیوەستە. ئەفلاتوون پێی وایە ڕۆحی ئینسان لە سێ بەش پێک هاتوە، بەشی سەرەوەی ڕۆح، کە بەشە عەقڵانییەکەی ڕۆحە، بەدوای بەدیهێنانی مەسەلە گەورە و مەزنەکانی ژیاندا وێڵە، بەشی هەرەخوارەوەی ڕۆحیش، بەشە کەمنرخ

و نەوسنەکەی ڕۆحە، کە خۆی بە تێرکردنی ئارەزووە ئێستاییەکانی ئینسانەوە سەرقاڵ دەکات، بەشی سێهەمی ڕۆحیش لەنێوان ئەو دووبەشەی تردایە و بەهاکانی شەرەف و ئازایەتی و مەردایەتی ئەیبات بە ڕێوە. لەم دیدە ئەفلاتونییەوە دەکرێت بڵێین قۆناغی هەڵپەی بەرخۆری قۆناغی باڵادەستیی بەشە نەوسنەکەی ڕۆحە بەسەر بەشەکانی تری ڕۆحدا.

بەڵام دەشێت ئەم قۆناغی هەڵپەی بەرخۆرییە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا جێگەی خۆی بدات بە "بەرخۆرییەکی مەرجدار،" بەرخۆرییەک بە ئامادەگیی لانی هەرەکەمی وشیاری بە کردەی بەرخۆریی خۆیەوە، وشیارییەک تییادا برێکی بەرچاوی دەرەنجامە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ژینگەییە نێگەتیڤەکانی بەرخۆری دەبینرێن و بیر لە چارەسەرکردنی ڕەهەندە خراپەکانیان دەکرێتەوە. ئەگەر لە قۆناغی یەکەمدا کڕین و سەرفکردن و بەکارهێنان بێ بیرکردنەوەی زۆر و بێ هەڵسەنگاندن و ڕەخنەکردن دروست ببێت، ئەوا لە قۆناغی دووهەمدا چەندان مەرج بۆ بەرخۆری دروست دەبێت. وردتر و ڕەخنەگرانەتر بیر لەوە دەکرێتەوە کام شتومەک بکڕدرێت، بە چ ئاکار و نەوعیەتێکەوە، دەرەنجامەکانی ئەو کڕینە چییە و هتد... بەڵام تەنانەت لەم قۆناغەی دواتریشدا بەرخۆریی جەماوەریی بەرفراوان، واتە بوونی بەرخۆری بە کولتووری باڵادەست و بە ئایدۆلۆژیایەکی جەماوەری، هێما بۆ کۆمەڵێک قەیرانی گەورە گەورە دەکات، کە دونیای ئەمڕۆی تێ کەوتووە، کۆمەڵێک قەیران کە کێشەی گەورە و قووڵ و فرەلایەنی بۆ زەمین وەک ئەستێرەیەکی تایبەت و بۆ ئینسان و کۆمەڵگاکان بەگشتی دروست کردوە، بە ڕادەیەک بەرخۆریی ئەمڕۆ لە ئاستی دونیادا

بووە بە هەڕەشەیەکی مەترسیدار لەسەر سەلامەتیی زەوی و لەسەر تواناکانی بەردەوامبوونی ژیان بە مانا هەرە گشتی و سادەکەی.

ئەوەی من لەم نووسینەدا دەمەوێت قسەی لەسەر بکەم ڕەهەندە نێگەتیڤەکانی دیاردەی بەرخۆری لە ئاستە جیهانییەکەیدا نییە، هەرکەسێک بیەوێت لەم ڕووەوە شارەزا بێت، دەتوانێت هەزاران کتێب لەم بوارەدا بدۆزێتەوە، ئەوەی من دەمەوێت قسەی لەسەر بکەم دیاردەیەکی کۆنکرێتتر و سنووردارترە، دیاردەی بەرخۆرییە لە کوردستاندا و لێکۆڵینەوەی ئەو ئەگەر و کێشە و تەحەدایانەیە کە ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگای ئێمەی ئەم دەیەی دواییدا هەڵگریان بووە و تا ماوەیەکی درێژتریش هەڵگریان دەبێت

**بەرخۆری لە کوردستاندا**

ئەوەی ئەمڕۆ ڕاگوزەرانەش بە کوردستاندا تێبپەڕێت، دەزانێت گەورەترین چالاکییەک ئینسانی ئێمە ئەنجامی بدات، چالاکیی بەرخۆرییە، بەرخۆرییەکی گەورە و بەرفراوان و هەمەجۆر، هەم لە شارە گەورەکانی کوردستاندا و هەم لە شارۆچکە و گوندەکانیشدا. لە ڕاستی دوور ناکەومەوە گەر بڵێم کۆمەڵگای ئێمە بووە بە یەکێک لە بەرخۆرترین کۆمەڵگاکانی ناوچەکە، کۆمەڵگایەک ئەوەی دەیخوات خۆی بەرهەمهی ناهێنێت و ئەوەشی بەکاری دەهێنێت لە شوێنی ترەوە دەیهێنێت. بە هەموو مانایەکیش ئەم دۆخە دۆخێکی تازەیە، کۆمەڵگای ئێمە بە درێژاییی مێژووی خۆی لەم

دۆخی بەرخۆرییەی ئەمڕۆدا نەژیاوە، بەرخۆری هەرگیز چالاکیی سەرەکیی ئینسان و کۆمەڵگای ئێمە نەبووە، بەشێکی بەرچاوی ئەوەشی ئەم کۆمەڵگایە بەکاری هێناوە خۆی بەرهەمهێنەری بووە. مۆدێلی بەرخۆریی ئەمڕۆکە مۆدێلی بەرخۆرییەکی نوێیە، جۆرێکی تازەی چالاکی و سەرقاڵییە کە پێشتر لە کۆمەڵگای ئێمەدا بوونیان نەبووە. بە بۆچوونی من سێ هۆکاری سەرەکی لە پشتی ئەم "بەهاری بەرخۆری"یە و لە پشتی ئەو ڕاستییەوەیە کە بەرخۆریی لە دونیای ئێمەدا بووە بە ئایۆلۆژیا، واتە لە بەرخۆرییەکی سادەوە گۆڕاوە بۆ بەرخۆریزم. یەکەمیان پەرەسەندنی ئابووریی نەوتە لە کوردستاندا تا ئەو شوێنەی دەرهێنان و فرۆشتنی نەوت بووە بە یەکێک لە چالاکییە ئابوورییە دەگمەنەکانی دونیای ئێمە. دووهەمیان دروستبوونی کۆمەڵێک گۆڕانکاریی دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی گەورەیە کە لە کوردستانی دوای ڕاپەڕیندا هاتوونەتەوە کایەوە و ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتیی گەورەی بۆ ویست و حەز و توانای بەرخۆری دروست کردوە. واتە بەرخۆری لە کوردستاندا بنکەیەکی مادیی کۆمەڵایەتیی تایبەتی لەپشتە، کە وای کردەوە دیاردەی بەرخۆری گەشە بکات و ببێت بە بەرخۆریزم، ئەم خاڵە دواتر دێمەوە سەری و بەدرێژی باسی دەکەم. سێهەمیش دروستبوونی مۆدێلێکە لە دەسەڵات و حوکمڕانی کە دەیەوێت لە ڕێگای بەرخۆرییەوە ڕەوایەتی بە بوونی ئەو شێوازە لە دەسەڵاتداریێتی بدات کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست بووە. ئەم گۆڕانانە بەسەریەکەوە وایان

کـردوە نەکرێـت بەرخـۆری تەنهـا بـۆ چالاکییەکـی ئابـووری، یـان تەنهـا بۆ ڕەهەنـدە سیاسـییەکانی کـورت بکرێتـەوە، بەڵکو بـووە بـە سـتراتیژێکی تایبەتـی دروسـتکردنی جۆرێکـی نـوێ لـە کەسـایەتی، جۆرێکـی نـوێ لـە ئینسـان و کۆمەڵگا کـە تیـادا ئابـووری و گەشـە و گۆڕانـی دیمۆگرافـی و خواسـتەکانی مۆدێلێکی تایبەتیی دەسـەڵات بـە شـێوەیەکی ئاڵۆز و فرەلایـەن بەناویەکـدا چـوون و بەیەکـدی تێکـەڵ بـوون. هەمـوو ئەمانـە بەسـەریەکەوە وایـان کـردوە بەرخـۆری ببێـت بـە سیاسـەتێکی تایبەتـی "خودسـازی،" کـە بـە پلـەی یەکـەم خودێکی بەرخـۆر بە مانـا ئەفلاتونییەکـەی بەرهـەم دەهێنێـت، بـەڵام هـاوکات لـەوەش بـەدەر نییـە کـە لـە ژینگـە کۆمەڵایەتییـە تایبەتەکـەی کۆمەڵگای ئێمەدا ئەگەری دروسـتبوونی تاکەکەس بەگشـتی و تاکەکەسـێکی بەرپرسـیاریش بەتایبەتـی مەیسـەر بـکات. ئـەم خاڵـەش دواتـر دێمـەوە سـەری و بەدرێژی باسـی دەکـەم. بەکورتـی ئەگەرچـی بەرخـۆری لـە کوردسـتاندا دیاردەیەکـە چەندەهـا ڕەهەنـدی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگیی نێگەتیڤی هەیـە و جۆرێـک لـە خودسـازی مەیسـەر دەکات، کـە دەشـێت لـە ئاسـتە نزمەکـەی دابەشـکردنە ئەفلاتوونییەکـەی ڕۆحـدا نیشـتەجێی بکەیـن، هـاوکات هەڵگری ئەگەرێکی پۆزەتیڤیشـە، ئەگـەری ڕەخسـاندنی ژینگەیەکـی لەبـار و مەیسـەرکردنی ئامـرازە سـەرەکییەکانی دروسـتبوونی تاکەکەس و دەرچوون لەژێر فشـار و ئەخلاقیاتی گـروپ و یەکـە کۆمەڵایەتییـە دەسـتەجەمعییەکان، لەوانـەش خێزان و حیزب و خێڵ و هتد... لـە لاپەڕەکانی داهاتـووی ئـەم نووسـینەدا ئەم تێزە بەوردی شـی دەکرێتەوە و نیشـان ئەدرێت.

**جۆرەکانی بەرخۆری لە کوردستاندا**

بەرخۆریی لە کوردستاندا دۆخێکی فرەجۆر و فرەڕەنگە، ئەمەش گرێدراوی شوێن و جێی کۆمەڵایەتی و توانای ئابووری و هێزی ئەو گروپە کۆمەڵایەتیانەن کە لە وڵاتەکەدا ئامادەن. دەکرێت سێ ئاستی جیاوازی بەرخۆری لە کوردستاندا لەیەکتری جیا بکەینەوە. یەکەمیان ئاستێکە لە بەرخۆری کە بێ دوودڵی دەکرێت بە ئاستی بەرخۆریی چینە بۆرژوازییە هەرە دەوڵەمەندەکانی خۆرئاوا و شێخەکانی خەلیج و مافیا دەوڵەمەندەکانی ڕوسیا و ئیتالیا بەراورد بکرێت. ئەمانە هەم لەناو کوردستاندا و هەم لە دەرەوەی کوردستاندا و ئەو جۆرە لە کردەی بەرخۆری پیادە دەکەن، کە شوێن و جێی ئەوان لە ڕیزی هەرەسەرەوەی هەرەمی کۆمەڵایەتیدا نماییش دەکات. بەرخۆریی ئەمانە تەعبیرێکی ڕاستەوخۆیە لە بڕ و ڕادەی دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزیی ئەوان. بەشێکی زۆری ئەم توێژە کۆمەڵایەتییە، دەسەڵاتدارانی وڵات و ئەندامانی ئەو بازنە بچووکانەن کە نزیکییان لە دەسەڵاتدارانەوە کردوونی بە مەڵتی ملیۆنێرە تازەکانی دونیای دوای ڕاپەڕین. ئەمانە کاڵا ئەورووپییە گرانبەهاکان بەرخۆر دەکەن، خانووبەرەی زەبەلاح و سەیرانگەی گەورە دروست دەکەن و سەفەری گران بۆ دەرەوەی کوردستان ئەنجام ئەدەن. ئەمانە ئەو ئوتومبێلانە بەکار دەهێنن کە کارخانە گرانەکانی دونیا دروستیان دەکەن و باکیشیان بەوە نییە لەم پێناوەدا پارەیەکی ئەفسانەیی سەرف بکەن. ئەمانە هەم خۆیان و هەم خێزان و کچ و کوڕ و دۆستەکانیان بۆ

ئەنجامدانی عەمەلیاتی جوانکردنی لووت و دەموچاو و لابردنی چرچیی سەر ڕوخسار دەچنە شارە گەورەکانی ئەوروپا و تورکیا و لە گرانترین نەخۆشخانەکانی دونیادا ئەو جۆرە عەمەلیاتانە ئەنجام ئەدەن. هەندێک کەسایەتیی دیاریکراوی ئەم گروپە تا ئەو شوێنە ڕۆیشتوون فڕۆکەی تایبەتیان بۆ هاتوچۆی خۆیان کڕیوە و منداڵ و دۆستەکانیان بۆ گرانترین زانکۆکانی دونیا بۆ خوێندن ناردوە. لەناو کوردستانیشدا منداڵانی ئەم خێزانانە لە قوتابخانە تایبەتەکاندا دەخوێنن و شێوەژیانێک دەژین کە دوورە لە شێوەژیانی زۆربەی هەرەزۆری منداڵانی کوردستانەوە.

ئاستی دووهەمی بەرخۆری لە کوردستاندا ئاستی بەرخۆریی ئەو هێزەیە کە لەدوای ئەم توێژە بچووکە دەسەڵاتدارەی وڵاتەوە دێت. لەدوای ئەو بازنە بچووکەی مەڵتی ملیۆنێری تازەوە کە باسم کرد، چینێکی ناوەند هەیە کە بەرخۆرییەکەی ڕووی لە کاڵا نە هەرزان و نە گرانەکانی هاوردەی وڵاتانی دراوسێیە، بەتایبەتی ئەوەی لە بازاڕەکانی تورکیاوە دێتە کوردستان. ئاستی بەرخۆریی ئەمانە چەندان پلە نزمترە لە ئاستی بەرخۆریی گروپی یەکەم. بڕێکی زۆری ئەم چینی ناوەندە هەمان خەونی بەرخۆریی بازنە باڵادەستەکەیان هەیە، بەڵام توانا و ئامرازی پیادەکردنی ئەو خەونەیان نییە. هاوکات ژمارەیەکی گەورەی ئەم چینە سڵ لەوە ناکەنەوە هەموو ڕێگایەک بگرنە بەر بۆ گەیشتن بەو ئاستی بەرخۆرییەی گروپی یەکەم. ئەگەرچی ژمارە و زانیاریی ورد دەربارەی ئەم گروپە لە کوردستاندا لەبەردەستدا نییە، بەڵام بەپێی ئامارە ڕەسمییەکان ڕێژەی ئەو

خێزانانەی کە مانگانە توانای خەرجکردنی دوو ملیۆن دینار و بۆ سەرەوەیان هەیە، ٢٧ لە سەدی خێزانەکانی هەرێمی کوردستان تێناپەڕێت. ئەمەش مانای ئەوەی ئەم هێزە لە باشترین دۆخدا لە چوار-یەکی دانیشتووانی کوردستان تێپەڕ ناکات. ئەگەر ڕێژەکە زۆر لەوە کەمتریش نەبێت، چونکە ئەو خێزانانەی دەتوانن ماناگانە لە ٢ ملیۆن دینار زیاتر خەرج بکەن، مەرج نییە هەموویان هەمان ئاستی بەرخۆرییان هەبێت، چونکە دەشێت خێزانێک لە دوو کەس پێک هاتبێت، بەڵام خێزانێکی تر لە هەشت کەس پێک هاتبێت، ئەمەش مانای ئەوەی توانای بەرخۆریی خێزانی یەکەمیان زۆر زیاتر دەبێت لە توانای خێزانی دووهەم.(١)

ئاستی سێهەمی بەرخۆری ئاستەکانی خوارەوەی بەرخۆرییە، ئەم ئاسەتەش ئاستی زۆرینەی کۆمەڵگای ئێمەیە، بەرخۆری لێرەدا لە نزمترین ئاستیدایە بە بەراورد بە بەرخۆریی دوو گروپەکەی تر. ئەم ژمارانە وێنەی ئەم ئاستە تایبەتەی بەرخۆریمان باشتر بۆ ڕوون دەکەنەوە: حەوت لە سەدی خێزانەکانی کوردستان خەرجیی مانگانەیان ناتوانێت ٥٠٠ هەزار دینار تێپەڕ بکات، ٢٥ لە سەدی خێزانەکانی تر خەرجیی مانگانەیان لەنێوان زیاد لە نیو میلۆن و کەمتر لە ملیۆنێکە. لەدوای ئەمانیشەوە ٤١ لە سەدی خێزانەکانی هەرێم دێت کە خەرجیی مانگانەیان لە ملیۆنێک دینار زیاترە، بەڵام ناگاتە دوو ملیۆن. بە واتەیەکی تر ڕێژەی ٧٣ لە سەدی خێزانەکانی کوردستان ئاستی بەرخۆرییان نزمە و ئەمەش زۆرینەی کۆمەڵگای ئێمە دەستنیشان ئەکات. خۆ گەر لە بواری توانای تاکەکەسیدا بۆ بەرخۆری تەماشای ژمارەکان

بکەین، ئەوکات وێنەکە ڕوونتر دەبینین. بەپێی ئامارەکان لە سەدا ٧ تاکەکانی هەرێم توانای خەرجییان لە مانگێکدا لە ١٠٠ هەزار دینار کەمترە، لەمانە ٦٦ هەزار کەسیان لەژێر هێڵی هەژاریدا دەژین. ئەوانەی دەتوانن لەنێوان ١٠٠ تا ٢٠٠ هەزار دینار لە مانگێکدا خەرج بکەن ڕێژەیان ٣٧ لە سەدی دانیشتووانی هەرێمە. ئەوانەی ئەتوانن لەنێوان ٢٠٠ تا ٤٠٠ هەزار دینار لە مانگێکدا خەرج بکەن ڕێژەکەیان ٣٨ لە سەدی تاکەکانی هەرێمە. ئەوانەشی کە دەتوانن لە ٤٠٠ هەزار دینار بۆ سەرەوە خەرج بکەن ڕێژەیان ١٧ لە سەدی دانیشتووانەکەیە.

وەک دەبینین توانای خەرجیی ئەم زۆرینەیە لە خێزان و تاکەکەس لە کوردستاندا دیاریکراوە و لەناو ئەو هەڵئاوسان و بەرزبوونەوە بەردەوامەی نرخی شتومەک و گرانییەدا کە لە کوردستاندا هەیە، ئەم خێزان و تاکەکەسانە ناتوانن خەرجی و مەسرەفی زۆریان هەبێت. بەڵام هاوکات ئەم زۆرینە کەمدەرامەتە زۆرینەیەکی نابەرخۆر نییە، ئەمانە شێوازێکی تایبەتی بەرخۆرییان هەیە و برێکی گەورەی ئەو بازاڕە هەرزانەی لە وڵاتەکەدا دروست بووە ڕووی لە بەرخۆریی ئەم زۆرینە سۆسیۆلۆژییەیە. ناوەندی سەرەکی لەم بەرخۆرییە تایبەتەشدا بریتییە لەو برە زۆرە لە کاڵا هەرزانەکانی وڵاتی چین کە لە ڕێگای بازرگانییەوە هێنراونەتە کوردستانەوە. کاڵایەک کە نە مەرجەکانی تەندروستی و نە مەرجەکانی مانەوە و نە هیچ مەرجێکی پۆزەتیڤی تریان تێدا نییە، ئەوەی هەیانە تەنها هەرزانییە و بەس. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە کاڵا هەرزانە چینییانە سەرچاوەی چەندان بیماری و

نەخۆشیی ترسناکن و سەرچاوەیەکی سەرەکیی پیسبوونی بەرفراوانی ژینگەشن. لە ئێستادا جگە لە نەبوونی توانای ئابووری بۆ گواستنەوەی شێوازی بەرخۆریی ئەم زۆرینەیە بۆ ئاستی یەکەم و دووهەمی بەرخۆری، هاوکات لانی کەمی وشیارییش بە مەترسییەکانی بەرخۆریی خراپ و بەکارهێنانی ئەو کاڵا بێمەرجانە لەئارادا نییە، کە بازرگانییەکی نابەرپرسیار دەیهێنێتە کوردستانەوە.

خاڵێک کە گرنگە لێرەدا جارێکی تر جەغتی لێ بکەین ئەوەیە، ئەم بەرخۆرییە لە دونیای ئێمەدا نە دەرەنجامی کارکردن و توانای بەرهەمهێنانی کۆمەڵگا و تاکەکەسەکان خۆیانە، نە هاوشانە بە بوونی هیچ پلان و دەزگا و میکانیزمێکیش بتوانێت خەڵکی سادە لە تەماح و ئاکاری دروستکەرانی ئەم بەرخۆرییە بپارێزێت، مەبەستم ئەو توێژەیە لە بازرگانی نابەرپرسیار کە زۆربەی کات بەشێکن لە توێژە دەسەڵاتدارەکەی وڵات. واتە کۆمەڵگا بپارێزێت لە تەماحی ئەوانەی بەدوای قازانجی خێرادا دەگەڕێن و بەبێ گوێدانە جۆر و نەوعیەتی ئەو شتانەی دەیخەنە بازاڕەکانەوە، کوردستان پڕ دەکەن لە کاڵای خراپ، بەڵام هەرزان. لەم ئاستەدا یەکێک لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی بەرخۆری لە کوردستاندا، بریتییە لە نەبوونی ئۆرگانێک کە نەهێڵێت، بۆ نموونە، شتومەکی خراپ و زیانمەند بفرۆشرێت و لە بازاڕەکاندا ساغ بکرێتەوە، ئەمە جگە لە نەبوونی وشیارییەکی جەماوەری بەرامبەر بە مەترسییەکانی ئەو جۆرە لە بەرخۆریی خراپ. بە مانایەکی دیکە ئەو شێوازەی بەرخۆریزم کە لەم ساتەدا لە کوردستاندا ئامادەیە، شێوازێکە بێ لێپرینسەوە و بێ هیچ

تونایەکە بۆ بەبەرپرسیارکردنی ئەوانەی کاڵا خراپەکان لە بازارەکانی کوردستاندا بڵاو دەکەنەوە. واتە بەرخۆریزم لە ئێستای کۆمەڵگای ئێمەدا هێزێکی ڕووتە و نە وشیارییەکی ڕەخنەی و نە هیچ بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیی لەپشتەوە نییە بتوانێت کۆمەڵگا لە بازرگانەکانی ئەم بەرخۆرییە بێلێپرسینەوەیە بپارێزێت.

بەکورتی ئەو دیمەنی بەرخۆرییەی کە لە سەیرکردنێکی وردی کۆمەڵگای ئێمەوە دەستمان دەکەوێت ئەو سێ وێنەیەی سەرەوەیە، هەرسێکیشیان هێما بۆ دروستبوونی کۆمەڵگا و ئینسانێکی بەرخۆر دەکەن کە تیایاندا بەرخۆری بووە بە بەشێکی هێجگار گرنگی شووناسی سەرەکییان. بوونی بەرخۆرییش بە شووناس هەندێک دەرەنجامی گرنگ و گەورەی لێ دەکەوێتەوە، باسکردنیان هەڵدەگرین بۆ لاپەڕەکانی تر، ئەوەی لێرەدا دەمەوێت بە خوێنەری بڵێم ئەم گریمانەیە: چیدی ئایدیۆلۆژیای باڵادەست لە کۆمەڵگای ئێمەدا ناسیۆنالیزم نییە، بەڵکو ئایدیۆلۆژیای بەرخۆرییە، واتە بەرخۆریزمە، گواستنەوەی بەرخۆرییە لە کردەیەکی سادەوە بۆ بەرخۆریزم. ئەم گۆڕانەش گۆڕانێکی گەورە و فرەدەرەنجامە. بەڵام بەر لەوەی بێمە سەر باسکردنی ئەم گۆڕانکارییە و دەرەنجامەکانی با سەرنجێکی وردتر لە ماناکانی گۆڕانی بەرخۆری لە کردەیەکی ڕۆژانەی سادەوە بۆ ئایدۆلۆژیا بدەین. ئەو پرسیارەی پێویستە لێرەدا بیکەین ئەمەیە: بە چ مانایەک بەرخۆریی ئەمرۆ لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئایدیۆلۆژیای باڵادەستە؟

## کۆمەڵگا وەک بازاڕ

دیمەنەکانی بەرخۆری لە کوردستاندا هەمەجۆر و بەرفراوانن، لە شارەکانی کوردستاندا بۆ هەر شوێنێک دەڕۆیت ڕووت بە چەندان دیمەنی جیاوازی بەرخۆریدا دەتەقێتەوە، پەنای شەقامە گشتییەکان و ناوەڕاستی شارەکان و قەراخ و بازنە دوورەکانی شاریش پڕ بوون لە بازاڕ و چێشتخانە و ئوتێل و مۆڵ و مۆتێل و شوێنی پشوودان و حەوانەوەی جۆراوجۆر. ئەم دیاردەیە بە ڕادەیەکە دەکرێت باس لە پرۆسەی"بەبازاڕبوونی کۆمەڵگا" بکەین، پرۆسەیەک لە زۆر ئاستدا کۆمەڵگای ئێمەی گۆڕیوە بە بازاڕێکی گەورە، بە شوێنی کڕین و فرۆشتنی شتومەک، بە جێگەیەک چالاکیی سەرەکی تیایدا خەرجکردنی پارەیە. لە ناوەندی ئەم بازەڕەشدا تاکەکەسێک ئامادەیە کە خەریکی شتکڕین و پارەخەرجکردنە، خەریکی دابنیکردنی ئەو ئارەزووانەیە کە هەم خۆی وەک تاکەکەس هەیەتی و هەم بەرخۆری لەناویدا دروستی دەکات، بێگومان وەک پێشتر باسمان کرد هەر کەسە و بە ئاست و توانایەکی تایبەت و دیاریکراوی بەرخۆرییەوە.

بێگومان بەشێکی بەرچاوی ئەم پەتای بەرخۆرییە پەیوەندیی بە بەرزبوونەوەی توانا و ئاستی کڕینی شتومەک و خەرجکردنی پارەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەیە، ئەم کۆمەڵگایە ئەمڕۆکە دەوڵەمەندترە لەو کۆمەڵگایەی لە ساڵانی هەفتا و هەشتا و نەوەددا لەئارادا بوو، بڕی ئەو پارە و سەرمایەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا هەیە و دەجووڵێت بەراورد ناکرێت بەوەی لە قۆناغەکانی پێشتردا لە کوردستاندا ئامادە بووە. بەکورتی لەپشتی بەرخۆریی ئەمڕۆوە هۆکارێکی ئابووری

هەیـە، کـە پەیوەندیـی بـە ئابووریـی نـەوت و پـارەی هاتـووی نەوتـەوە هەیـە بـۆ نـاو کوردسـتان. بـەڵام بەشـەکەی تـری ئـەم پەتایـە، کـە بـە بۆچوونـی مـن بەشـی شـێری پەتاکەیـە، پەیوەندیی بـە سـتراتیژیەتی کارکردنـی دەسـەڵاتەوە هەیـە. واتـە پەیوەسـتە بـە سیاسـەتێکی بیرلێکـراوە و ئاراسـتەکراوی تایبەتـەوە، کـە تیایـدا دەسـەڵات هەوڵێکـی گـەورە ئـەدات ئینسـانی ئێمـە بگۆڕێـت بـۆ بوونەوەرێکـی بەرخـۆر، ئـەو ڕەهەنـدە سیاسـی و کۆمەڵایەتی و کولتوورییە ڕەخنەییەی تێدا بکوژێت کە دەشـێت سـەرچاوەی مەترسـی بێـت بـۆ ئـەو مۆدێلـە لـە دەسـەڵات کـە لـە کوردسـتاندا بەرقـەرار کـراوە. لەپـاڵ ئەمـەدا بەرخـۆری ڕۆڵـی ئامرازێـک دەبینێـت بـۆ شـاردنەوە و لێڵکردنـی سـەرچاوەکانی ئـەو جێگۆڕکـێ کۆمەڵایەتـی و چینایەتییـەی کـە لـەم دوو دەیـەی دواییـدا لـە کوردسـتاندا دروسـت بـووە. جێگۆڕکێیـەک تیایـدا کۆمەڵێـک سیاسـی و بنەماڵـە و خێـزان و کەسـایەتیی سیاسـی و سـەربازیی تایبـەت بـوون بـە سـەرمایەدارە گـەورە و میلۆنێـرە دیارەکانـی دونیـای دوای ڕاپەڕیـن. وەک وتـم یەکێـک لـە ئەرکەکانـی بەرخـۆری، بریتییـە لـە شـاردنەوەی شـێوازی چۆنیەتیی دروستبوون و پیادەبوونـی ئـەم جێگۆڕکێیە، کە بەناو دونیایـەک گەندەڵـی و تاوانـدا تێپەڕیـوە. بـۆ هەمـووان ئاشـکرایە دروسـتبوونی ئـەم پەتـای برخۆرییـە هاوشـانە بـە لەدایکبـوون و دروسـتبوونی شـێوازێکی نوێـی پێشـکەوتنی کۆمەڵایەتـی و دەوڵەمەندبـوون، شـێوازێک لـە هەڵپـەی دەوڵەمەندبوونـی خێـرا کـە سـەرچاوەکانی تاریـک و ناڕوونـە و زۆر جاریـش لەسـەر دونیایـەک لـە دزی و جەردەییـی ئابـووری و کۆمەڵایەتیـی دەرەوەی هـەر پرۆسـەیەکی چاودێریکردنـی یاسـای و

ئەخلاقی، بەندە. دروستبوونی ژمارەیەک لە ملیۆنێری گەنج لە ماوەیەکی هێجگار کورتدا، هێمایەکی بەرچاوە بۆ ئەم مۆدێلە لە دەوڵەمەندبوون، کە دەستی لەناو دەستی ئەو پەتای بەرخۆرییەدایە کە هەیە. لەم ئاستەدا بەرخۆری دێت نەک تەنها بۆ بە ناسیاسیکردنی ئینسان و کۆمەڵگای ئێمە، بەڵکو بۆ شاردنەوەی ڕەگوڕیشە نایاسایی و مافیایی و سیاسییەکانی ئەم دەوڵەمەندبوونە خێرایە و بۆ لێڵکردنی سەرچاوەکانی ئەو جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییە گەورەیەی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست بووە. دەکرێت لێرەدا هێما بۆ هەندێک لە دیمەنە گەورەکانی بەرخۆری لەمڕۆکەی کۆمەڵگای ئێمەدا بکەین کە وایان کردوە کۆمەڵگای ئێمە لە وێنەی بازاڕ یان مۆڵێکی گەورەدا دەر بکەوێت.

## ١

## پیشەسازیی خواردن و پشوودان و حەوانەوە

زێدەڕۆیی نییە گەر بڵێین بەشێکی گەورەی شارەکانی کوردستان گۆڕاون بۆ چێشتخانە و قاوەخانە و مەیخانە و شوێنی ئیسراحەت و پشوودان و مزگەوت و شوێنی دینی. دیمەنەکە بە شێوەیەکە دەکرێت قسە لە گواستنەوە لە "قۆناغی حانوت"ەوە بۆ قۆناغی "مۆڵ" و "ئیسراحەتخانە"ی مۆدێرن بکەین. بەشێکی بەرچاوی ئەو شوێنانەی کە دروست بوون تەنها شوێنی نانخواردن نین، بەڵکو شوێنی کۆبوونەوە و یەکدیبینن و قسەکردن و پشوودانیشن، شوێنی خۆنمایشکردن و شوێنی کاتبەسەربردن و دانیشتنن، هەندێکیان شوێنی گوێگرتنن لە مۆسیقا و گوێگرتنن لە

یەکتری. هاوکات هەندێک لەو شوێنانە مانای کۆمەڵایەتیی تایبەتیان وەر گرتوە، هەندێکیان، بۆ نموونە، بوونەتە شوێنی کۆبوونەوەی گەنجان، هەندێکیان شوێنی کۆبوونەوەی خوێندەواران و هونەرمەندان، هەندێکی تریشیان شوێنی کۆبوونەوەی ئافرەتان و خێزان. ئەمە جگە لە دروستبوونی چەندان "شوێنی تایبەت" کە ڕاستەوخۆ پابەستن بە توانای مادی و پێگە و شوێنی کۆمەڵایەتی و چینایەتیی ئەوانەوە کە سەردانیان دەکەن. کردنەوەی ژمارەیەکی زۆری مزگەوت و سەردانی ئەو مزگەوتانە لەلایەن ژمارەیەکی بەرچاوی ئینسانی کۆمەڵگای ئێمەوە، سەر بە هەمان میکانیزمی بەرخۆرییە، بەڵام لێرەدا لەباتی ئەوەی "شتومەکی مادیی" بەرخۆر بکرێت، دین وەک "شتومەکێکی ڕەمزی" و وەک "ئامازێکی مەعنەوی" بەرخۆر دەکرێت. بەکورتی ئەم فەزا تازەیەی بەرخۆری لە کوردستاندا لەگەڵ خۆیدا سیستمێکی ڕەمزیی تازەی هێناوە، کە تیایدا هێماکردن بۆ شوێن و جێی کۆمەڵایەتی و زەوق و پیشە و حەز و خواست و "ئوسلوبی ژیان"ی ئەوانەی سەردانیان دەکەن، مەسەلەیەکی سەرەکییە. واتە ئەم شوێنانە هێما بۆ دروستبوونی شووناسی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی تازەی ئەو کەسانە و هەندێک جار شووناسی سیاسیی تایبەتیش دەکەن. هەموو ئەم گۆڕانکارییانە، بە کردەی سەردان و نانخواردن و دانیشتن لەو شوێنانەدا، کۆمەڵێک مانای کۆمەڵایەتیی نوێی بەخشیوە، کە لە فەزای "حانوتئاسا"ی بەرخۆریی ساڵانی هەفتا و هەشتا و نەوەدا بوونی نەبووە. بوون بە بەشێک لەم فەزا نوێیەی بەرخۆری و بەشداریکردن تیایدا، یەکێکە لە چالاکی و

هەوڵدانە سەرەکییەکانی زیاد لە هێز و گروپ و تاکەکەسێکی ئەو کۆمەڵگایە. ئاشکرایە ئەوەی لۆژیکی ئەو شوێنە تازانە ئاراستە دەکات لۆژیکێکی بازرگانییە و لەسەر بەدەستهێنانی قازانج، زۆر جاریش قازانجی گەورە و خێرا، کار دەکات، بەڵام هاوکات لەو شوێنانەدا فەزایەک دروست بووە تیایدا ئینسان دەتوانێت تا سنوورێکی دیاریکراودا تاکبوونی خۆی بژی، لەناو حەز و ئارەزووەکانیدا نیشتەجێ بێت، مانایەکی تایبەت بە تاکەکەسبوونی خۆی بدات. بەکورتی سەردانی ئەم جۆرە شوێنانە و چوونەژوورەوە بۆ ناو فەزا تایبەتەکەیان زۆر جار تەنها لەبەر خودی خواردن و خواردنەوەکەوە نین، واتە لە مەسەلەی سەردانەکادا خودی خواردن و خواردنەوەکە خۆیان ئەو گرنگییەیان نییە، یان گرنگییەکی پلەدوویان هەیە، ئەوەی گرنگە ئەزموون و خیبرەی لەوێبوونەکەیە، ئەزموونی بوون بە بەشێکە لەو فەزا تازەیەی دروست بووە، بەشدرابوونە لەو فەزایەدا کە پێشتر نەبووە، فەزایەک گەرچی لۆژیکێکی بازرگانیی بەرتەسک دروست و ئارستەی دەکات، بەڵام هاوکات فەزایەکی ئەلتەرناتیڤ و جیاوازە لە فەزای تەقلیدیی ماڵ و گەڕەک و شەقام و چاخانە و مزگەوت و یانەکانی جاران.

## ٢

## پیشەسازیی دەسکاریکردنی جەستە و ڕوخسار

دیمەنێکی تری زۆر زەقی بەرخۆری لە کوردستاندا، پەیوەندیی بە دەسکاریکردن و گۆڕینی ڕوخساری دەرەکی و چۆنیەتیی داڕشتنی لەشولاری ئینسانەوە هەیە. واتە پەیوەندیی بەوەوە

هەیە ئەو ئینسانانە خولیایەکی بەهێزی ئەوەیان تیادا دروست بووە لە فەزای گشتیی کۆمەڵگادا بەو شێوەیەی ئارەزووی دەکەن، بەو شێوەیە دەر بکەون. دەکرێت لێرەدا هێما بۆ بازاڕی گەورەی کڕین و بەکارهێنانی جلوبەرگی جیاواز بکەین، هێما بۆ دروستبوونی پیشەسازیی گۆڕینی دروستکردنی ڕوخسار و دەسکاریکردنی پارچەکانی لەشی ئینسان بکەین، بۆ نموونە عەمەلیاتکردنی لووت و دەموچاو و لابردنی چرچولۆچیی سەر ڕوخسار، هێما بۆ دروستبوون و کردنەوەی ئەو هەموو سێنتەرە بۆ وەرزش و جووڵەکەردن بکەین، هتد... ئەوەی جێگەی سەرنجڕاکێشانە ئەوەیە ئەم پیشەسازییە نوێیەی دروستکردنی ڕوخسار و جەستەی تایبەت هەردوو ڕەگەزەکە دەگرێتەوە، لەم ئاستەدا کوردستان تەنها بازاڕێکی گەورە نییە بۆ دروستکردن و نمایشکردنی جەستەیەکی تایبەت بۆ ڕەگەزی مێ، بەڵکو بۆ ڕەگەزی نێرینەش. بەشێکی گرنگی پیشەسازیی دەسکاریکردنی ڕوخسار و وەرزش و جووڵە ڕوویان لە پیاوانی وڵاتە، ئیتر لە بۆیاخکردنی قژەوە بیگرە، بۆ دەسکاریکردنی ڕوخسار و پۆشینی جلی تایبەت و بۆ وەرزشکردن و پەروەردەکردنی لەشێکی تایبەت. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باس لە کاریگەریی ئەم دۆخە دەکەم لەسەر ئەگەرەکانی گۆڕانی ماناکانی پیاوەتی لە کوردستاندا. بەکورتی لە هەموو ئەم دۆخانەشدا هەوڵدانێک بەدی دەکرێت بۆ دروستکردنی شووناسێکی تایبەت، شووناسێک، بە هەموو ڕووکەشی و نووقسانییە گەورەکانییەوە، هێشتا بەشێکە لە پرۆسەی دروستبوونی تاکەکەسێکی نوێ لە کوردستاندا.

## ٣

## بەرخۆریی دینی

بەرخۆریی دینی بەشێکە لەو دیمەنی بەرخۆرییەی لە کوردستاندا دروست بووە. واتە بەرخۆری بە هیچ مانایەک تەنها دیاردەیەکی عەلمانی نییە، تەنها ڕووبەری عەلمانیی بەرخۆر لە وڵاتەکەدا دروست نەبووە، بەڵکو ڕووبەری دینی بۆ بەرخۆری و بەرخۆریی دینی خۆشی بەشێکی دانەبڕاوی ئەو فەزا تازەیەی بەرخورین کە لە کوردستاندا دروست بووە. بەرخۆریی دینی لە زیاد لە بوارێکی ژیانی تاکەکسیدا ڕەنگی داوەتەوە، لە کڕین و پۆشینی جلوبەرگی دینییەوە بیگرە، کە خەریکە دەبێتە پیشەسازییەکی نوێ لە کوردستاندا، بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار و کاسێت و فلیم و مۆسیقای دینی هتد... جلوبەرگی دینیی جیاواز کە زۆربەیان هێما بۆ ئینتیمای دینی و جۆری باوەڕ و بڕ و ڕادەی دینداریی کەسەکانیش دەکەن بە شێوازی جیاواز و لە بازاڕی جیاوازدا ئامادەن. ئەمە جگە لە گەشەکردن و فراوانبوونێکی بەرچاوی جیهانگەڕی و توریزمی دینی، واتە سەفەر و سیاحەتی دینی و سەردانی شوێنە دینییە سەرەکییەکانی دونیا. لەوانەش چوون بۆ حەج و چوون بۆ عەمرە و سەردان لە شوێنە دینییەکانی تر، هەم لە کوردستان خۆیدا و هەم لە ناوچەکەدا. ئەمە جگە لە دروستکردنی سەدان مزگەوت و ناوەندی دینیی تایبەت کە بوون بە شوێنی کۆبوونەوەی چەندەها تاکەکەس و گرووپی

دینیی تایبەت بەیەکەوە و تیایاندا کاڵایەکی دینیی مەعنەویی سەرف دەکرێت کە ئەو نوخبە دینییە بەڕێوەی دەبات کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست بووە. هەموو ئەم چالاکییە بەرخۆرییە دینییانە هەستکردنی بەشێک لە کۆمەڵگای ئێمە بە بوونی شووناسێکی دینیی تایبەت تەواو بەهێز کردوە و بە دروستکردنی شووناس خۆشی لای ئەنجامدەرانی ئەم بەرخۆرییە دینییە ڕەهەندێکی دینیی بەهێزی بەخشیوە.

٤

## بەرخۆریی کولتووری

وەک سەرجەمی بوارەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا، بەرخۆری لە ئاستی کولتووریشدا دیاردەیەکی بەرچاو و بەرفراوانە و لە زیاد لە ڕەهەندێکی ژیانی فەرهەنگیی ئێمەدا ئامادەیە. کوردستان، بۆ نموونە، پڕ بووە لە فیلمی کۆپیکراو و داگیراو لە تۆڕە یاساغەکانی ئینتەرنێتەوە، فرۆشتنی ئەم جۆرە فیلمانە بە پارەیەکی کەم و لەسەر سی دی، چالاکییەکی ئابووریی تازەیە کە بەر لە قۆناغی ئینتەرنێت لە کوردستاندا بوونی نەبووە. ئەم فیلمانەش هەمەجۆرەن، لە فیلمە بەناوبانگەکانی هۆلیودەوە بیگرە بۆ فیلمە هیندییەکانی بۆلیود و لەوانیشەوە بۆ فیلمی یابانی و تورکی و عەرەبی و فارسی و هتد... ئەوەی بۆ بواری فیلم ڕاستە، بە هەمان شێوە بۆ بواری مۆسیقاش ڕاستە، مۆسیقای بە یاساغ کۆپیکراو بەشێکی گرنگ و گەورەی بازاڕی مۆسیقایە لە کوردستاندا، مۆسیقای جیاواز و فرەجۆر، لە مۆسیقای میللییەوە بۆ مۆسیقای عەرەبی و

فارسی و خۆرئاوای و لە مۆسیقای ڕاپەوە بۆ مۆسیقای سوفییانە، کە زۆر جار جۆرێک لە ڕۆحانیەتی بەرخۆرانەی ساختەبە مرۆڤەکان دەبەخشێت و وەک ئامرازێک بۆ هەڵاتن لە دونیا و بۆ درێژەدان بەو ژیانە بەرخۆرییەی کە هەیە، پەنای بۆ دەبرێت.

هاوکات داگرتنی کتێب لە ئینتەرنێتەوە و کۆپیکردن و فرۆشتنیان بووە بە بەشێک لە بازاڕی کتێبفرۆشی لە کوردستاندا. بەرخۆریی کتێب و بەکارهێنانی وەک دیکۆرێک بۆ ڕازاندنەوەی فەزای ناوەکیی ماڵەکان شێوازێکی نوێی بەرخۆرییە لە کوردستاندا. لەپاڵ ئەمانەشدا زنجیرەی تەلەفیزۆنیی بیانیی دۆبلاژکراو، ئەفلام کارتۆنی دۆبلاژکراو، فیلمی دۆبلاژکراویش جۆری تری ئەو بەرخۆرییە کولتوورییە نوێیە نیشان ئەدەن کە لە وڵاتەکەدا دروست بووە.

هەر لەم ئاستەدا بوونی وەرزش و وەرزشکردن بە چالاکییەکی نوێ، بەشێکە لەم کولتوورە بەرخۆرییە نوێیە، دروستبوونی گرووپی هاندەرانی یانە گەورەکانی دونیا لە جۆری بەرشلۆنە و ڕیاڵ مەدرید، بوون بە دیاردەی کولتووریی بەرچاو و زۆر جار نمایشکردنی ئەم لایەنگیرییە سنووری هەموو چاوەڕوانییەک تێدەپەڕێنن. کلاسیکۆ ڕووداوێکی گرنگە لە ژیانی بەشێکی کۆمەڵگای ئێمەدا و هەندێک جاریش تا ئەو شوێنە دەڕوات کە شەڕ و ناخۆشیی لێ بکەوێتەوە. فرۆشتنی جلوبەرگی کۆپیکراوی ئەو یانانە و فرۆشتنی وێنەی یاریزانەکانیشیان بازاڕێکی تایبەتی لە شارەکانی کوردستاندا هەیە، ئەم وێنانەش تێکەڵ دەبن بە وێنەی شەهیدەکان و وێنەی ئەکتەرەکانی هۆلیود و

وێنـەی سـەرکردە سیاسـییەکان و وێنـەی پیـاوە دینییـەکان، بەسـەریەکەوە فەزایـەک دروسـت دەکـەن پڕ لـە ڕەمـز و مانـا و هێمـای جیـاواز. لـە هەمـوو ئـەم ئاسـتانەدا بەرخـۆری ئینسـانی ئێمـە بـە دونیایەکـەوە گـرێ ئـەدات، یـان بـە دونیایەکـی ئاشـنا دەکات، یـان دونیایـەک دەخاتـە بەردەسـتی، جیـاواز لـەو دونیـا بچووکـە ناوچەیـی و لۆکاڵییـەی کـە تیایـدا دەژی، هەمـوو ئـەم جـۆرە تازانـەی بەرخـۆریی کولتوورییش وەک بەشـێکی گرنگـی شووناسـی ئـەو تاکەکـەس و گروپانـە ئامـادەن کـە بەکاریـان دەهێنـن. وەک پێشـتریش هێمـام پـێ کـرد بەرخـۆریی کولتـووری تەنهـا بـوارە عەلمانـی و نادینییەکانـی کولتـووری نەگرتۆتـەوە، بەڵکـو بـازاڕی حیجـاب و بـازاڕی شـریت و مۆسـیقا و خوتبـە و کتێـب و فیلمـی دینییـش دەگرێتـەوە و ئەمانیـش بازاڕێکـی چالاکـن و جووڵەیەکـەی گـەورەی کڕیـن و فرۆشـتنیان تێدایـە.

## ٥

## کرێکاری بیانی وەک شێوازێکی نوێی بەرخۆری

یەکێـک لـە دەرکەوتـە تازەکانـی بەرخـۆری لـە کوردسـتاندا، هێنانـی کرێـکاری بیانییـە. گەرچـی تـا ئەمـڕۆ ئـەم ئامادەگییـە باسوخواسـتێکی ڕاسـتەقینە و ئینسـانیی لەسـەر نەکـراوە، بـەڵام ئـەم کرێـکارە بیانییانـە گروپێکـی تـازەی نـاو کۆمەڵگای ئێمـەن و بەیانـی و دووبەیانـی چەنـدان پرسـیاری گـەورە و گرنـگ ڕووبـەڕووی کۆمەڵگای ئێمـە دەکەنـەوە. لـە پرسـیاری مافـە تاکەکسـییەکانی ئـەم گروپانـەوە کـە ماوەیەکـی درێـژ وەک کۆچبـەر لـە وڵاتـی ئێمـەدا دەژیـن و کار دەکـەن، بـۆ مافـە دینـی و کولتـووری و ئەتنییەکانیـان. ئـەوەی لـە پەیوەندیـدا بـەم

نووسینەوە شایانی هێمابۆکردنە ئەوەیە، کە ئامادەگیی ئەم کرێکارانە هەمەلایەنە و زیاد لە بوارێکی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابوورییان گرتۆتەوە، ئەگەرچی بواری سەرەکیی ئامادەبوونیان لە ئێستادا بواری بیناسازی و خزمەتگوزارییە. بەرزبوونەوەی ڕادەی بەرخۆری لە کوردستاندا وای کردوە کۆمەڵگای ئێمە بۆ یەکەم جار بکەوێتە پەیوەندییەکی وا نزیک و ڕاستەوخۆوە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە بیانی لە وڵاتەکەدا. بەرخۆری کە ئەم خەڵکانەی هێناوەتەوە کوردستانەوە، لە مەودای دووردا کۆمەڵگا و ئینسانی ئێمە ناچار دەکات پرسیار دەربارەی ئامادەگیی ئەم "ئەوی ترە" لەو کۆمەڵگایەدا بکات و لەم ڕێگەیەشەوە زیاتر لە هەموو کاتێک پرسیاری شووناس لە خۆشی بکات.

### میدیای کوردی و بەرخۆری

بێگومان ئەو شێوازانەی بەرخۆری کە لە سەرەوە هێمام بۆ کردن هەموو شێوازەکانی بەرخۆری نین لە کوردستاندا، بۆ نموونە بەرخۆریی سێکسی ئەمڕۆ بەشێکی گەورەی بەرخۆرییە لە کوردستاندا، ئەم بەرخۆرییە هەم لە ڕێگای سێکسی کڕدراوەوە ڕوو ئەدات، هەم لە ڕێگای ئەو هەموو پەیوەندییە ژێربەژێر و نهێنییانەی لە وڵاتەکەدا دروست بوون. بەلام لەبەر نەبوونی کات و نەبوونی زانیاریی ورد دەربارەی شێوازەکانی تری بەرخۆری، بۆیە لەم نووسینەدا تەنها هێمامان بۆ ئەو جۆرانەی سەرەوەی بەرخۆری کردوە.

ئەوەی دەمەوێت لێرەدا زۆر بەخێرایی هێمای بۆ

بکەم، ئەو پەیوەندییەیە کە بەرخۆری لەگەڵ میدیادا لە کوردستاندا دروستی کردوە. ئاشکرایە بەشێکی بەرچاوی میدیای کوردی بووە بە میدیایەک بەرخۆری هان ئەدات و بڵاوی دەکاتەوە و ڕیکلامی بۆ دەکات. تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ و گۆڤار و ڕۆژنامە و سایتەکانی سەر ئینتەرنێت پڕ بوون لە ڕیکلامکردن بۆ شتومەکە جیاوازەکان، هاوکات خودی پێشکەشکەرانی بەرنامەکان و دیکۆر و جلوبەرگ و شێوازی قژبڕینی ئەوانەی لە تەلەفیزۆنەکاندا دەر دەکەون بەشێکن لەو ئامرازانەی پیشەسازی کە بەرخۆری بە هۆیانەوە خۆی بەهێز دەکات. ئەگەرچی ڕیکلامکردن لە کوردستاندا لە ئاستە هەرە سەرەتاییەکانی گەشەکردنی خۆیدایە، بەڵام ئەوەی تا ئێستا لە ڕیکلامەکاندا نیشان ئەدرێت وێنەی ئینسان وەک بوونەوەرێکی بەرخۆر بەهێز و بڵاو دەکاتەوە. ڕیکلامەکان دەیانەوێت پێمان بڵێن کە حەزکردن لە بەرخۆری و ویستی هەبوونی شتومەک، حەزێکی غەریزیی ناو هەموو ئینسانێکە، ئەوەشی بازاڕ و کۆمپانیاکان دەیکەن بریتییە لە ڕەخساندنی هەلومەرجی لەبار بۆ تێرکردنی ئەو غەریزانە. بێگومان ئەم دیدە بۆ ئینسان لە زۆر سەرەوە ناڕاستە و لە ئینساندا شتێک نییە ناوی غەریزەی کڕین و فرۆشتن بێت. ویست و حەزی کڕین و فرۆشتنی شتومەک شتگەلێکن لە ئینساندا دروست دەکرێن. ڕۆڵی میدیا لەم دروستکردنەدا ڕۆڵێکی سەرەکییە.

خاڵێکی تر کە شوێنی تێبینیکردنە بەشداریی میدیایە لە بەهێزکردنی حەزی ئینسان لە "لاساییکردنەوە و چاولێکەریی

کۆمەڵایەتی." بەهێزکردن و نمایشکردنی ئەم حەزی لاساییکردنەوەیە وای کردوە بەرخۆری ئاکارێکی شانۆییانە وەر بگرێت، واتە ببێت بە بەرخۆرییەک بۆ بینین و تێبینیکردن و دەرکەوتن و نمایشکردن، ئەنجامدانی هەر یەکێکیش لەم چالاکییانە جارێکی تر حەز و ویستی لاساییکردنەوە بەهێزتر و بەرفراوانتر دەکات. بەکورتی میدیا لە ڕێگای ڕیکلامەوە خەریکە وەک هێزێکی وروژێنەر و سەرنجڕاکێش کار دەکات و وا دەکات ئینسان هەست و ویستێکی بەهێزی بەرخۆریی تیادا دروست ببێت. (Van Koppen 2002: 80). لەم ڕووەوە ڕۆڵی میدیا لە پرۆسەی بە ئایدۆلۆژیابوونی بەرخۆریدا ڕۆڵێکی بەهێز و بەرچاوە.

**بنەما ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی بەرخۆری لە کوردستاندا**

بەرخۆری لە کوردستاندا دیاردەیەکە بنەمایەکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوی هەیە، ئەوەی کە بەشی هەرە گەورەی شارەکانی کوردستان بوون بە بازاڕی گەورە و بچووک، بازاڕی گران و هەرزان، مۆڵی گەورە و سوپەرمارکیتی هەمەجۆر، ئەوەی بەرخۆری لە قۆناغی "هەڵپەی بەرخۆری"دایە و بووە بە چالاکیی سەرەکی و بە ئایدۆلۆژیای باڵادەست لە کۆمەڵگای ئێمەدا، وابەستەی کۆمەڵێک گۆڕانکاریی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییە کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا هاتۆتە کایەوە. با لێرەدا سەرنج لە هەندێک لە سەرەکیترینی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانە بدەین.

## یەکەم
## کورتبوونەوەی ئابووریی کوردستان بۆ ئابووریی نەوت

شادەماری بەرخۆری لە کوردستاندا ئابووریی نەوتە، فرۆشتنی نەوت لە بازاڕەکانی دونیادا و خەرجکردنی پارەکەی لە ڕێگای بەرخۆرییەوە ئەو پاشخانە ئابوورییە سادەیە کە لەپشتی دیاردەی بەرخۆرییەوەیە لە کوردستاندا. ئەمرۆ کۆمەڵگای ئێمە پشتی تەواوەتی بە پارەی نەوت بەستووە و لە دەرەوەی نەوتدا شتێکی ئەوتۆی نییە پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیانی ئەو چەند ملیۆن ئینسانەی لە کوردستاندا دەژین، دابین بکات. ئەو سیستمە سیاسییەش کە لەپاڵ ئابووریی نەوتدا دروست و بالادەست کراوە، سیستمێکی "ڕەیعی"یە، ڕێک لەسەر مۆدێلی دەوڵەتە ڕەیعییەکانی ناوچەکە، بەتایبەتی لەسەر وێنەی دەوڵەتەکانی خەلیج، دامەزراوە. تیورەی دەسەلاتدارێتیی ڕەیعی، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت "rentier state"، تیورییەکی ئاڵۆزە و باس لە سروشتی ئەو دەسەلاتە و ئەو مۆدێلی گەشەکردنە ئەکات لە شوێنێکدا ئابوورییەکەی لەسەر ناردنەدەرەوە و ساغکردنەوەی کەرەستەی خاو، بەتایبەتی نەوت، لە بازاڕەکانی دونیادا کار بکات. خاڵی سەرەکی لێرەدا ئامادەگیی ئابوورییەکە کە بە شێوەیەکی بەردەوام و سیستماتیک پشتی تەواوەتی بە ناردنەدەرەوە و فرۆشتنی کەرەستەیەکی خاو بەستووە لە بازاڕەکانی دونیادا. لەم ئابوورییەدا پارەیەکی زۆر و ئاسان دەچێتە قاسەکانی

دەوڵەتـەوە، بەبێ ئـەوەی بەدەسـتهێنانی ئـەو پارانـە بەرهەمـی کار و بەرهەمهێنانێکـی ناوەکـی بـن. ئەمــەش دەســەڵاتێکی هێجگار گەورە بە دەوڵـەت یان بەوانـەی دەسـەڵاتی سیاسـییان بەدەسـتەوەیە دەدات، چونکـە هـەم پارەی فرۆشـتنی کەرەسـتە خاوەکان دەچێتـە دەسـتی دەوڵـەت و توێژە دەسـەڵاتدارەکەوە، هـەم ئەوانیـش ئـەو پارەیـە بەسـەر کۆمەڵـگادا دابـەش دەکـەن (Beblawi & Luciani ١٩٨٧). ئـەم شـێوازە لـە دەوڵـەت چونکـە پێویسـتی بـە کۆمەڵـگا نییـە بـۆ ژیـان، واتـە پێویسـتی بە باجـی هاووڵاتییـان نییـە بـۆ ئـەوەی خەرجییەکانـی دەوڵـەت دابین بکات، هەروەهـا چونکە پارەی نـەوت ڕاسـتەوخۆ دەچێتە دەغیلەکانـی دەوڵەتـەوە، بۆیـە نـەک تەنهـا باکـی بـە کۆمەڵـگا نامێنێـت، بەڵکـو کۆمەڵـگا خۆشـی دەکەوێتـە ژێـر ڕەحمەتـی ویسـتی دەوڵـەت و ویسـتی دەسـەڵاتدارانی نـاو دەوڵەتـەوە و بـە ڕادەیـەک نەتوانێت بەبێ دەوڵـەت بژی و پێداویسـتییە هـەرە سـەرەتاییەکانی دابیـن بـکات.

ئـەم مۆدێلـە لـە دەسـەڵات کۆمەڵـگای ئێمـەی لـە دونیـای دوای ڕاپەڕینـدا گـۆڕی بـۆ کۆمەڵـگای فەرمانبەرانـی بێـکار و کۆمەڵگایەکـی بەسـەربازیکراو. بەشـی هـەرەزۆری کۆمەڵـگای ئێمـە فەرمانبـەری حیـزب یـان دەوڵەتـن و لـە ڕاستیشـدا بەرهەمێکـی ئابـووری و کۆمەڵایەتـی قابیلـی باسـکردنیان نییـە. بـۆ نموونـە گـەر سـەیرێکی خێـرای ئـەو فەرمانگانـە بکەیـن کـە لـە سـاڵی ٢٠١٠ لـە ناوچـەی سـلێمانیدا هەبـوون، وێنـەی کۆمەڵگایەکـی بەفەرمانبەرکـراو و بەسـەربازیکراو دەبینیـن. لـە سـاڵی ٢٠١٠ لـە شـاری سـلێمانیدا ١١٤٤ فەرمانگـە هەبـووە،

لەمانە تەنها ١٤یان فەرمانگەی پیشەسازی و ٣٢یان فەرمانگەی بازرگانین، ئەوانی تر فەرمانگەی خزمەتگوزاری و سەربازییە. ژمارەی فەرمانگە خزمەتگوزارییەکان ٨٦٤ فەرمانگەن و ژمارەی فەرمانگە سەربازییەکانیش ٢٣٤ فەرمانگەن. واتە ژمارەی فەرمانگە سەربازییەکان نزیکەی ١٧ جار لە فەرمانگە پیشەسازییەکان زیاتر و نزیکەی ٨ جاریش لە فەرمانگە بازرگانییەکان گەورەترە. گەر بە جۆرێکی تر تەماشای ئەو ژمارانە بکەین، دەبینین ڕێژەی فەرمانگە سەربازییەکان بۆ سەرجەمی فەرمانگەکان ٢٠٪ە، لە کاتێکدا ڕێژەی فەرمانگە پیشەسازییەکان ١٪ و ڕێژەی فەرمانگە بازرگانییەکانیش ٣٪یە. بەسەریەکیشەوە ژمارەی فەرمانبەران لە پارێزگای سلێمانیدان گەیشتۆتە ٢٤٩٥٢٥ کەس، ئەمە جگە لە بوونی ٧٧ هەزار خانەنشینکراو. ئەم ژمارانە نیشانمان ئەدات ئابووریی نەوت لە شێوە ڕەیعییەکەیدا چ جۆرە کۆمەڵگایەکی پشتبەستووی بە دەوڵەت و بە دەسەڵاتداران لە فۆرمی دروستکردنی لەشکرێک لە فەرمانبەردا، دروست کردوە. هاوکات چۆن هێزێکی سەربازیی گەورەشی دروست کردوە بۆ پاراستنی ئەو مۆدێلە لە دەسەڵاتداریتی لەبەرامبەر کۆمەڵگادا.

ئەو مۆدێلە سیاسییە، کە لەپاڵ ئەم ئابوورییە ڕەیعییەدا دروست دەبێت، لەسەر درێژەدان بە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی بێئیش و بێبەرهەم کار دەکات، کۆمەڵگایەک نەتوانێت لەسەر پێکانی خۆی بوەستێت و نەتوانێت بەسەر ئەو پاشکۆییەدا زاڵ ببێت کە دەوڵەت بۆی دروست دەکات. بەرخۆری

یەکێکە لە ئامرازە سەرەکییەکانی ڕازیکردنی ئەم لەشکرە لە فەرمانبەری بێبەرهەم و ئەم کۆمەڵگا بەسەربازگەکراوە. لە ڕاستیدا نەک تەنها بەشی هەرەگەورەی ڕەوایەتیی سیاسیی ئەم دەسەڵاتدارییە پابەستە بە دابینکردنی ئاستێکی دیاریکراوی بەرخۆرییەوە، بەڵکو چالاکیی هەرەسەرەکیی ئەم دەسەڵاتدارێتییە ڕەیعییە، کورت بۆتەوە بۆ مەیسەرکردنی ڕادەیەکی دیاریکراو لە بەرخۆری بۆ هەمووان. ڕاستە ئاستەکانی بەرخۆری لای هێزە کۆمەڵایەتییەکان جیاوازە، هەندێک گروپ ئاستی بەرخۆرییان وەک ئاستی بەرخۆریی مافیاکانی ئەوروپا بەرزە و زۆرینەی کۆمەڵگاش تا دەمرن دەبێت سەریان لەناو بەرخۆریی کاڵا خراپ و هەرزانەکاندا بێت، وەک لە سەرەوە نیشانمان دا، بەڵام هاوکات ئەم مۆدێلە ڕەیعییەی دەسەڵات ئاستێکی دیاریکراوی بەرخۆریی بۆ هەمووان دەستەبەر کردوە و دەستەبەر دەکات. ئەمەش وەک وتم یەکێکە لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی بەخشینی شەرعیەت بە خۆی و یەکێکیشە لە ستراتیژە هەرە سەرەکییەکانی مانەوەی دەسەڵات خۆشی.

بەکورتی یەکێک لە کۆڵکە گرنگەکانی دروستبوونی دیاردەی بەرخۆریی جەماوەری و بەرزبوونی بەرخۆری بۆ ئاستی ئایدیۆلۆژیای باڵادەست، ئەم مۆدێلە ئابووری و سیاسییە و ئەم تێکەڵبوونە بەرفراوان و هەمەلایەنەی ئابووریی نەوت بە دەسەڵاتی سیاسی، دروست و سەروەری کردوە.

## دووهەم
## دروستبوونی دانیشتووانێکی گەورە و گەنج

ئەو وێنەیەی سەرەوە کاتێک تەڵختر و تاریکتر دەبێتەوە کە زانیمان کە ژمارەی دانیشتووانی شارەکانی کوردستان لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا بە ڕادەیەکی گەورە گەشەی کردوە. بۆ نموونە ژمارەی دانیشتووانی شاری سلێمانی بە بەراورد بە ساڵی ۱۹۹۱ ئەم گۆڕانە گەورانەی بەسەردا هاتووە: لە ساڵی ۱۹۹۱ سەرجەمی ژمارەی خێزانەکانی شاری سلێمانی بریتی بوون لە ١٤٩١٢٤ خێزان، بەڵام لە ساڵی ۲۰۱۰ ئەم ژمارەیە بەرز بۆتەوە بۆ ٣٦٥٠٦٥ خێزان. واتە گەورەبوونی بڕی خێزانەکان لەو شارەدا بە ڕێژەی لە سەدا سەد و چلوچوار لە ماوی سی ساڵدا. سەرجەمی ژمارەی دانیشتووانیش لە ساڵی ۱۹۹۱ لە سلێمانی ۹٥۱۷۲۳ کەس بوو بە ئاوارەکانی کەرکوک و خانەقینیشەوە، بەڵام ساڵی ۲۰۱۰ بەرز بۆتەوە بۆ ۱۸٥۱٥۰۸ کەس بەبێ ئاوەرەکان، لێرەشدا گەشەی دانیشتووان نزیکەی لە سەدا سەد زیادی کردوە. بەشی هەرەزۆری ئەم دانیشتووانە، واتە ڕێژەی ۸۹.۹٪ لەناو شاردا دەژین. ئەم گەشە گەورەیەی دانیشتووان بووەتە هۆی بەرزبوونەوەیەکی گەورە و بەرچاوی ژمارەی منداڵان و گەنجان لە کۆمەڵگای ئێمەدا، بە ڕادەیەک، کۆمەڵگای کوردی یەکێکە لە کۆمەڵگا گەنجەکانی دونیا. ژمارەی منداڵانی تەمەن کەمتر لە ۱ ساڵ ڕێژەی ۲٪ی دانیشتووان پێک دەهێنێت، ڕێژەی منالانی نێوان ۱-٥ ساڵیش ۱۲٪ی دانیشتووان و ژمارەی تەمەنی نێوان ٥-۱٥ ڕێژەی ۲۳٪ ی دانیشتووان پێک دەهێنن. بەسەریەکەوە ڕێژەی منالانی ژێر تەمەنی ۱٥ ساڵ ۳۷٪ دانیشتووانە.

ژمارەی ئەوانەش کە لە تەمەنی گەنجیدان و دەتوانن کار بکەن، واتە لەنێوان ١٥ بۆ ٦٠ ساڵدان ٥٨٪ی دانیشتووان پێک دێنن. ڕێژەی پیرییش، واتە ئەوانەی تەمەنیان لە سەروی ٦٠ ساڵەوەیە تەنها ٥٪ی دانیشتووانە. ئەم ڕێژانە ئەوەمان نیشان ئەدەن لە کوردستاندا کۆمەڵگایەکی گەنج دروست بووە کە پێویستی بە هەموو جۆرە کاڵا و شتومەکێک هەیە بۆ دابینکردنی لانی کەمی ژیانێکی ماقووڵ. ئەم لەشکرە گەورەیە لە گەنج خاوەنی حەز و ویست و ئارەزووی تایبەتە و هەڵگری وزەیەکی کۆمەڵایەتیی گەورەشە، بۆ دەسپێکردنی ژیانی تایبەت بە خۆیان و لەپاڵ گەورەبوونی ڕۆژانەیاندا پێویستیان بە هەموو جۆرەکانی بەرخۆری هەیە. ئەمە وا دەکات بەرخۆری ببێت بە یەکێک لەو چالاکییە سەرەکییانەی کە هاوشان بە گەوربوون و پێگەیشتنی ئەم نەوەیە بڕوات. بوونی بەرخۆری بە دیاردەیەکی جەماوەری لە کۆمەڵگای ئێمەدا لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە بەم ژمارە گەورەیە لە گەنجەوە، یان وردتر بدوێین بەشێکە لە ئاکاری دروستبوونی کۆمەڵگایەکی گەنج لەپاڵ ئەو مۆدێلە ئابووری و سیاسییە ڕەیعییەی لە سەرەوە باسمان کرد.

## سێهەم

## بەرزبوونەوەی پلە و ڕادەی خوێندەواری

بەرزبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان و گەنجبوونی بەرچاوی کۆمەڵگای ئێمە هاوشانە بە پرۆسەیەکی بەرفروانی بەخوێندەواربوونی ئەم کۆمەڵگایە. ئەمڕۆ بەشێکی گەورەی کۆمەڵگای ئێمە خوێندەوارە و توانای ئەوەی هەیە بزانێت

ئینسـان و کۆمەڵگاکانـی دەرەوەی کۆمەڵـگای کـوردی چـۆن دەژیـن. بـۆ نموونـە پێش سـاڵی ١٩٩١ ڕێـژەی نەخوێنـدەواری ٣٢٪ بـووە لـە پارێزگای سلێمانیدا، بـەڵام لە ئێسـتادا ئەم ڕێژەیە بـۆ ١٥٪ دابەزیـوە. لـە ئێسـتادا ڕێـژەی ٨٥٪ی دانیشـتووانی تەمـەن ١٠ سـاڵ و گەورەتـر توانـای خوێندنـەوە و نوسـینیان هەیـە و لـە سـاڵی ٢٠١٠شـدا دواهەمیـن منـاڵی تەمـەن ٦ سـاڵ پەیوەندیـی بـە خوێندنـەوە کـردوە.

لـە ئاستی خوێندنی باڵاشدا کۆمەڵێک گۆڕانکاریی بەرچاو لـە دونیـای دوای ڕاپەڕینـدا ڕووی داوە، بـە ڕادەیـەک ئەمـڕۆ کۆمەڵـگای ئێمـە خاوەنـی ژمارەیەکـی گـەورەی دەرچـووی زانکـۆ و پەیمانگاکانـە. ئاشـکرایە ئاسـتی خوێنـدن لـە زانکـۆ و پەیمانگاکانـی کوردسـتاندا هێجـگار لاوازە و لـە زۆر کاتیشـدا وێرانـە، بـەڵام ئەمـە لـەو ڕاسـتییە سۆسـیۆلۆژییە ناگۆڕێت کـە وێناکردنـی ئینسـانی ئێمـە بۆخـۆی وەک ئینسـانێکی خوێندەوار و وەک دەرچـووی خوێندنـی بـاڵا، ئەمـڕۆ لـە هەمـوو کاتێـک بەرفراوانتـرە. ئـەم وێناکردنـەش داواکاری و خواسـتی نوێـی لای ئـەو کەسـانە دروسـت کـردوە کـە پێیـان وایـە دەبێـت دابیـن بکرێـن. هـەر بـە بـەراورد بـە سـاڵی ١٩٩١، کـە یـەک پەیمانـگای تەکنیکـی لـە شـاری سـلێمانیدا هەبـووە، ئەمـڕۆ ١١ پەیمانـگای تەکنیکـی هەیـە، ژمـارەی خوێندکارانـی ئـەو پەیمانگایانـەش لـە ٤٠٨ خوێنـدکارەوە بـەرز بۆتـەوە بـۆ ١٤٨٣٢ کـەس. لـە سـاڵی ١٩٩١دا هیـچ زانکۆیـەک لـە شـاری سـلێمانیدا نەبـووە، بـەڵام ئەمڕۆ ٦ زانکـۆی تێدایـە کـە ٢٣٢٧٣ قوتابـی تیایانـدا دەخوێنـن و ١٢٤٠ مامۆسـتا وانەیـان تێدا دەڵێنـەوە. تەنهـا لـە سـاڵی ٢٠٠٩ و ٢٠١٠ دا ١٢٢٥ قوتابـی لـە خوێندنـی بـاڵا وەر گیـراون و لـە

چوارچێوەی بەرنامەی تواناسازیشدا تەنها لە ساڵی ٢٠١٠دا ٦٤٥ قوتابی ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کراون. دروستبوونی ئەم ژمارە گەورەیە لە خەڵکی خوێندەوار، کە وێنەی تایبەتیی خۆیان وەک کەسێکی پێگەیشتوو هەیە، پێداویستی زۆر و جیاوازیان هەیە کە لە ڕێگای بەرخۆرییەوە پڕیان دەکەنەوە. جگە لەمە بەشێکی زۆری ئەم گروپە تازانە لە قۆناغی دروستکردنی خێزان و ژیانی هاوسەرگیریدان، بۆیە بەرخۆریی لای ئەوانە دەبێت بە بەشێک لە پرۆسەی دروستکردنی سەرەتاکانی ژیانێکی پێکەوەیی و سەربەخۆ. بەخوێندەواربوونی کۆمەڵگای ئێمە وا دەکات ئینسانی ئێمە ژمارەی پێداویستییەکانی گەورەتر بێت، بە شێوەیەکی گشتی کەسی خوێندەوار لە زۆر ڕووەوە داواکارییەکانی لە کەسی نەخوێندەوار زیاترە. بۆیە گەورەبوونی ژمارەی خوێندەواران لە کۆمەڵگای ئێمەدا زیادبوونی داواکاریی لەسەر شتومەک و بەرخۆری گەورە دەکات. ئەمە جگە لەوەی کە کەسانی خوێندەوار لە دونیای ئێمەدا، بە شێوەیەکی گشتی، لە ڕووی ئابوورییەوە لە دۆخێکی باشتردان، بە بەراورد بە کەرتە نەخوێندەوارەکەی ئەو کۆمەڵگایە.

بەکورتی ئەو سێ ڕەهەندەی سەرەوە نیشانمان ئەدەن کە بەرخۆری تەنها داهێنراوێکی ئایدۆلۆژی نییە، بەڵکو بەشێکە لە ئاکاری کۆمەڵگایەکی گەورەی گەنج و خوێندەوار و بەئاگا لە دونیای دەوروبەر و لە شێوە ژیانی کۆمەڵگا دەوڵەمەندەکانی دونیا. بەرزبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان، بەتایبەتی بوونی ژمارەیەکی گەورەی منداڵ و گەنج لە وڵاتەکەدا، وا دەکەن پێویستی بە خۆدروستکردن و پێویستی

بە هەبوونی شتومەک و شوێن و جێگەی تایبەت بۆ ژیان و یاری و حەسانەوە و هتد... گەورە و هەمەلایەن بێت. هەموو ئەمانە وا دەکەن بەرزبوونەوەی ئاستی بەرخۆری لە کوردستاندا، جگە لە هۆکارە سیاسییەکان، کۆمەڵێک بنەمای کۆمەلایەتی و دیمۆگرافی تایبەتی هەبێت و بەشێک بێت لەو پرۆسەی گۆڕانکارییە گەورانەی لەدوای ڕاپەڕینەوە هاتوونەتە کایەوە. بەلام وەک لە خالّی یەکەمدا نیشانم دا ئەم بەرخۆرییە تەنها ئەم پێداویستییە کۆمەلایەتییە دروستی نەکردوە، بەڵکو سیاسەتێکی دیاریکراوی دەسەلات و گەڕان بەدوای جۆرێک لە شەرعیەتی سیاسییشدا دروستی کردوە. بوونی بەرخۆری بە ئایدیۆلۆژیا لەپاڵ ئەو نەخشە کۆمەلایەتی و سیاسییەدا دروست بووە.

**بەرخۆری وەک ئایدیۆلۆژیا**

وەک وتم بەرخۆری لە کوردستاندا تەنها کردەیەکی کۆمەلایەتی نییە و بەتەنها کورت ناکرێتەوە بۆ ئاکاری تایبەتی ئەم هێز یان ئەوی تر، بەڵکو لە ئاستی کردەگیدا بەشێکە لە چالاکیی زۆربەی هەرەزۆری هێزە کۆمەلایەتییەکان و لە ئاستی ڕەمزیشدا بەرز بۆتەوە بۆ بوونی بە ئایدیۆلۆژیا، وەک وتم لە بەرخۆرییی سادەوە بووە بە بەرخۆریزم. کە باس لە بەرخۆریزم دەکەم وشەکە بە مانا هەرە فراوانەکەی بەکار دەهێنم بە جۆرێک هێما بۆ سەرجەمی ئەو فیکر و هەڵسوکەوت و وێنە و زمانانە بکات کە هاریکاری و کۆمەک بە بەرخۆری دەکەن و هانی گەورەبوون و بلاوبوونەوە و بەردەوامبوونی ئەدەن، تا ئەو ڕادەیەی وەک بەش یان

ڕەهەندێکی سەرەکی شووناسی ئەو کەسانە دەر بکەوێت کە بەرخۆری دەکەن. واتە وا دەکەن بەرخۆری ببێت بە بەشێکی گرنگی شووناس، بە جۆرێک لاوازبوون و یان سنووردداربوونی ئاستی بەرخۆری وەک لاوازبوون و نەمانی هەموو شووناس، یان چەند ڕەهەندێکی گرنگی ئەو شووناسە وێنا بکەن. مەبەستم لە شووناس لێرەدا وێنەی ئینسانە لەسەر خۆی، وێنەیەک کە هەڵگری نرخاندنێکی بەهێزی ئینسانە بۆ مانا و نرخ و قورسایی بوونی خۆی وەک تاکەکەس و وەک ئەندامی کۆمەڵگا و گروپێکی دیاریکراو. بەرخۆریزم بەم مانایە لە زۆر شوێنی دونیادا ئامادەیە و بە شێوەیەکی قووڵیش بە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و گەشەکردنی شێوازە جیاوازەکانی سەرمایەدارییەوە پابەستە.

که دەستەواژەی ئایدیۆلۆژیا بەکار دەهێنم مەبەستم لەو مانا مارکسییە تەقلیدییەی ئایدیۆلۆژیا نییە کە یەکسانی دەکات بە وشیارییەکی ناڕاست و هەڵە، یان بە جۆرێک لە "وشیاریی ساختە" کە پێی وایە ڕێ لە تێگەیشتنی "زانستی" و "ڕاستەقینەی" دونیا دەگرێت. لەم نووسینەدا مەبەست لە ئایدیۆلۆژیا شتێکی ئاڵۆزترە لەوەی ئەو دیدە مارکسییە باسی دەکات. با هەر لە سەرەتاوە ئەوەش بڵێم کە ئایدیۆلۆژیا، وەک زۆرێک لە چەمکەکانی تری ناو زانستە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکان، چەمکێکی ئاڵۆزە و پێناسەکردنێکی یەکجاری بۆی، هێجگار زەحمەتە، بە درێژایی مێژووی بەکارهێنانیشی بە شێواز و مانای جیاواز بەکار هاتووە و خراوتە پەیوەندیی جیاوازەوە بە ئەفسانە و سیستمی عەقیدە و شێوازی چاوەڕوانی و دیدگای یۆتۆپیی جیاوازەوە، هاوکاتیش بەستراوەتەوە بە

تیورەی سیاسی و بە جووڵە و گەشەی فیکرەوە، گرێ دراوە بە بیروبۆچوونی نەگۆڕەوە، بە جیهانبینییەوە، بە دیدی ئەخلاقی و بەهاییی تایبەتەوە. ئەم فرەبەکارهێنان و فرەمانایییە وای لە کۆمەڵناسێک کردوە کە بڵێت: ئایدۆلۆژیا "چەکمێکی فرەپارچەیە" (Sartori 1969: 398).

وەک پێشتریش وتم لەم نووسینەدا من ئایدۆلۆژیا بە مانای ڕستێکی زۆری دەستەواژە و چەمک و وێنە بەکار دەهێنم، کە لەلایەن خەڵکانێکی زۆری کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە بەکاردەهێنرێن بۆ باسکردنی خۆیان و باسکردنی حەز و ویست و ئارەزووەکانیان و بۆ تێگەیشتنیشیان لە دونیا و کۆمەڵگا و واقیع. ئایدیۆلۆژیادا لێرەدا جگە لە پێناسەکردنی واقیع بە شێوەیەکی دیاریکراو، پەیوەندیی گروپ و تاکەکەس و هێزەکانی ناو کۆمەڵگایەکیش بەیەکەوە مەیسەر دەکات و ڕۆڵێکی گرنگیش دەبینێت لە ڕەنگرێژکردنی چاوەڕوانییەکانی هەریەکێک لەوانەدا. لەمانەش بترازێت ئایدیۆلۆژیا لەم نووسینەدا وەک ورووژێنەری کۆمەڵێک هەست و سۆزیش بەکار دێت کە وا لە ئینسان دەکەن بە شێوەیەکی تایبەت هەڵسوکەوت بکات و پەیوەندی و هەڵوێستەکانیشی بە شێوەیەکی تایبەت نیشان و بەرجەستە بکات. (Fine & Sandstorm 1993: 21). بەم مانایە ئایدیۆلۆژیا هەم مانای واقیعی و هەم مانای ڕەمزی و هەم مانای ئەخلاقیی هەیە و هاوکاتیش مەیسەرکەری پەیوەندیی نێوان تاکەکەس و هێزە کۆمەلایەتییەکاندا لەگەڵ یەکدا، وەک چۆن یەکێکە لە بزوێنەرە سەرەکییەکانی هەست و نەست و سۆزی کۆمەلایەتی.

کە دەڵێم بەرخۆریی لە دونیای ئێمەدا بووە بە

ئایدیۆلۆژیـا، دەمەوێـت بڵێـم بەرخۆریـی بـووە بـەو گشـتە ئاڵـۆزەی سـەرەوە، بـووە بـە بەشـێک لـەو زمانـەی ئینسـان بـە هۆیـەوە باسـی خـۆی و باسـی دونیـا و باسـی ئـەو واقیعـە دەکات کە تیایدا دەژی، بووە بە بەشێک لەو وێنانـەی ئینسـان لـە ڕێگایانـەوە تەعبیـر لـە خۆزگـە و ئـارەزوو و حەزەکانـی دەکات، هەروەها بووە بە یەکێک لەو بنەما سەرەکییانەی کە پەیوەندیی نێوان تاکەکان و گروپەکان بەیەکەوە ڕێک دەخات و هەسـت و سـۆزی خۆشـحاڵی و بەدبەختـی، هەسـتکردن بـە غـەدر و چەوسـاندنەوە، یـان دواکەوتن و پێشـەکەوتن لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە، نـەک تەنهـا دەوروژێنێـت، بەڵکـو دروسـت و بڵاویـش دەکاتـەوە. بێگومـان هەمـوو ئەمانـە لـە سـایەی ئـەو پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییانـەدا لـەو سـاتەدا لەئـارادان و لـە سـایەی ئـەو هاوکێشـانەی دەسـەڵاتدا کە ئـەو پەیوەندییانە هـەم دروسـتیان دەکـەن، هـەم لەناویانـدا کار دەکـەن.

خاڵێـک کـە بەلامـەوە گرنگـە لێرەدا جەغتـی لـێ بکـەم مەسـەلەی بەرهەمهێنەرانـی ئـەم ئایدیۆلۆژیـا تازەیەیـە لـە کوردسـتاندا، ڕەنگـە ئـەوەی بەرخۆریـزم وەک ئایدیۆلۆژیـا لـە ئایدیۆلۆژیاکانی تـر جیـا بکاتـەوە بەرهەمهێنەرانی ئایدیۆلۆژیای بەرخـۆری بێـت. ئایدیۆلۆژیاکانـی پێشـووتری دونیـای ئێمـە، لەوانـە مارکسـیزم، ناسـیۆنالیزم، لیبرالیـزم و تەنانـەت ئیسـلامیزم، هەموویـان پرۆژەی ڕۆشـنبیران بـوون، واتـە هەڵگر و بەرهەمهێنـەر و بڵاوکـەرەوەی ئـەم ئایدیۆلۆژیانـە ڕۆشـنبیران بـوون، لـە کاتێکـدا بەرمهێنـەر و هەڵگـر و بڵاوکـەرەوەی بەرخۆریزم دەسـەڵاتە، ئـەو نوخبـە دەسـەڵاتگەرەیە کـە وڵاتەکە بەڕێـوە دەبـەن و بەرخۆرییـان کـردوە بـە بەشـێک لـە ئامـرازی

بەخشینی ڕەوایەتی بە دەسەڵاتی خۆیان، نەک ڕۆشنبیران.
لە دونیای ئێمەدا بەدەگمەن نەبێت ڕۆشنبیرێک نادۆزینەوە بەرخۆریزمی وەک فیکر و وەک وێنە و وەک پراکتیک و وەک زمان بە کۆمەڵگا فرۆشتبێت، یان بەرگری لە بەرخۆریزم وەک ئایدیۆلۆژیا کردبێت، بە پێچەوانەوە وێنەی باڵادەستی ڕۆشنبیر لە کۆمەڵگای ئێمەدا وێنەی زاهیدێکی فیکری و مەعریفییە کە لەپێناوی هەقیقەت و جوانیدا دەژی و دوورە لە هەموو شتێک کە زیان بە کۆمەڵگا بگەیەنێت. بێگومان ئەم وێنەیە بۆ ڕۆشنبیر وێنەیەکی ڕۆمانسی و ناڕاستە، ئەو خاڵەی من دەمەوێت بەرگری لێ بکەم ئەوەیە کە بەرهەمهێنەرانی ئایدیۆلۆژیای بەرخۆریزم ڕۆشنبیران نین. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ڕۆشنبیران خۆشیان بەشێک نین لە پرۆسەی بەرخۆری لە وڵاتەکەدا، بە بۆچوونی من ڕۆشنبیران بەشێکی بەرچاوی ئەم دۆخی بەرخۆرییە جەماوەرییەن کە لە کوردستاندا دروست بووە و بە هەمان شێوەی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لەناو بەرخۆریدا نوقمن. ئیدی لە کڕین و بەکارهێنانی ئۆتومبێلی گرانبەها و دروستکردنی سەیرانگا لە دەرەوەی شاردا و خواردنی قاوە و کاپاچینۆی ڕۆژانەوە بیگرە، بۆ کڕینی سێکس و چوونە ناو پەیوەندیی سێکسی قاچاغی دابڕاو لە هەموو مانایەکی ئینسانی. ئەوەی من دەمەوێت بیڵێم نەبوونی پەیوەندی نییە لەنێوان بەرخۆری و ڕۆشنبیراندا، بەڵکو ئەوەیە کە ڕۆشنبیران بەرهەمهێنەر و بڵاوکەرەوەی ئەو ئایدۆلۆژیایە نین. بە بۆچوونی من ئەوەی بەرخۆریی بۆ ئاستی ئایدۆلۆژیا بەرز کردۆتەوە دەسەڵات خۆیەتی، دەسەڵاتە لە دۆخی

بەگەڕخستنی ئەو ماشێنە گەورەیەدا کە وێنە و خەون و زمان و چاوەڕوانییەکان دروست دەکات، بە ڕادەیەک یەکێک لە ئەرکە هەرە سەرەکییەکانی دەزگا گەورەکانی دەسەڵات، بەتایبەتی میدیا و دوای ئەویش خۆنمایشکردنی بەردەوامی دەسەڵات خۆی لەناو کۆمەڵگادا، بریتییە لە گۆڕینی بەرخۆری بۆ ڕەمزی سەرکەوتن و بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵایەتی و بەختەوەریی تاکەکەسی. واتە کردنی بەردەوامی بە ئایدۆلۆژیا و بڵاوکردنەوەی ئەم ئایدۆلۆژیایە بەناو هەموو کونوقوژبنێکی کۆمەڵگادا. هەر ئەمەیە وا دەکات بەرخۆریزم وەک ئایدیۆلۆژیا زیاتر لەسەر وێنە و وروژاندنی هەست کار بکات، زیاتر لە ڕێگای ڕیکلام و دیمەنی تەلەفیزۆنی و ئاکاری کۆمەڵایەتییەوە خۆی نیشان بدات و ببێت بە بەشێک لە دیمەنە باڵادەستەکانی ناو فەزای گشتی، نەک لە ڕێگای تێکست و نووسین و بەرخوردی فیکری و تیوریییەوە. ئەمە وای کردوە ئایدیۆلۆژیای بەرخۆریزم هەم ئایدۆلۆژیایەکی سادە بێت و بە پلەی یەکەم لەسەر بەرهەمهێنانی وێنە کار بکات، هەم پێویستی بە ڕۆشنبیران نەبێت بۆ بەرهەمهێنانی. بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی ئەم ئایدۆلۆژیایە ئەوەندەی پێویستی بە فۆتۆگرافەکان و بە ڕیکلامەسازەکانە، ئەوەندە پێویستی بە ڕۆشنبیران نییە. ڕەنگە یەکێک لەو هۆکارانەی کە وا دەکات ئەمڕۆ فۆتۆگرافی لە کوردستاندا، بە بەراورد بە سەردەمەکانی پێشووتر، برەوەێکی بەرچاوی هەبێت، پەیوەندیی بەوەوە هەبێت ئەم دەسەڵاتە چەندێک پێویستی بەم مۆدێلەی وێنەیە. زمانی سەرەکیی ئەم دەسەڵاتە بەرەو ئەوە دەچێت کەمتر زمانی قسەکردن بێت بە تێکست و زیاتر

زمانـی خۆنماییشـکردن بێـت لـە ڕێـگای وێنـەوە.

هـاوکات ڕەهەندێکی جیهانی و گلۆباڵیی بەرخۆرییش هەیە کە ئەم وێنە و وروژانـە ناوەکییانـە لـە ڕێگای وێنـە و وروژانـی دەرەکییـەوە بەهێـز و بـارگاوی دەکات و پێگـەی ناوەکیـی بەرخۆریـزم وەک ئایدیۆلۆژیـا بەهێزتـر و بەرفراوانتـر دەکات. تێکەڵبوونـی ئایدیۆلۆژیـای بەرخۆریـی ناوەکـی بـە وێنـە و نماییشـەکانی بەرخـۆری دەرەکی بەشێکە لـە تێکەڵبوونی دیاردە گەردونییـەکان بـە دیـاردە ناوچەیـی و لۆکاڵییـەکان کـە ئەمـڕۆ پرۆسـەی بەجیهانیبوون مەیسـەری دەکات. بەمـەش وروژاندنـە ناوەکییەکانـی بەرخۆریـزم بـە وێنـە و نماییشـە دەرەکییـەکان بەهێزتـر و چڕتـر و قووڵتـر دەکرێنـەوە. وەک کۆمەڵناسـێکی گـەورەی بەریتانـی دەڵێـت، "بەرخۆریـزم، چەندەهـا وێنـە و ئامـاژە و ڕەمـز بـەکار دەهێنێـت کـە دەبنـە مایـەی دروسـتبوون و کۆکردنـەوەی خـەون و حـەز و فانتازیـا بەیەکـەوە. ئەمانـەش جۆرێک لە ڕەسـەنایەتی ڕۆمانسییانە پێشنیار دەکەن و تێرکردنی هەسـت و ئارەزووەکەنیـاش بـە شـێوەیەکی نەرجسـییانەی وا ئەنجـام ئـەدەن کـە وا دەکـەن ئینسـان زیـاتر بـە خـۆی موعجیب ببێت تـا بەوانـی تـر." (Featherstone 1991: 19). بەکورتـی بەرخۆریـزم لـە دوادەرەنجامـدا لەسـەر دروسـتکردنی تاکێـک کار دەکات کە بە خۆی موعجیب بێت و لەڕێی بەرخۆرییەوە هەسـت بـەوە دەکات کـە کەسـایەتیی خـۆی دروسـت دەکات و شووناسـێکی ڕۆمانسـییانە بـە خـۆی ئـەدات. لـە لاپەڕەکانـی داهاتـوودا بەدرێـژی لەسـەر ئـەم خاڵـە دەوەسـتین.

ئاشکرایە ئایدیۆلۆژیای بەرخۆریزم بەو مانایانەی لە سەرەوە باسم کرد ئایدیۆلۆژیایەکی نوێیە لە دونیای ئێمەدا،

ئەگەرچی دەکرێت ئاستێکی نیمچەبەرزی بەرخۆری لای ئەم یان ئەو گروپی کۆمەڵایەتی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا بدۆزینەوە، واتە دەکرێت جۆرێک لە کردە و ئاکاری بەرخۆرییانە لەپێش ئەم دەیەدا بدۆزینەوە، بەڵام بوونی بەرخۆریی ئایدیۆلۆژیایەکی جەماوەریی بەرفراوان، تەنها لە دونیای دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەیندا مەیسەر بوو، دونیایەک تیایدا پارەی نەوت و کردەی سیاسەت بەتوندی بەیەکتری تێکەڵ بوون و دەسەڵاتدارانیش بتوانن بە هۆی پارەی نەوتەوە، بەرخۆری هەم وەک پراکتیکی جەماوەری و هەم وەک ئایدیۆلۆژیا دروست و گەشە پێ بدەن.

بەکورتی ئەگەر ناسیۆنالیزم ئایدیۆلۆژیای باڵادەستی کۆمەڵگای ئێمەی قۆناغی بەر لە کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین بێت، ئەوا بەرخۆریزم ئایدیۆلۆژیای باڵادەستی ئەمڕۆیە. کۆمەڵگای ئێمە لە سەدەی بیستویەکەمدا بە پلەی یەکەم لەگەڵ پراکتیک و ئایدیۆلۆژیای بەرخۆریدا دەرگیرە، تا هەر ئایدیۆلۆژیایەکی تر بە ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی سیاسییشەوە. بەرخۆری لە هەموو شوێنێک و لە هەموو ئاستێک و لای سەرجەمی هێز و چینە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای ئێمە ئامادەیە. ئەم گۆڕانەش گۆڕانێکی سادە نییە، شتێک نییە بێکاریگەری و بێدەرەنجام تێبپەڕێت، بە پێچەوانەوە ئەم گۆڕانە کاریگەریی گەورە لەسەر زیاد لە ئاستێک لە ئاستەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی و فەرهەنگی بەجێ دەهێڵێت. با سەرەتا سەرنج لە دەرەنجامە نێگەتیڤەکانی ئەم گۆڕانکارییە بدەین.

**بەرخۆریزم وەک دیاردەیەکی نێگەتیڤ**

بەشێکی زۆری ئەو ئەدەبیاتەی لە فیکری کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری و فەلسەفیدا لەسەر بەرخۆریزم نووسراوە، وێنەیەکی هێجگار نێگەتیڤ بۆ ئەم دیاردەیە دەکێشن. من لێرەدا هەوڵ ئەدەم زۆر بەگشتی هەندێک لە دیمەنەکانی ئەو وێنە نێگەتیڤە بەیەکەوە کۆ بکەمەوە:

یەکەم: بەرخۆریزم جۆرێکی تایبەت لە بەتاکەکەسبوون دروست دەکات، کە ئاکاری سەرەکیی خودئەڤینیە، واتە نەرجستییەکی پەرگیرە، هەروەها جۆرێک لە تاککەگراییی پەرگیر دروست دەکات، کە بە عەقڵیەتی "لێمگەڕێ بژیم" "وازم لێ بێنە بەرخۆر بم" "با وەک مەسرەفکەر و خەرجکەرێک بم" دەژی. ئەم دوو ئاکارەش وا دەکەن هەستکردنی ئینسان بە وەفاداری و توانای بۆ تەحەمولکردنی هەندێک زەحمەتیی ناو پەیوەندییە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکان و ئامادەگی بۆ خەمخواردن بۆ ئەوی دی، بەتەواوی لاواز ببێت.

دووهەم: ئەم دۆخە نەک تەنها هاریکاری و هاودەمیی کۆمەڵایەتی لاواز دەکات، بەڵکو دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی بەشێکی زۆری ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایاتییانەش کە پێکەوەبوونێکی کۆمەڵایەتیی پلورال و ئارام پێویستی پێیەتی. لەم ئاستەشدا بەرخۆری دەسکارییەکی گەورەی ئەخلاقیاتی ژیانی رۆژانە دەکات و بە ئاقاری خودویستییەکی پەرگیر و ترسناکدا دەیبات. وا دەکات بیستن و بینینی دەنگی ئەوانەی دۆخیان باش نییە، ئەوانەی ناتوانن بەرخۆر بن، ئەوانەی پێویستیان بە هاودەردی و هاریکاری و مشوورخواردن هەیە، ئەوانەی لە رووی کۆمەڵایەتییەوە لە دواوەن و پەراوێزن،

نەبینرێن و نەبیسترێن و بەویست و بێویست پشتگوێ بخرێن. ئەمەش ڕەچەتەیەکی گەورەی دروستبوونی پشێویی کۆمەڵایەتییە.

سێیەم: ئەم دۆخی بەرخۆرییە وا دەکات ئاستی کولتوور و هونەر و مۆسیقا و ئەدەبیات و نووسین بە ڕادەیەکی ترسناک دابەزێت و ئەوەی "زەوقی گشتی" دەیخوازێت، ئەوە بگوترێت و بنووسرێت و لێ بدرێت و نیشان بدرێت. بە مانایەکی دیکە، بەرخۆریزم ڕەهەندی ئیستاتیکی لە کەسایەتیی ئینساندا وێران یان بەتەواوی لاواز کردوە. ئەمە جگە لە دروستکردنی هەڕەشەی گەورە و شێلگیر بۆ سەر تواناکانی تەحەمولکردنی زەوی بۆ ئەو بەرخۆرییە بێسنوورەی ئەمڕۆ هەیە و لەئارادایە.

چوارەم: ئەم دۆخە وا دەکات ڕەهەندی سیاسی لە ئینساندا بکوژرێت و کۆمەڵگا بەتاڵ بکرێتەوە لە سیاسەت، وەک چالاکییەکی دەستەجەمعی و وەک چالاکییەکی تاکەکەسی کە کار لەسەر گۆڕانی دونیا و باشترکردنی دەکات. لە شوێنی ئەمەدا جۆرێک لە ناچالاکبوون و پاسیڤبوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی دروست بکات، کە وەک لەمپەرێکی گەورە لەبەردەم هەر هەوڵێکی ڕاستەقینەی گۆڕانکاریدا دەوەستێت.

ڕەنگە لە ئاستی تیوریدا "قوتابخانەی فرانکفۆرت" یەکێک لەو قوتابخانە و ئاراستە فیکرییە گرنگانە بێت کە ئەو دیدە ڕەخنەییەی سەرەوە بۆ بەرخۆریزم نیشان و بەرجەستە دەکات. با سەرنجێکی خێرا لە هەندێک لە بۆچوونە گشتییەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەسەر دیاردەی بەرخۆری لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا بدەین.

**ڕەخنەی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە بەرخۆری**

ڕەنگە لە فیکری کۆمەڵایەتی و ڕەخنەی هاوچەرخدا کەس هێندەی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بەتایبەتی ئەوەندەی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر و هێربەرت مارکۆزە، ڕەخنەیان لە بەرخۆریزم نەگرتبێت، ترسیان لە پەرەسەندنی کولتووری بەخۆری نەبووبێت و بە یەکێک لە سەرچاوە هەرە سەرەکییەکانی هەژاریی فیکری و ئیستاتیکی و ڕۆحی ئینسانی ئەم سەردەمەیان نەزانیبێت. ئاکاری سەرەکی قوتابخانەی فرانکفۆرت ڕەخنەیەکی هەمەلایەنە لە سەرجەمی دەرکەوتەکانی ژیان و کولتووری کۆمەگا مۆدێرنەکان، کۆمەڵگایەک کە ئەوان وەک کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری یان پیشەسازیی بەرخۆر وێنای دەکەن. ڕەخنەی فرانکفۆرتییەکان لە ڕەخنە لە ڕۆشنگەرییەوە دەست پێ دەکات و بە دونیا و کولتووری بەرخۆریی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان دەگات (Bottomore ٢٠٠٢). تێزەی سەرەکیی ئەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە گەشەکردنی دونیای مۆدێرن لەباتیی ئەوەی ئینسانی ئازاد کردبێت، ئینسانی گەمارۆ داوە و هەموو ئازادییەکی ڕاستەقینەی لێ سەندۆتەوە، بە ڕادەیەک مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایانە بوون بە مرۆڤێک لە ئازادی بترسن و لە ئازادی ڕابکەن. لەمەش بترازێت فرانکفۆرتییەکان باس لەوە دەکەن ئەو توانای وێرانکاری و ڕووخانەی لە دونیا و زانستی مۆدێرندا ئامادەیە، زۆر لە توانای ئازادکردنی ئینسانەکان بەهێزتر و هەمەلایەنترە. ئەمەش دونیای

کۆمەڵگا پیشەسازییەکانی لەبەردەم ئەگەری وێرانبوونێکی سەرتاسەریدا داناوە. لە دیدی فرانکفۆرتییەکاندا ئەوەی ڕێ لەوە دەگرێت ئینسانی ئاسایی هەست بەم مەترسییانە بکات و وشیارییەکی ڕەخنەیی لا دروست ببێت، ئەو هەموو فشار و قەیدەش لەسەر ئازادییەکانی ببینێت: بەرخۆرییە. بەرخۆرییە کە بووە بە کولتوورێکی جەماوەریی بەرفراوان و لە هەموو ئاستێکی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا ئامادەیە. ئەم تێزە ڕەشبینە بە شێوازی جیاواز لە نووسینی زۆربەی هەرەزۆری فرانکفۆرتییەکاندا ئامادەیە، ئەم بەرپرسکردنەی بەرخۆرییش لای زۆربەیان یەکێکە لە بابەتە سەرەکییەکانی ڕەخنەکردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییان.

لە ڕاستیدا فرانکفۆرتییەکان لە ئاستی ڕەخنەکردنی بەرخۆریدا بەشێکی زۆری بیروبۆچوونەکانی مارکس لەبارەی "فیتیشیزمی شتومەکەوە" وەر دەگرن و گەشەی پێ ئەدەن. تیورەی "فیتیشیزمی شتومەک" لای مارکس تیورەیەکی سادەیە و دەیەوێت بڵێت ئینسان لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا ئارەزووی شتومەک و کەرەستەکان ناکات لەبەر نەوعیەتی ئەو شتومەکانە، یان لەبەر سوودی ناوەکیی بەکارهێنانیان، بەڵکو حەز لە بوونیان دەکات، چونکە بوونیان بووە بە هێما و ڕەمزی هەندێک بەهای کۆمەڵایەتیی بەرز و تایبەت لە کۆمەڵگادا. واتە شتومەکەکان لەوە دەر چوون تەنها شتومەک بن، بەڵکو بوون بە هێما و ڕەمز بۆ کۆمەڵێک شتی تر کە لە دەرەوەی شتومەکەکان خۆیاندا ئامادەن. بۆ نموونە بوون بە هێما بۆ شوێن و جێیەکی کۆمەڵایەتی،

بۆ سەرکەوتن لە ژیاندا، بۆ بەختەوەربوونی خاوەنەکانیان هتد... لە پەیوەندیدا بەو دیدەی مارکسەوە بۆ "فیتیشیزمی شتومەک" تێزەی سەرەکی فرانکفۆرتییەکان بەم جۆرەیە. کۆمەڵگای سەرمایەداری کۆمەڵگای بەرهەمهێنانی ژمارەیەکی بێشومار شتومەکە، ئینسان پێویستی بەم شتومەکانە نییە، بەڵام سەرمایەداری دەتوانێت لە ڕێگای ڕیکلامی زۆر و بەرهەمهێنانی جەماوەریی بێشومارەوە، وایان نیشان بدات وەک ئەوەی شتومەکی هێجگار پێویست بن، ئینسان بەبێ بوونی ئەوان، نەک نەتوانێت بژی، بەڵکو نەتوانێت بەختەوەر بێت و بەها و نرخێکی کۆمەڵایەتی و ئینسانیی ئەوتۆشی نەبێت. هاوکات سەرمایەداری بەردەوام خەریکی دروستکردنی "پێداویستیی درۆ و ساختەیە" و وا لە ئینسان دەکات هەمیشە خەریکی کارکردن بێت بە مەبەستی دابینکردن و تێرکردنی ئەو پێداویستییە دروستکراو و ساختانە. بە بۆچوونی فرانکفۆرتییەکان گەشەکردنی ئابووریی بەردەوام و سەرقاڵکردنی ئینسان بە بەرخۆری و بە دەستەبەرکردنی ئاستێکی بەرز لەو بەرخۆرییە، دۆخێک دروست دەکات تیایدا کاری شۆڕشگێڕانە بۆ ژێرەوژوورکردنەوەی سیستمی سەرمایەداری زەحمەت یان مەحاڵ بێت و هەموو هێزە کۆمەڵایەتییەکان، بە چینی کرێکاریشەوە، ببن بە بەشێک لە سیستمەکە و لەناویدا عاقڵانە و دەستەمۆکراو و بێ کردەی شۆڕشگێڕانە، دابنیشن. بەکورتی ئەوەی بەرخۆری لە دوادەرەنجامدا لە ئاستە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکەیدا دروستی دەکات، ئینسان و کۆمەڵگایەکی کۆنترۆڵ و

ئاراستەکراوی بێکردە و هەوڵی ڕاستەقینەی شۆڕشگێڕانەیە (Marcuse 1992).

لە دیدی فرانکفۆرتییەکاندا ئەو ئامرازە سەرەکییەی ئەم پرۆسەی کۆنترۆڵ و ئاراستەکردنەی کۆمەڵگا ئاسانتر و مەیسەر دەکات، میدیای نوێ و کولتووری میللی، یان "پۆپ کولتوور"ە. ئەم میدیا و کولتوورە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە ئاوساندنی ئارەزووەکانی ئینساندا بۆ بەکارهێنانی شتومەکە بەرهەمهێنراوەکان، کە وەک وتم، فرانکفۆرتییەکان وەک پێداویستییەکی دروستکراوی ساختە وێنای دەکەن و سیستەمەکەش لەپێناوی قازانجی بەردەوامبوونی خۆی و ڕێگرتن لە کردەی شۆڕشگێڕانەی دژ بە سیستەمدا دروستی کردون. بە بۆچوونی فرانکفۆرتییەکان مەترسیی کاریگەرییەکانی سیستەمەکە لەوەدایە کە توانیویەتی دابەزێت بۆ ئاستی بەجێهێشتنی کاریگەریی گەورە لەسەر "بێئاگایی"ی ئینسان، بە جۆرێک ئینسانەکان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بێبیرکردنەوە کڕین و هەبوونی ئەو شتانە بە پێویست بزانن و هەبوون و بەکارهێنانیان وەک بەشێکی دانەبڕاو و سروشتیی ژیان وێنا بکەن. بە کڕین و بەکارهێنانی شتومەکەکانیش ئینسان بە شێوەیەکی خۆخەڵەتێنەرانە هەستێکی ساختەی بە بەختەوەری لەلا دروست ببێت و وا بزانێت کڕینی ئەو شتومەکانە بەختەوەری کردوە و بەختەوەری دەکات. هەستکردنی ئینسانیش بەم بەختەوەرییە ساختەیە وا دەکات نەتوانێت ئەو هەموو نادادپەروەری و خراپەکاری و مەترسییانە ببینێت کە سیستەمەکە بەرهەمیان

دەهێنێت و بڵاویان دەکاتەوە، یان گەر تەنانەت توانای بینین و هەستپێکردنیشیانی هەبوو، لەباتی ئەوەی بیانگۆڕێت، هەوڵ بدات خۆی لەگەڵیاندا بگونجێنێت و وەک بەشێک لە ژیان قبووڵیان بکات. وەک وتم فرانکفۆرتییەکان ڕۆڵێکی هێجگار گەورە بە کولتوور و میدیا دەبەخشن لە پاراستنی ئەم دۆخەدا. بۆیە لەباتیی ئەوەی باس لە کولتوور بکەن وەک دیاردەیەکی تاکەکەسی، باس لە "پیشەسازیی کولتوور" دەکەن وەک دیاردەیەکی میکانیکی. لای فرانکفۆرتییەکان کولتوور وەک هەموو شتەکانی تر بووە بە پیشەسازی، بووە بە شتومەک و ئامانج لێشی بەدەستهێنانی قازانج و پاراستنی سیستمەکەیە، نەک وشیارکردنەوەی ئینسان و دەوڵەمەندکردنی دونیا ناوەکییەکەی و بەرهەمهێنانی وشیارییەک گۆڕانخواز و شۆڕشگێڕ. "پیشەسازیی کولتوور" و میدیا، یارمەتیی سیستمەکە ئەدەن دەسەڵاتی ئایدۆیۆلۆژیی خۆی و پێداویستییە فیکری و دەروونییەکانی بەردەوامبوونی بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاو بکاتەوە و وەک پێدراوێکی سروشتی و ئاسایی لەناو ئینسانەکاندا بیانچێنێت. بۆچوونەکانی ئەدۆرنۆ لەسەر "مۆسیقای پۆپ"، یان "مۆسیقای میللی"ی ئەمەریکی، بەباشی ئەم خاڵەمان بۆ ڕووناک دەکاتەوە (Adorno 2002)..

ئەدۆرنۆ ڕقێکی تایبەتی لە مۆسیقای پۆپە و بە یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی هەژاربوونی ڕۆحی ئینسانی ناو کۆمەڵگا هاوچەرخەکانی دەزانێت. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە ئەدۆرنۆ بەراوردێک لەنێوان مۆسیقای میللی

ئەمرۆکە و مۆسیقای کلاسیکیدا دەکات و مۆسیقای کلاسیکی زۆر بە بەرزتر و بە ماناداری‌تر دادەنێت و دەنرخێنێت. ئەدۆرنۆ پێی وایە مۆسیقای کلاسیکی بۆ نوخبەیەکی کەم لێ ئەدرا کە توانای چێژوەرگرتنیان لە هونەری باڵا هەبوو، بەڵام مۆسیقای پۆپ، بەشێکە لە "پیشەسازیی مۆسیقا"ی دونیای سەرمایەداری و ئامانجی سەرەکییش لێی چێژوەرگرتنی هونەری نییە، بەڵکو فرۆشتنی زۆرترین کاسێتی ئەو مۆسیقا و گۆرانیانەیە. واتە ئەوەی ئەم مۆسیقایە ئاراستە دەکات ئیستاتیکا نییە، بەڵکو بازرگانییە. بۆیە "پیشەسازیی مۆسیقا" بەگشتی و مۆسیقای پۆپ بۆ زۆرترین فرۆش، ڕوو دەکەنە زۆرینەی کۆمەڵگا، نەک ئەو نوخبەیەی کە زەوقی مۆسیقییان هەیە. ئەمەش مانای ئەوەی ڕوو دەکەن خەڵکی سەر بە چینەکانی خوارەوە، ئەوانەی، بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، زەوقی هونەرییان گەشەی نەکردوە و ناتوانن چێژی ڕاستەقینە لە مۆسیقا ببینن. ئەمە وای کردوە مۆسیقای پۆپ پڕ بێت لە سۆزفرۆشییەکی ڕووکەش و بێئاست و بێناوەرۆک، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت سێنتەمێنتالیزم. واتە ئەم مۆسیقایە لەسەر عاتیفەیەکی سادەی گەشەنەکردوو کار دەکات کە مۆسیقاکە لە گوێگردا دروستی دەکات و هەستێکی درۆزنانە و بێقوولایی بەتاکەکەسبوونیشی پێ دەبەخشێت. لای ئەدۆرنۆ ئەم مۆسیاقایە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا ڕۆڵی ئەو "چیمەنتۆ کۆمەڵایەتییە" دەبینێت کە بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگا بەیەکەوە گرێ ئەدات و ناهێڵێت کۆمەڵگای سەرمایەداری لەبەریەک هەڵبوەشێتەوە. لە دیدی ئەدۆرنۆدا

هەموو ئەم شتانە وا دەکەن هەم ئاستی مۆسیقاکە بەتەواوی بێتە خوارەوە و هەم مۆسیقا ببێت بە ئامرازێکی گرنگی مانەوەی سیستمەکە. ئەدۆرنۆ بەوەوە ناوەستێت تەنها ڕەخنە لە مۆسیقای پۆپ بگرێت، بەڵکو ڕەخنە لەو جەماوەرەش دەگرێت کە گوێ لەم مۆسیقایە دەگرن و بە "منداڵێکی و بێزەوق" ناویان دەبات. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ مۆسیاقای پۆپ مێشکی گوێگرەکان دەشواتەوە و بەتاڵیان دەکاتەوە لە هەر وشیارییەکی ڕەخنەییی ڕاستەقینە، بە کوردییەکەی گێل و بێمێشکیان دەکات. ئەدۆرنۆ ئەم مۆسیقایە وەک یەکێک لە سەرچاوە هەرە سەرەکییەکانی ڕێگرتن لە دروستبوونی وشیارییەکی ڕەخنەییی شۆڕشگێڕانە نیشان ئەدات. (Adorno 1941) ئاشکرایە ئەوەی ئەدۆرنۆ لەسەر مۆسیقای میللی، یان پۆسیقای پۆپ دەیڵێت، پڕە لە موبالەغە و ناڕاستی و لە دیدێکی نوخبەویی هێجگار بەرتەسک و لە تێگەیشتنێکی تەواو نوخبەوییەوە بۆ مۆسیقا و بۆ چێژوەرگرتن نووسراوە. ئەدۆرنۆ لێرەدا وەک داوەرێکی بێڕەحم و لەڕاستیدا دەسەڵاتگەر داوەری دەکات و ئەوەی لەگەڵ زەوقی خۆیدا نەگونجێت، بە ناڕاست و بێئاست و بێزەوق ناوی دەبات.

لەسەر هەمان نەغمەی ئەدۆرنۆ، هێربێرت مارکۆزە، بەتایبەتی لە کتێبی: *مرۆڤی تاکڕەهەندد*ا، ڕەخنەیەکی توند و هەمەلایەن لە کۆمەڵگای بەرخۆری و خودی بەرخۆری دەگرێت و دروستبوونیان وەک دیاردەیەکی ترسناک ناو دەبات. لە دیدی مارکۆزەدا بەرخۆری لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا جۆرێکی نوێی لە ئینسان یان تاکەکەسی دروست کردوە

کە نە توانای ئەنجامدانی کردەی شۆڕشگێڕی و نە توانای چێژوەرگرتنی لە جوانی هەیە. بە مانایەکی تر بەرخۆری لە یەک کاتدا هەم ڕەهەندی سیاسی و هەم ڕەهەندی جوانکاریی لە ئینساندا کوشتوە. کۆمەڵگا پیشەسازییەکان لە ڕێگای بەرخۆرییەوە چەندەها "پێداویستیی ساختە"یان دروست کردوە و کاری ئەم "پێداویستییە ساختانە"ش ئەوەیە ئینسان لەناو سیستمی سەرمایەداریدا نوقم و بێهۆش بکەن. بۆ ئەمەش هەموو تواناکانی میدیای هاوچەرخ و ڕیکلام و چەندان تیورەی کارگێڕی و تەکنیکەکانی مێشکشۆرینەوە و ئاراستەکردن بەکار دەهێنن (Marcuse 1992). مارکۆزە بەرخۆریزم وەک شێوازێکی بەهێزی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی وێنا دەکات و پێی وایە ئەوەی زەوق و حەز و پێداویستییەکانی ئێمە ئاراستە دەکات، کۆمەڵە کەسانێکی زۆر کەمن، کە سەرپەرشتیی ڕیکلام دەکەن بۆ شتومەکەکان. بە بۆچوونی مارکۆزە ئەم گروپە بچووکە هیچ توانایەکی هەڵبژرادن لە ئێمەدا ناهێڵێتەوە تەنها توانای هەڵبژاردن نەبێت لەنێوان ئەم یان ئەو شتومەکەدا و یەکسانکردنی کڕینی ئەو شتومەکانەیش بە بەختەوەری (Marcuse 1992: 3).

هەڵبەتە من لێرەدا شوێن و جێی ئەوەم نییە سەرجەمی ئەو ڕەخنە زۆر و فرەلایەنانە باس بکەم کە لەم دیدەی فرانکفۆرتییەکان بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری و بۆ مۆسیقا و بۆ کولتووری میللی و بۆ تاکگەرایی لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا هەیە و گیراوە. بۆ نموونە دیدی هێجگار نێگەتیڤی و نوخبەویی ئەدۆرنۆ بۆ مۆسیقای پۆپ و بۆ بەجەماوەریبوونی کولتوور

بە دیدێکی کراوەتر و دیموکراسییانەتری وەک دیدی واڵتەر بنیامن بەراورد بکەم. هاوکات کاتی ئەوەم نییە نیشانی بدەم کە یەکێک لە کێشە سەرەکییەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت گشتگیری و ناکۆنکریتیی بەشێکی گرنگی تێزەکانی ئەم قوتابخانەیەیە، چونکە ڕەخنەی کۆمەڵایەتی کاتێک مانادار دەبێت کە بتوانێت ئەو ئەگەرە مێژوویی و توانا شاراوە و بەرچاوانەی بەرگریکردنیش نیشان بدات کە لە کۆمەڵگادا ئامادەن. بەشێکی گرنگی تێزەکانی قوتابخانەی فراکنفۆرت سەر بەو جۆرە تێزانەیە کە لە زمانی زانستیدا پێی دەڵێن speculative، یان مەزەنەگەری، لە کاتێکدا ئەوەی لە ڕەخنەی کۆمەڵایەتیی زانستی چاوەڕوان دەکرێت، بوونی تیورەیەکی مێژووییە کە پایەکانی لە پەیوەندییەکی پتەودا بن بە نیشاندانی ئەگەرەکانی گۆڕانکارییەوە لە کۆمەڵگادا. ئەوەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا بەلامەوە گرنگ بوو نیشانی بدەم، ئەو دیدە نێگەتیڤە گشتگیر و ڕەخنە فرەلایەنەیە کە فرانکفۆرتییەکان بۆ بەرخۆری و بۆ بەجەماوەریبوونی شتومەکیان هەیە، هاوکات بۆ توانا و کاریگەریی بێوێنە و هەمەلایەنی بەرخۆری لەسەر وشیاریی ئینسان هەیانە. وەک خوێنەر دەبینێت لە دیدی فرانکفۆرتییەکاندا شتێکی پۆزەتیڤ لەسەر دیاردەی بەرخۆریی نادۆزینەوە، نەک هەر ئەمە، بەڵکو ئەوان بەرخۆری بە نەخۆشی هەرەگەورەی دونیای مۆدێرن دەزانن.

ئەوەی لە چەند لاپەڕەی داهاتوودا دەمەوێت نیشانی بدەم ئەوەیە، کە ئەم ڕەفزە ڕادیکاڵ و بنەڕەتییەی فرانکفۆرتییەکان

بۆ بەرخۆری و کورتکردنەوەی بۆ دیاردەیەکی نێگەتیڤ و ترسناک، وا دەکات هەندێک ئەگەر و ڕەهەندی پۆزەتیڤ نەبینین، کە دەشێت بەرخۆری لە ڕەوتێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو و لە سەردەمانێکی مێژوویی تایبەتدا بیانخاتە بەردەستی ئینسان و کۆمەڵگا، بۆ گواستنەوە لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی دیکە و لە شێوازێکی تایبەتی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتییەوە بۆ شێوازێکی تر. بۆ نموونە دروستبوونی ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسیی نوێ کە یەکەی سەرەکی تیایدا، یان لانی کەم یەکێک لە یەکە سەرەکییەکان، تاکەکەس بێت، نەک بۆ نموونە پێدراوە تەقلیدییە دەستەجەمعییەکانی وەک خێزان و بنەماڵە و حیزب و دروستکراوی دستەجەمعیی تری لەم بابەتە. بە بۆچوونی من ئەگەرچی بەشێکی گرنگی ڕەخنەی فرانکفۆرتییەکان لە کۆمەڵگای بەرخۆریی جەماوەری، ڕەخنەی گرنگ و ڕاستەقینەن، بەڵام ئەو حوکم و داوەرییە گشتگیر و ڕەهایەی لە پەیوەندیدا بە کۆمەڵگای بەرخۆرییەوە گوزارشتی لێ دەکەن، داوەری ناڕاست و نازانستییە، لە ڕاستیشدا داوەری و حوکمێکی هێجگار سادە و بێقووڵایی و پڕموبالەغەشە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە دەمەوێت سەرنجی خوێنەر بۆ هەندێک دیدی فیکریی تر ڕابکێشم کە دیاردەی بەرخۆری بەڕەهایی بە دیاردەیەکی نێگەتیڤ نازانێت و هەندێک ئەگەری پۆزەتیڤ لەناو ئەم دیاردەیەدا دەبینێت، ئەم دیدانە تا ئەو شوێنە دەڕۆن کە بڵێن هەندێک ڕەهەندی دیموکراسی و تاکگەرایی گرنگ هەن کە بەرخۆری دەتوانێت ڕۆڵ لە

دروستبوون و بەهێزکردنیاندا ببینێت. من بۆ ئەم مەبەستە دەمەوێت زۆر بەکورتی هەندێک لە بۆچوونەکانی فەیلەسوفی هۆڵەندی هاری کونەمان دەربارەی بەرخۆریزم نیشان بدەم، کە لە پازدە ساڵی ڕابردوودا لە زیاد لە کتێبێکدا بەوردی دەری بڕیون کاری لەسەر کردون (Kunneman 1998, 1996).

بە شێوەیەکی گشتی کارەکانی ئەم فەیلەسوفە هۆڵەندییە دژ بەو "ڕەشبینییە کولتوورییە" دەجەنگێت کە بەشێکی بەرچاوی فیکری ڕەخنەیی و فیکری چەپگەریی فرانکفۆرتییەکان و ئەوانەی دوای فرانکفۆرتییەکانن. ئەوەی کونەمان دەیەوێت نیشانی بدات، بەبێ نکوڵیکردن لە ڕووە ترسناکەکانی دونیای ئەمڕۆ، ڕەهەند و ئەگەرە پۆزەتیڤ و گرنگەکانی ناو ئەم دونیایەیە. پەڕینەوەیە لە ڕەشبینییەکی هەمەلایەنەوە بۆ بەرگریکردن لەو ڕەهەند و ئەگەرانەی گەشبینی کە لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا ئامادەن. لەمەشدا بەردەوام لە فەلسەفەوە دەگوازێتەوە بۆ کۆمەڵناسی و لە کۆمەڵناسییشەوە دەچێتەوە ناو فەلسەفە. لە هەڵسەنگاندنیدا بۆ دیاردەی بەرخۆری، تێزی سەرەکیی ئەم فەیلەسوفە هۆڵەندییە ئەوەیە کە بەرخۆری سەرباری ڕەهەندە نێگەتیڤەکانی، هەندێک ڕەهەندی پۆزەتیڤیشی هەیە. ئەم ڕەهەندە پۆزەتیڤانەش لەوەدا بەرجەستەن کە بەرخۆری دەتوانێت هاریکاری ئینسان بکات بۆ ئەوەی بتوانێت لەو جەبر و فشارە دەستەجەمعی و کۆییانە ڕزگاری ببێت کە ڕێگرن لەبەردەم گەشەکردنی ئینساندا بۆ تاکەکەسێکی سەربەخۆ و ئازاد، بێگومان

سەربەخۆیی و ئازادییەکی ڕێژەیی. هەروەها بەرخۆری لە دیدی ئەم فەیەلسوفەدا دەتوانێت هاریکاریی ئینسان بکات بۆ ئەوەی لەو کولتووره "چەترئاسا" دەستەجەمعی و تەقلیدییانە ڕزگاری ببێت کە دەیانەوێت تاکەکەسەکان بهێننە ژێر چەترەکانی خۆیانەوە و داوەری و نرخاندنیشیان لەسەر ورد و درشتی ژیانی تاکەکەسی هەبێت، کولتوورێک وەک کونەمان نیشانمان ئەدات تا شۆڕشی گەنجانی ساڵی ١٩٦٨ ڕەهەندێکی زۆر بەهێزی کولتووری کۆمەڵگا ئەوروپییەکان بووە. کونەمان پێی وایە بەرخۆری دەتوانێت ئەم کولتووره دەستەجەمعییە پڕ فشار و زۆربۆهێنانە بگۆڕێت و لە شوێنی ئەودا کولتوورێکی نوێ پایەدار بکات کە تاکەکەس تیایدا بتوانێت خۆی ژیان و حەز و ویستە جیاوازەکانی خۆی دەسنیشان بکات و یارمەتیشی بدات دونیایەکی تایبەت بەخۆی دروست بکات. کونەمان ئەم کولتووره نوێییە ناو دەنێت کولتووری "ۆکمان" (Kunneman 1996).

لە دیدی ئەم فەیلەسوفە هۆڵەندییەدا گەشەسەندنی ئابووری و گەورەبوونی بازاڕ و زیادبوونی توانای بەرخۆری ئەگەری بەتاکەکەسبوون گەورەتر و فراوانتر دەکەن و کۆنترۆڵی گروپ و هێزە تەقلیدییەکانی تری کۆمەڵگا، کۆنترۆڵی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی ئایدیۆلۆژیا تەقلیدی و گەورەکان لەسەر ئینسان کەم دەکەنەوە. ئەمەش نەک ڕووداوێکی نێگەتیڤ و بێبایەخ نییە، بەڵکو گۆڕانکارییەکی گرنگیشە. هاری کونەمان ئەوەمان نیشان ئەدات کە پرۆسەی بەتاکەکەسبوون تەنها بە هۆی چالاکیی فیکرییەوە دروست نابێت، تەنها ڕەخنە لە

ئەخلاقیاتی گروپ و لە ئەخلاقیاتی بالادەست و سیستم بە مانا ئەبستراکتەکەی دروستی ناکات، تەنها ڕەخنە لە دین و لە ئایدیۆلۆژیا گشتگیرەکان نایخولقێنێت، پرۆسەکە هەر لە بنەڕەتەوە پرۆسەیەک نییە تەنها فیکر و ئەدەبیات و هونەر و داهێنان و ڕەخنە بیخولقێنێت، بەڵکو پرۆسەی بەتاکەکەسبوون بنەمایەکی ئابووری و کۆمەلایەتیی گرنگیشی هەیە کە گەشەکردنی ئابووری بۆ ئاستی دروستبوونی "ئابووری بەرخۆری" ئاراستەی دەکات. لەم دیدەدا گەشەکردنی ئابووری توانای بڕیاردانی ئینسان گەورەتر دەکات و وا دەکات ڕووبەر و جوگرافیای دەستپێشخەرییەکانیشی گەورەتر ببێت، بتوانێت لەنێوان زیاد لە ئەگەرێکی کڕین و سەرفکردندا هەڵبژێرێت، بتوانێت دونیایەکی تایبەت، کە شتومەکی تایبەت بە خۆی تێدا بێت، بەدەوری خۆیدا دروست بکات. (Kunneman 1996).

ئەم فەیلەسوفە لەپاڵ دیدی هەندێک دەروونناسدا باس لەوە دەکات کە کردەی بەرخۆری دەشێت دوو شت ئەنجام بدات. یەکەمیان بەرخۆری حەز و ئارەزوویەکی تایبەت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و دەستبەجێ تێر بکات. دووهەم پێداگرتن لەسەر ئەو ڕاستییەی ئەوەی کە دەکڕدرێت دەبێت بە موڵکی ئەو "من"ەی کە دەیکڕێت. ئەو "من"ە دەبێت بە خاوەنی ئەو شتە و ئەوەی دەیکڕێت دەچێتە ژێر دەسەلاتی تەواوەتی ئەو "من"ەوە. ئەو ئوتومبێل و خانوو و کتێبەی کە تۆ دەیکڕیت، چیدی بەتەنها کتێب و ئوتومبێل و خانوو نین، بەڵکو کتێبی "تۆ" و ئوتومبێلی "تۆ" و خانووی

"تۆ"ن. واتە "تۆ" دەتوانیت تەواوی ئەو شتانە بخەیتە ژێر ڕکێفی خۆتەوە" (Kunneman 1996 b). ئەم پرۆسەیە هەستکردنی ئینسان بە خودی خۆی و بە تواناکانی ئەو خودە بەهێز و گەورە دەکات. بەکورتی بەرخۆریی هەم هەستکردن بە خود خۆی بەهێز دەکات، هەم هەستکردن بە حەز و ئارەزووەکانی ئەو خودە و ناسینیان. هەموو ئەمانەش هەنگاوی گرنگن لە دروستبوون و گەشەکردنی هەستکردن بە "من"ی تاکەکەسیدا. کونەمان دەڵێت، "بەرخۆری بەم مانایە تەنها کڕین و بەکارهێنانی شتومەکە مادییەکان نییە، بەڵکو چالاکییەکە هاریکارە لە دروستکردنی شووناسدا." (ە. س. پ). شووناسێک تیایدا تاکەکەس خۆی سنوور و ڕووبەرە سەرەکییەکانی دەستنیشان دەکات، نەک ئەو یەکە کۆمەڵایەتییە دەستەجەمعییانەی کە لە دەرەوەی تاکەکەسدا ئامادەن، یان ئەو یەکانە بەزۆر سنوور و ڕووبەرێکی تایبەتی بەسەردا بسەپێنن. نموونەی ئەو یەکە کۆمەڵایاتییانەش خێزان و دین و حیزب و نەتەوە و سەرجەمی ئەو گروپ و کۆمەڵانەی ترن کە ئینسان لە پاڵیاندا و لەناویاندا دەژی. کونەمان بەرخۆری بە یەکێک لە هۆکارەکانی گواستنەوە لە باڵادەستیی شووناسی کوییی تەقلیدییەوە بۆ شووناسی تاکەکەسی دەبینێت و ئەمەش وەک گۆڕانێکی پۆزەتیڤ وێنا دەکات.

ئەوەی ڕاستیی ئەم دیدەی کونەمان دەسەلمێنێت، مەبەستم ئەو دیدەیە کە پێی وایە بەرخۆری تەنها کڕین و بەکارهێنانی شتومەکە مادییەکان نییە، ئەوەیە تەنانەت ئەوانەی ئەمڕۆ لە

ولاتێکی وەک کوردستاندا خاوەنی بژێوییێکی مامناوەندین، لە ڕووی مادییەوە دۆخیان لە دۆخی هەندێک لە "دەوڵەمەند"ەکانی سالانی هەفتا و هەشتا باشترە. ئەگەر سی ساڵێک لەمەوبەر بوونی ڤیدیۆ لە ماڵێکدا هێما بوو بێت بۆ دەوڵەمەندیی ئەو ماڵە، ئێستا ئەو کەسەش کە توانایەکی ئابووریی مامناوەندی هەیە دەتوانێت ڤیدیۆ و تەلەفیزۆنی ساتالایت و مۆبایل و کۆمپیوتەریشی هەبێت. ئەمەش مانای ئەوەی ئەو کەسە لە ڕووی مادییەوە دۆخی وەک دۆخی هەندێک لە کەسە خاوەن پارە و داراکانی سی ساڵێک لەمەوپێشە، یان لانی کەم لە هەندێک ڕووەوە ئەو ئاستەی ژیانی ئەو سەردەمە دەژی، کەچی هاوکات هەستێکی بەهێزی بە هەژاری و نەداری و نەبوونیی تێدایە و خۆی وەک کەسێک وێنا دەکات کە لە ڕیزی دواوەی کۆمەڵگادا دانیشتوە و نرخێکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆی نییە. ئەم نموونەیە دەری دەخات مەسەلەکە تەنها بوونی شتومەکە مادییەکان نییە، بەڵکو ئەو دۆخی خۆبەراوردکردنەشە کە تیایدا کەسێک خۆی بەوانی تری دەوروبەری بەراورد دەکات، دروستبوونی ئەو هەست و وێنە و تێگەیشتنانەیە کە لەو بەراوردکارییەوە دروست دەبێت. ئەم توانای بەراوردکارییە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە دروستکردنی وێنەیەکی تایبەتدا بۆ خود خۆی و بۆ ئەوی تر و لەوێشەوە دروستکردن و هەستکردن بە بوونی شووناسێکی تایبەت. بە مانایەکی دیکە ئەگەرچی دۆخی ئابووری و توانای سەرفرکردنی بەشێکی زۆری کۆمەڵگای ئێمە زیادی کردوە، بەڵام هاوکات ئەم توانای سەرفکردنە هەستێکی گەورەی بە غەردی کۆمەڵایەتی و بە شووناسێکی بریندار لای ژمارەیەکی

زۆری کەسانی ناو ئەو کۆمەڵگایە دروست کردوە. لەم دۆخەدا بەرخۆری خۆی بووە بە بنەمای بەرهەمهێنەری جۆرێکی تایبەت لە شووناسی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی. کونەمان پێی وایە ئەو وێنەی فرانکفۆرتییەکان بەگشتی و ئەوەی هێربەرت مارکۆزە بەتایبەتی بۆ سیستمی سەرمایەدارییان هەیە وەک سیستمێکی بەرخۆر، کە گوایە سیستمێکە توانایەکی بێوێنە و بێسنووری ئاراستەکردن و شۆرینەوەی مێشک و دروستکردنی کەسایەتی و ئینسانی یەک مەودا هەیە، نەک تەنها موبالەغەیەکی گەورەیە، بەڵکو دیدێکی هێجگار سادەشە بۆ کۆمەڵگا هاوچەرخەکان. ئەم دیدە ئەو ئاڵۆزییانە و ئەو دەرەنجامە جیاوازانە نابینێت کە لە هەناوی ئەم کۆمەڵگایانەدا دروست دەبن.

ئەگەرچی من تێزەکەی کونەمانم زۆر بەکورتی و زۆر بەخێرایی نیشان دا و هەموو ئاڵۆزییە فیکری و تیۆرییەکانیم نەگواستۆتەوە، بەڵام ڕاستیی ئەم تێزە زیاتر لە ئاستی ئەو کارە سۆسیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژییە کۆنکریتانەدا دەر دەکەوێت کە لەسەر هەندێک کۆمەڵگا ئەنجام دراون. لێرەدا دەمەوێت هێما بۆ کارەکانی کۆمەڵناس و ئەنترۆپۆلۆژێکی چینی بکەم کە بەوردی لە کاریگەرییەکانی بەرخۆری لەسەر دروستبوونی گۆڕانی گەورە لە کولتوور و کۆمەڵگای چینی ئەمڕۆی کۆڵیوەتەوە. ئەم کۆمەڵناسە نیشانمان ئەدات بەرخۆریزم ڕۆڵێکی هێجگار سەرەکی و گرنگی بینیوە و دەبینێت لە کۆتاییهێنان بەو ڕۆحە دەستەجەمعییە خنکێنەر و بەزۆرسەپاوەی کۆمۆنیزم و خێزانی تەقلیدی لە چیندا دروستیان کردوە. ئەم کۆمەڵناسە بەوردی نیشانمان ئەدات

چۆن بەرخۆری توانیویەتی هەم ئینسانی چینی و هەم کۆمەڵگای چینی بە ئینسان و کۆمەڵگایەکی بەتاکەکەسبوو بگۆڕێت و لە زۆر ڕووەوە کۆتایی بەو ڕۆحە "ماویی"ە بهێنێت کە عەقڵیەتی ماو تسی تۆنگ و ئامرازی دەستی ئەو عەقڵیەتە، پارتی کۆمۆنیستی چین، بەسەر ئینسان و کۆمەڵگای چیندا ساڵانێکی درێژە سەپاندوویانە (Yan 2010).

لەم دیدگا تیورییەوە و بەبێ ئەوەی خاڵە نێگەتیڤەکانی بەرخۆریزمم لەیاد بچێت و بەبێ ئەوەی ئەوەشم لەیاد بچێت کە شێوازێکی تایبەتی دەسەڵاتداریتیی پڕ لە قەیران و هەوڵدان بۆ پاراستنی هەیمەنەی نوخبەیەکی سیاسی و جەردە ئەو دۆخی بەرخۆرییە پەرگیرەی لە کوردستاندا دروست کردوە، دەمەوێت لە لاپەڕەکانی داهاتوودا هەندێک لەو ئەگەر و دەرکەوتانەی بەرخۆریزم باس بکەم، کە لە ڕەوتی کۆمەڵگای ئێمەدا هەڵگری ئەگەری بەرپاکردنی گۆڕانکاریی پۆزەتیڤن. لەوانەش ئەگەری یارمەتیدانی ئینسانی ئێمە بۆ خۆدەربازکردن لە فشار و جەبرە پرووکێنەرەکانی خێزان و خێڵ و حیزب ودەربازبوون لە داواکارییە چەپێنەرەکانی ئەخلاقیاتی دینی و داخوازییە زۆرەکانی مۆراڵی ناسیۆنالیزم. بەکورتی دەمەوێت هێما بۆ ئەگەر و سەرەتاکانی لەدایکبوونی جۆرێک لە تاکگەرایی تەندروست بکەم، لەناو چوارچێوە کۆییە چەپێنەرەکانی کۆمەڵگا و خێزان و حیزب و مزگەوت و پێکهاتە دەستەجەمعییە چەپێنەرەکانی تری کۆمەڵگای ئێمەدا. بەڵام بەر لەوەی بێمە سەر باسکردنی ئەم مەسەلەیە، با کەمەکێک درێژتر لەسەر هەندێک ڕەهەندی نێگەتیڤ و ترسناکی بەرخۆریزم لە کوردستاندا بوەستم. چونکە

ئەگەر دروستبوونی جۆرێک لە تاکگەرایی تەندروست تەنها ئەگەرێکی ناو ئەو دونیایە بێت کە ئەمڕۆ لەدروستبووندایە، ئەوا ئەگەرەکانی تری بریتییە لە دروستبوونی خودێکی فووتێکراو و نابەرپرسیار و نارسیستی، کە هەموو پەیوەندییەکانی بە دونیاوە کورت کردبێتەوە بۆ پەیوەندیی کڕین و فرۆشتن و سوودوەرگرتن و بەکارهێنان. واتە لەدایکبوونی جۆرێک لە خودگەرایی فووتێکراو کە دونیا و دەوربەر و ئینسانەکان وەک سەحنەیەک بۆ دەرکەوتنی ئارەزووە تایبەت و فووتێکراوەکانی خود خۆی و بۆ تێرکردنی نارسیسمێکی ئاوساو ببینێت و مامەڵە بکات.

**ڕووکارە ترسناکەکانی بەرخۆریزم لە کوردستاندا**

گۆڕانی بەرخۆری لە کوردستاندا بۆ ئایدیۆلۆژیا، گۆڕانی لە بەرخۆرییەکی ئاسایی و ماقووڵەوە بۆ "بەرخۆریزم"، خاڵێکە پێویستە رامان بوەستێنێت. بەر لە هەموو شتێک ئەم گۆڕانکارییە لە ڕەوتێکی کۆمەڵایەتیی هێجگار نایەکسان و پڕ لە نادادپەروەری و بێمافیدا ڕوو دەدات. وەک نیشانمان دا هەندێک بەشی ئەو کۆمەڵگایە ئاستێکی ئەفسانەییی بەرخۆرییان هەیە و بەشی هەرەزۆری کۆمەڵگاش نوقمی ناو بەرخۆریی کاڵا هەرزان و خراپەکانن و هەندێک گرووپی تایبەتیش تەنانەت توانای بەرخۆریی ئەم کاڵا هەرزانەشیان هێجگار سنووردار و دیاریکراوە. ئەمەش بۆشاییەکی هێجگار گەورەی لەنێوان چینوتوێژە جیاوازەکانی کوردستاندا دروست کردوە و دروست دەکات. بە حوکمی ئەوەش نەخشەی

چینایەتیی کوردستان لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا نەخشەیەکی پڕقەیرانە و ئەوەندەی خراپبەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی دروستی کردوە، ئەوەندە گەشەکردنێکی سروشتی و یاسایی ململانێی کۆمەڵایەتی دروستی نەکردوە، بۆیە ئەو بۆشاییە کۆمەڵایەتییەی دروست بووە هاوکات بووە بە بۆشاییەکی سیاسی و ئەخلاقیی گەورە و کۆتایی هێناوە بە لانی هەرەکەمی هەر شێوازێکی متمانەی سیاسی بەو مۆدێلە دەسەڵاتدارێتییەی کە دروست کراوە. ئەم دۆخە نایەکسان و بێمتمانەیە لە سایەی بوونی بەرخۆری بە ئایدۆلۆژیا و کولتووری باڵادەست، وا دەکات چاوەڕوانی ئەوە بین ململانێی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەورە و کۆنترۆڵنەکراو دروست ببێت و ئەمەش کۆتایی بەو ئارامییە ڕێژەییە بهێنێت کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا هەیە و ئامادەیە.

لە کۆمەڵگایەکدا بەرخۆری چالاکیی هەرەسەرەکی بێت و بۆ ئاستی ئایدیۆلۆژیایەکی کۆمەڵایەتیی باڵادەستیش بەرز بووبێتەوە، واتە بووبێت بو کۆمەڵێک قەناعەت و باوەڕ و بەڵگەنەویستی قبووڵکراو، گەیشتبێتە ئەو ئاستەی لە ناوەوە عەقڵیەت و تێگەیشتنی گشتیی ئینسانی ئەو کۆمەڵگایەی دابڕێژێت و کاریگەریی گەورە لەسەر خولیا و ئارەزووەکانی بەجێ بهێڵێت و بڕێکی زۆر لە وەسوەسە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکانی ڕەنگڕێژ بکات، لە کۆمەڵگایەکی وادا دروستبوونی هەر ڕێگرێک لەبەردەم بەرخۆریدا، هەر دۆخێک وا بکات ئینسان نەتوانێت بەرخۆر بێت، دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو مانایەک لە ژیان بەکشتی و لە ئینسانبوون و لە پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی بەتایبەتی بسێنێتەوە. لە

کۆمەڵگایەکی لەو جۆرەدا شتەکان تا ئەو شوێنە مانایان هەیە کە بتوانن بەرخۆری مەیسەر و دەستەبەر بکەن، هەر شتێکیش ڕێگر بێت لەبەردەم بەرخۆریدا، وەک کردەی دەستریژیکردن بۆ سەر ئینسان و وەک کردەی بێماناکردنی ژیان دەر دەکەوێت. لە دۆخێکی لەو بابەتەدا، بۆ نموونە، دیاردەی بێئیشی بۆیە دەبێتە مایەی نارەزایەتی و توورەبوون، چونکە دەبێتە لەمپەر لەبەردەم بەرخۆریدا و ئینسانی بێئیش ناتوانێت ئینسانێکی بەرخۆر بێت، نەک لەبەر ئەوەی بوونی ئیش، یان ئیشکردن خۆی، بەشێک بێت لە بوونی ئینسانی و ئینسانی بێئیش بە هۆی نەبوونی ئیشەوە شتێک لە ئینسانیەتی خۆی دۆڕاندبێت. ئیش لێرەدا ئامرازێکە بۆ بەرخۆری، نەک چەمکێکی ئەخلاقیی گرنگ.

لە دۆخێکی لەو بابەتەدا کۆمەڵگا چیدی وەک کۆمەڵگا وێنا ناکرێت، بەڵکو وەک بازاڕێک وێنا دەکرێت کە هەموو کێبەرکێیەک تیادا لەپێناوی دەوڵەمەندبوونێکی خێرا و دەستبەجێدا ڕەوایە. بازاڕێکی نائازاد و ناڕێکخراو لە ڕێگای یاسا و بەهای ناوەکیی ئینسانی و عەقڵانییەوە، بەڵکو بازاڕێکی بێیاسا و بێبەهای ئەخلاقی، کە زیاتر ئاکاری جەنگەڵێکی هەبێت کە تیایدا کۆمەڵێک ڕاوچی بێڕەحم سەرجەمی جووڵە و وەستانەکانی ئەو بازاڕەیان لەژێر دەستدا بێت. لە ڕاستیدا خەونی دەوڵەمەندبوونی خێرا و خەونی خۆشگوزەرانی لەسەر بنەمای گەشەکردنی بەردەوامی توانای بەرخۆرییەکی نابەرپرسیار بووە بە بەشێک لە سایکۆلۆژیای گشتیی بەشێکی بەرچاوی کۆمەڵگای ئێمە. ئەمەش ڕەچەتەیەکی ترسناکە بۆ دروستکردنی دونیایەکی تەواو نائارام و پڕ ڕق

و بوغز و شەڕ و پێکدادان. ئەوەی مایەی تێڕامانە ئەوەیە کە گەورەبوونی عەقڵیەت و سایکۆلۆژیای بەرخۆری نەبۆتە هۆی پاڵنان بە ئینسانی ئێمەوە بۆ کارکردنی زیاتر، بۆ هەوڵدانی زۆرتر، بۆ عارەقڕشتنی زیاتر، چونکە ئابووریی نەوت و سیاسەتی ڕەیعی دۆخێکیان دروست کردوە کە بەرخۆریی ئینسانەکان پشت بە کارکردن نەبەستێت، بەڵکو پشت بە سەرفکردنی پارەی نەوت و بە چۆنیەتیی دابەشکردنی ئەو پارەیە ببەستێت. ڕێگاکانی دەوڵەمەندبوون و بەرزبوونەوەی ئاستی ژیان لە کوردستاندا کەمتر بە توانای کارکردن و بە بڕ و ڕادەی ماندووبوون و ئارەقڕشتنەوە بەستراوەتەوە و زیاتر بەو پەیوەندییانەوە گرێ دراوە کە لەنێوان سیاسەت و ئابووریدا دروست بوون. ئەم دۆخەش وای کردوە سیستمی ئابووری لە کوردستاندا بە هیچ مانایەک سیستمی بازاڕی ئازاد نەبێت، بەڵکو سیستمی بازاڕی کۆنترۆڵ و ئاراستەکراو و سیستمی سەرمایەداریی خزمان و دۆستان و ناسراوان بێت، سەرمایەدارییەک تیایدا ڕەوڕەوە ئابوورییە سەرەکییەکانی وڵات لە دەستی توێژێکی سیاسی و ئەمنی و سەربازی و بازرگانیی بچووکدا بێت.

بەرخۆری لەناو ئەم فەزا تایبەتەدا مەترسیی ئەوە دروست دەکات کە پەیوەندییە ئینسانییەکان بگۆڕێت بۆ پەیوەندیی شتومەکی و ئەو پەیوەندییانەش وا لێ بکات تا ئەو شوێنە نرخیان هەبێت کە پەیڕەوی لۆژیکی بەدەستهێنانی سوود و قازانج و دەسکەوتی تایبەتی بکەن، بە جۆرێک هەر پەیوەندییەک سوودێکی مادیی کۆنکریتی نەبێت، یان بەشێک نەبێت لە کردەی بەرزبوونەوەی بڕ و

ڕادەی بەرخۆری، ئیتر لاواز ببێت و شوێنی خۆی چۆڵ بکات بۆ ئەو پەیوەندییانەی کە لۆژیکی مادییانەی بەشتومەکبوون بەڕێوەیان دەبات. کورتبوونەوەی پەیوەندییە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەم جۆرە پەیوەندییە بازرگانییە جگە لەوەی کۆمەڵگا بۆ بازاڕێکی گەورە کورت دەکاتەوە، هاوکات هەموو قووڵاییەکی ئینسانی و ویژدانی و دەروونیی ڕاستەقینە لەو پەیوەندییانە دەسێنێتەوە. لێرەدا ئینسانەکان لەوە دەکەون ئینسان بن بە مانا هیومانییەکەی، بەڵکو دەبن بە کڕیار و فرۆشیار و لۆژیکی کڕین و فرۆشتن دەبێتە لۆژیکی باڵادەست. هەر لێرەشدا ئینتیما بۆ حیزب و بۆ گروپە سیاسییە ڕێکخراوەکان لە کوردستاندا، بەتایبەتی حیزب و گروپە خاوەن توانا و باڵادەستەکان، هێندەی پابەندی لۆژیکی بەدەستهێنانی ئەو دەسکەوتە مادییانەیە کە ئەو ئینتیمایە دەیبەخشێت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بەرخۆری، هێندە پابەندی هیچ هۆکارێکی دیکە نییە. لێرەوەیە: ئاوسانی گەورەی لەشی حیزبە باڵادەستەکانی کوردستان، هاوشانی ئاوسانی ئارەزوو و حەز و ویستی بەرخۆرییە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، هەردووکیشیان هاوشانی درستبوونی جۆرێک لە "منی فووتێکراو"ی بەرخۆرە، کە لە زۆر ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئێمەدا تێبینیی دروستبوون و گەورەبوونی دەکرێت. چەمکی "منی فووتێکراو"، یان "منی ئاوساو" چەمکێکە فەیلەسوفی هۆڵەندی: هاری کونەمان بەکاری دەهێنێت بۆ قسەکردن لەسە شێوازێکی هێجگار پەرگیر و نارسیستیی تاکگەرایی لە دونیای ئەمڕۆدا. ئەم پیاوە لە کتێبێکی گرنگدا بە ناوی: *کۆمەڵگای منی فووتێکراو*، باسی ئەو مەترسییانە دەکات

کـە دەشـێت لـە کۆمەڵگایەکـی لـەو بابەتـەدا دروسـت ببـن، مەترسیی تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئینسـانییەکان و جێگرتنەوەیـان بـە پەیوەندیی بێپەیوەنـدی و بێبـاک و بێئینتیمـای ڕاسـتەقینە (Kunneman 2009).

ئەوەی لێرەدا پێویستە لای خوێنەر ئاشکرا بێت ڕەخنەکردنی "منی فووتێکراو" مانای ڕەخنەکردنی "من" نییە، واتە ڕەخنەکردنی پرۆسەی تاکگەرایی ئاسایی نییە، بەڵکو ڕەخنەیە لەو شێوازە لە تاکگەرایی کە تیایدا ئینسان بووە بە تاکەکەسێکی نارسیسی نیمچەنەخۆش و نابەرپرسیار، بووە بە منێکی ئاوسا و فووتێکراو، کە نەک تەنها خۆی بە سێنتەری هەموو بوون دەزانێت، بەڵکو دەرەوەی خۆی، بە ئینسان و شتەکانی ناویەوە، وەک پانتاییەک بۆ بەرخۆری وێنا دەکات. دروستبوونی "من"ی ئاسایی و سەربەخۆ لەبەرامبەر شێوازە چەپێنەر و بێدەنگکەر و پرووکێنەرەکانی "ئێمە" کۆمەڵایەتییەکاندا، پرۆسە و گۆڕانێکی هێجگار گرنگ و تەندروستە، بەڵام "منی فووتێکراو" منێکە بێ هیچ مەعقوولیەتێکی کۆمەڵایەتی و ئینسانی، تیایدا جۆرێکی هێجگار نەخۆش و پەرگیری تاکگەرایی دروست دەبێت کە ئامادەیە پێ بەسەر هەموو پەیوەندییە ئینسانییەکاندا بنێت، ئیتر لە تێکدانی پەیوەندیی هاوڕێیەتییەوە بیگرە، بۆ تێکدانی پەیوەندیی خێزانی تا بە تێکدانی پەیوەدنییە سیاسی و کولتوورییەکانیش دەگات. ئەم جۆرە تاکگەراییە نەک تەنها تووشی نەزیف و عوسابی بەرخۆریی بووە، بەڵکو هەژارکردنێکی بێوێنە و بەفراوانی کەسایەتیی ئینسانییشی لێ دەکەوێتەوە، هەژارکەوتنێکی وجودیی قووڵیش لە ڕێگای پەراوێزخستنی پرسیاری ئەخلاقی و هەوڵدان بۆ خۆدورخستنەوە لە هەر ئەرکێک بکرێت بڕێک

ماندووبوون و زەحمەتی و ئازارچەشتن و قوربانیدانی پێویست بێت، تەنانەت گەر جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە مانایەکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزیی گەورەشی هەبێت (Kunneman 2009). لای هاری کونەمان "کۆمەڵگای منی فووتێکراو" دیاردەیەکی جیهانییە، تەنها لەم بەش یان ئەو بەشی دونیادا دروست نەبووە، بەڵکو لە بەش و پارچە جیاوزەکانی دونیادا دروست بووە و لە دروستبووندایە. بە بۆچوونی من ئەم شێوازە لە کۆمەڵگا و لە ئینسان لە کوردستاندا لە دۆخی دروستبوونێکی خێرادایە، یان لانی کەم وەک مۆدێلی ئینسان و کۆمەڵگای حەزلێکراو و خەونپێوەبینراو و بە ئایدیالکراو نیشان ئەدرێت.

وەک دەبینین ئەم گۆڕانانە گۆڕانی ترسناکن، تیایدا ئینسان لەپێناوی بەهێزکردن و قووڵکردنەوەی ڕەهەندی بەرخۆریدا، لە زۆربەی ڕەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکان دادەماڵرێت، جۆرێک لە "خودسازی" دێتە کایەوە کە تیایدا ئەو خودە، بۆ پاراستنی ئەو ئاستە لە بەرخۆری و بۆ پاراستنی ئەو شوێن و جێ کۆمەڵایەتییە کە ئاستێکی تایبەتی بەرخۆری دەستەبەر و مسۆگەر دەکات، ئامادەیە پشت بکاتە هەموو ئەو ڕەهەندانەی تری بوونی ئینسانی، کە ئینسان دەکەنە بوونەوەرێکی چالاک و بەرپرسیار و ئەخلاقیی ناو دونیای خۆی. ئەم شێوازە لە خودسازی وەفا لە ئینساندا دەکوژێت، دەیکاتە گەڕۆکێک بەدوای ژیانێکی سووک و پرچێژ و نابەرپرسیاردا، سەرقاڵی ئەوەی دەکات هەموو دەروبەرەکەی بە خۆی موعجیب بکات، بەبێ ئەوەی خۆی بە هیچ شتێک موعجیب بێت. ئەم شێوازە لە خودسازی هاوکات ڕەهەندی سیاسی لە ئینساندا بە شێوەیەکی ترسناک دەکوژێت و لەناو دەبات. لە کاتێکدا ئینسان کورت

دەکاتەوە بۆ تاکەکەسێکی بەرخۆر، هاوکات هەموو هەوڵێکیش حەڵاڵ ئەکات گەر بتوانێت ئاو بە ئاشی ئەو ماشێنە گەورەیەدا بکات کە بەرخۆری بەهێزتر و فراوانتر دەکات.

**بەرخۆریزم و پشێویی کۆمەڵایەتی**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا سێ ئاستی زۆر جیاوازی بەرخۆریم لە کوردستاندا لەیەکتری جیا کردەوە و وتم یەکەمیان ئاستێکی هێجگار بەرزی بەرخۆرییە کە لەسەر مۆدێلی بەرخۆریی شێخەکانی خەلیج و بۆرژوازییە دەوڵەمەندەکانی ئەوروپا و بنەماڵە مافیاییەکانی دونیا دامەزراوە. ئاستی دووهەمیان ئاستێکی مامناوەندی بەرخۆرییە کە لە ئاستی یەکەمیان نزمترە و ئاستی سێهەمیش ئاستێکی لاواز، بەڵام بەرفراوانی بەرخۆرییە و ڕووی لە بەکارهێنانی شتومەکی هەرزان و خراپە. ئەم سێ ئاستە جیاوازە هێما بۆ جۆرێک لە دابەشبوونی چینایەتی و کۆمەڵایەتیی هێجگار ترسناک و نایەکسان دەکەن. هێما بۆ دروستبوونی چەندان دونیا و چەندان گرووپی ناکۆک و بێپیوەندی و نامۆ و ناتەبا بەیەکتری دەکەن، بەڵام هەموویان لە یەک ڕووبەری کۆمەڵایەتی و جوگرافیی بچووکدا کۆ بوونەتەوە. گەورەبوونی ژمارەی دانیشتووان و گەنجبوونی ئەم دانیشتووانە بە خوێندەواربوونی بەردەوامی ئەو دۆخە نایەکسان و نالەبارە لە ئاستی مامناوەندی و دووردا قەیراناویتر و مەترسیدارتر دەکات. ناکۆکییەکان و جیاوازییەکان و هەستکردنەکان بە غەدر و چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی بە ئاستێک دەگەیەنێت گۆڕینی بەرخۆری بە ئایدیۆلۆژیا دەرەقەتی تەحەداکانی نەیەت و

دۆخێکی پڕ لـە تەقینـەوەی کۆمەڵایەتـی قابیلـی کۆنتـرۆڵ و ئاراستەنەکردن دێنێتە کایەوە. بەکورتی کردنی بەرخۆری بە ئایدیۆلۆژیا بۆ ڕاگرتنی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە ناهاوسەنگ و پڕ کێشە و ناڕێکی و قەیراناوییەیە، وەڵامێکی هێجگار هەڵە و پڕ مەترسیی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەورەیە بەو دۆخەی دروست کراوە.

ڕاستە بەرخـۆری تـا ئێسـتا توانیویەتـی ئـەو نەخشـە کۆمەڵایەتییە ناهاوسەنگەی لە کوردستاندا دروست بووە، بەبێ کێشەی زۆر گەورە بپارێزێت، خۆپیشاندانەکانی ساڵی پاری لێ دەرچێت، بەرخۆریزم لەوەدا سەرکەوتووە جۆرێک لە هێمنی و بێدەنگبوونی کۆمەڵایەتی بسەپێنێت، لێ نەگەڕێت ناڕازیبوونەکان بگەنە ئاستی تەقینەوەی بەرفراوان. بەرخۆری لەوەدا سەرکەوتووە وا بکات چەندان هێزی کۆمەڵایەتیی جیاواز بە دید و چاوەڕوانی و هەستکردنی ناکۆک و جیاوازەوە تا ئێستاش لەو کۆمەڵگایەدا بەبێ کێشەی زۆر گەورە لەپاڵ یەکدا ئامادە بن. ڕاستە ئەم دۆخە وای کردوە سەرەڕای ئەوەی بڕێکی زۆر لە ناڕازیبوونی کۆمەڵایەتی بەرامبەر بە سیاسەت و دەسەڵاتداران هەبێت، بەڵام نەتوانرێت ئەو ناڕازیبوونانە کۆ بکرێنەوە و بگۆڕدرێن بۆ بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیی بەهێزی وا داوای هەڵوەشاندنەوەی هاوکێشە کۆمەڵایەتییە نایەکسان و ناهاوسەنگە باڵادەستەکان بکەن. بە مانایەکی دیکە بەرخۆریزم وەک ئایدیۆلۆژیا تا ئێستاش توانیویەتی ببێت بە یەکێک لە پایە سەرەکییەکانی مانەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە کوردستاندا، سەرباری ئەو هەموو گەندەڵی و جەردەیی و ئاکارە خراپانەی تر کە دەسەڵات لە

کوردستاندا هەیەتی. دروستبوونی ئەو سێ شێوازە جیاوازەی بەرخۆریی کە باسم کرد، یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی بەردەوامی ئەو مۆدێلە سیاسی و ئەو شێوازی حوکمڕانییەی کە هەیە و دروست کراوە.

وەک وتم ئەو توانا تایبەتانەی بەرخۆری، دۆخێکی دروست کردوە تیایدا نەک تەنها سیستمە سیاسییەکە بتوانێت خۆی بپارێزێت، بەڵکو واشیان کردوە هاوکێشە کۆمەڵایەتییە ناهاوسەنگەکانیش توانای مانەوەیان هەبێت و بتوانن خۆیان بەرهەم بهێننەوە و بپارێزن. بەڵام پاراستنی ئەم هاوکێشە سیاسی و کۆمەڵایتییە ناهاوسەنگانە لە مەودای دووردا کارێکی هێجگار زەحمەتە، ئەگەر نەکردە و تەواو مەحاڵیش نەبێت. نەک تەنها لەبەر ئەوەی کە ئاست و ڕادەی بەرخۆری پابەستی نرخی نەوتە لە بازاڕەکانی جیهاندا و دابەزینی نرخی نەوت گۆڕانی گەورە و ڕیشەیی بەسەر ئاستەکانی بەرخۆریدا دەهێنێت و تا ڕادەیەکی زۆر ئاست و توانای بەرخۆری بێهێز و لاواز دەکات، بەتایبەتی ئاستی دووهەم و سێهەمی بەرخۆری، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە بەخۆری خۆشی وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی تایبەت میکانیزمی ناوەکیی خۆی هەیە. بۆ نموونە ئەوانەی ئەمڕۆ ڕازین و ئامادەن قۆناغە سەرەتاییەکانی بەرخۆریی خۆیان بە کڕین و بەکارهێنانی شتومەکە هەرزانەکان تێر بکەن، ئەوانەی ئەمڕۆ بە ئاستی بەرخۆریی بەشی خوارەوەی کۆمەڵگا ڕازین، سبەینێ چیتر بەم ئاستە نزمە ڕازی نابن. بەردەوامیی بەرخۆریی وەک کولتوور و وەک ئایدیۆلۆژیا کارێک دەکات لە ساتێکی دیاریکراودا بەرخۆریی هەرزان و

خراپ ئەوەندەی وەک ئیهانەکردن و بێنرخی و بێحورمەتی دەر بکەوێت، ئەوەندە وەک ئاستێک لە بەرخۆریی قبووڵکراو دەر نەکەوێت. چینوتوێژەکانی خوارەوە ناتوانن لەناو کولتوور و ئایدیۆلۆژیای بەرخۆریدا تا سەر بەو ئاستە ساکار و نزمەی بەرخۆری ڕازی بین. کەی بەرخۆری بوو بە کولتوور و بە ئایدیۆلۆژیای باڵادەست، واتە بوو بە بەشێکی گرنگ لە شووناس، ئیتر شێوازی بەرخۆریی چینەکانی سەرەوە دەبێت بە مۆدێل بۆ هەموو ئەو هێزانەی تر کە بەرخۆریی بەشێکی سەرەکیی شووناسیان دەستنیشان دەکات. ئەمەش مانای ئەوەی هەمووان هەمان ئەو شتانەیان دەوێت کە ئاستی سەرەوەی بەرخۆری مەیسەری دەکات و بەمەش ئەو نەخشە و ڕیزبەستنە کۆمەڵایەتییە تێک دەچێت و دەشێوێت کە بەرخۆری وەک وەڵامێک بە قەیرانەکانی پێشنیار کراوە.

بە مانایەکی تر بەرخۆری چەندە ببێتە دیاردەیەکی جەماوەریی بەرفراوان و چەندە ببێتە کولتوور و ئایدیۆلۆیا، ئەوەندە زیاتر دەبێتە بەشێکی گرنگی ژیانی تاکەکەسی و دەستەجەمعی، لە ڕاستیدا بەردەوامبوونی بەرخۆری وەک کولتوور و ئایدیۆلۆژیا لە قۆناغێکی دیاریکراودا لەوە دەر دەچێت تەنها کڕینی شتومەک بێت، بەڵکو وەک کۆمەڵناسێک دەڵێت، "دەبێت بە بەشێک لە شووناس". بۆیە ئەوەی کەسێک یان گروپێک هەست بە بێبەشبوون لە بەرخۆری بکات، یان هەست بکات هەژارە و ناتوانێت بەرخۆر بێت، هەستکردنەکەی تەنها لە سنووری هەستکردن بە نەبوونی شتومەکەکاندا نامێنێتەوە "بەڵکو دەبێتە (هەستکردن بە نەبوونی) ئەو شووناسەی کە ئەو شتومەکانە بە کەسەکانی

دەبەخشن" (Hayward 2004: 150). بە مانایەکی تر کەی بەرخۆری بوو بە بەشێکی گرنگ و قووڵی شووناس، ئیتر لەوە دەکەوێت تەنها لە هەبوونی شتومەکدا کورت ببێتەوە، بەڵکو دەبێت بە پێداویستییەکی سەرەکی، دەبێت بە شووناس و هەندێک جاریش گەشە دەکات بۆ ئەوەی ببێت بە ماف. لەم حاڵەدا کۆمەڵگا بە مافی خۆی دەزانێت بەرخۆر بێت، بۆیە دابیننەکردنی بەرخۆری، لەبەر هەر هۆکارێک بێت، دەبێتە سەرەتای قەیران و لێکترازانی کۆمەڵایەتیی گەورە و توندوتیژ.

بڕێکی زۆری ئەو لێکۆڵینەوە زانستییانەی لەسەر پەلاماردانی بازاڕ و مۆڵ و سێنتەرە گەورەکانی بازرگانی لە شاری لەندەندا لە ساڵی ٢٠١١ ئەنجام دراون، ئەوەیان سەلماندوە کە یەکێک لە پاڵنەرە هەرە سەرەکییەکانی پەلاماردان و سووتاندن و وێرانکردن و دزینی ئەو شوێنانە، باڵادەستیی کولتووری بەرخۆری خۆیەتی. لێکۆڵینەوە زانستییەکان نیشانیان داوە خەڵکە تووڕەکە پەلاماری ئەو دوکان و کۆگا و مۆڵ و شتومەکانەیان داوە کە ڕێک بە مەوقیعی کۆمەڵایەتی و بە ئاستە بەرزەکانی بەرخۆرییەوە گرێ دراون، ئەو شتومەکانەی هێما بۆ شووناس و شوێنگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرز لەناو کۆمەڵگادا دەکەن (Hall 2008: 58). لە ڕێگای دزینی ئەو شومەکانە و دواتر بەکارهێنانیانەوە، پەلاماردەرەکان دەیانەوێت بەشدار بن لەو ئاستەی بەرخۆریدا کە ئاستی بەرخۆریی هێزە دەوڵەمەندەکانی ناو کۆمەڵگان. لەم دۆخەدا بەرخۆری لەوە کەوتوە تەنها هەبوونی شتومەکەکان بێت، بەڵکو بووە بەو سیستمە ڕەمزییە باڵادەستەی کۆمەڵگا

بۆ ناساندنی خۆی و ناساندنی هێزە جیاوازەکانی ناوی دروستی کردوە. بەشدارینەکردن لەم سیستمە ڕەمزییەدا وەک بەشداریەنکردن لە ژیانی کۆمەلایەتی و وەک ئیهانە و سووکایەتییەکی گەورە و دەستدرێژیکردنێکی ڕاستەوخۆ بۆ سەر کەسایەتیی ئینسانەکان دەر دەکەوێت. لۆژیکی ئەو جۆرە ژینگانەی بەرخۆری تیایاندا بووە بە کولتوور و ئایدیۆلۆژیای بالادەست ئەوەیە، گەر بەرخۆر نەبیت ئینسان نیت، گەر بەرخۆرییت نەکرد پیادەی ئینسانیەتی خۆت ناکەیت، گەر نەتتوانیت شتومک بکڕیت و بەکار بهێنیت، درزێکی قووڵ لە ئینسانیەتدا دروست بووە. لەم دۆخانەدا بەشداریکردن لە بەرخۆریدا لەباتیی ئەوەی هۆکاری دروستکردنی ئاسایش و هێمنیی کۆمەلایەتی بێت، لە ئاستی دووردا، هۆکاری بەهێزی تێکچوونی هێمنی و وێرانبوونی ئاسایشی کۆمەلایەتییە. بەلام سەرەڕای هەموو ئەم ڕاستییانەی لە سەرەوە باسم کرد، ئەو ڕەهەندە نێگەتیڤ و ترسناکانەی بەرخۆری، کە نیشانم دان، هەموو حیکایەتەکانی بەرخۆری نییە، بەتایبەتی لە شوێنێکی وەک کوردستاندا، وەک پێشتریش وتم بەرخۆری هەڵگری هەندێک ڕەهەند و ئەگەری باش و پۆزەتیڤە. ئێستا با هەوڵ بدەین ئەو ڕووە پۆزەتیڤانە ببینین و لێک بدەینەوە.

### ڕووە پۆزەتیڤەکانی بەرخۆریزم

بڕ و ئاستێکی دیاریکراوی بەرخۆری دەشێت هێما بێت بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی ژیان بەگشتی و پێشکەوتنێکی کۆمەلایەتی تایبەت، دەشێت هێما بێت بۆ تێپەڕاندنی شێوازە خراپەکانی هەژاری و دروستبوونی جۆرێک لە

دەوڵەمەندبوونی کۆمەڵایەتی بەگشتی. هاوکات بەرخۆری دەشێت هێما بۆ ئەوە بکات کە بەختەوەریی تاکەکەسی بووبێتە خاڵێکی سەرەکیی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی، هێما بێت بۆ پێداگرتن لەسەر گەڕان بەدوای ئەو بەختەوەرییە تاکەکەسیەدا، گەرچی ئەم بەختەوەرییە زۆر جاریش کورت کرابێتەوە بۆ هەبوونی شتومەکی ماددیی کۆنکریت و بۆ بوونی توانای کڕین و سەرفکردن بەتەنها. هاوکات دەشێت ڕۆحیەتی بەرخۆریی گرێدراو بێت بە چەمکی مافی تاکەکەسی و مافی دەستەجەمعییەوە، واتە دەکرێت داوای دابینکردنی ئاستێکی دیاریکراوی بەرخۆریی وەک دابینکردنی هەندێک مافی ئینسانی و کۆمەڵایەتی ببینرێت. هاوکات ڕۆحیەتی دەشێت هەندێک فەزا و شوێن و ڕووبەری کۆمەڵایەتییش دروست بکات کە ببنە مایەی دروستبوونی پەیوەندیی کراوەتر و ئینسانیتر لەنێوان تاکەکەسەکاندا بەگشتی و لەنێوان نێر و مێ و نەوە جیاوزەکاندا بەتایبەتی. ئەمەش، بۆ نموونە، لە ڕەوتی کۆمەڵگایەکی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا ببێتە هۆکارێک لەو هۆکارانەی کە ڕووبەر و فەزا عیلمانییەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایە گەورەتر و فراوانتر بکات.

ئاشکرایە گەورەبوونی دیاردەی بەرخۆری لە دونیای ئێمەدا هاوشانە بە دیاردەی دروستبوونی شاری گەورە، شارێک تاکەکەس تیایدا بتوانێت ون ببێت و نەناسرێتەوە، ببێتە شوێنی بەرهەمهێنانی "نەناسینەوە"، بەئینگلیزی "ئانۆمی." نەناسینەوە بە زۆر مانا، لە سەرێکەوە نەناسینەوەی تاکەکەسەکان بۆ یەکتری، بە هۆی گەورەبوونی شار و گەورەبوونی ژمارەی دانیشتووانەوە، بەڵام هاوکات بە هۆی

نەناسینەوە و لاوازبوونی بەها و نۆرمە ئەخلاقی و کولتوورییە بالادەستەکان. نەناسینەوە بە مانا دۆرکهایمییەکەی، واتە ئەو دۆخە کە تیایدا ئەخلاقیات و بەها و نۆرمی بالادەست لە قەیرانی گەورەدان و چیدی شتگەلێک نین بەشێکی زۆری تاکەکەس و گروپەکان ڕێزی بگرن، بەلام هاوکات نەبوونی ئەخلاقیات و بەها و نۆرمی ئەلتەرناتیڤی جێگیر و پتەو، بەکورتی ئەو دۆخی نەناسینەوەیە کە تاکەکەس تیایدا نازانێت چ جۆرە هەلسوکەوتێک هەلسوکەوتی ڕاستەقینەیە و دەبێت پەیڕەوی چ جۆرە ڕستێک و یاسا و بەها و نرخی کۆمەلایەتی بکات. لای دۆرکهایم ئەم دۆخە دۆخی پارچەپارچەبوونی شووناس و لاوازبوونی پەیوەندیی توندوتۆلی ئامێزانبوونی کۆمەلایەتییە، ئەوەی لە دۆخێکی لەم شێوەیەدا تاکەکەس و گروپەکان باوەڕیان پێیەتی و لە ژیانی خۆیاندا ئەنجامی ئەدەن، تەواو ناکۆکە بەوەی لە ئاستی گشتیی کۆمەلگادا وەک نۆرم و ئەخلاقی بالادەست دەخوات (Rowman & Littlefield, 1993). بە بۆچوونی من ئەمڕۆ ئەم دۆخە ئەخلاقییە دۆخی بالادەستە لە کوردستاندا، گەورەبوونی شارەکانی کوردستان و دروستبوونی ڕووبەری تازەی پێکەوەبوونی کۆمەلایەتیی تاکەکان لەگەل یەکدا، دۆخێکی دروست کردوە ناکۆکییەکی گەورە دروست ببێت لەنێوان ئەوەی ئەو کەسانە بە نهێنی یان بە نیمچە ئاشکرایی دەیکەن و ئەنجامی ئەدەن، لەگەل ئەو سیستەمە ئەخلاقی و بەهایی و ویژدانییەدا کە وەک سیستەمی ڕەسمی و بالادەست لە کۆمەلگادا ئامادەیە. ئەم ناکۆکییە لە هەموو شوێنێکدا بەرچاوە، لە پەیوەندییە سێکسییەکانەوە بیگرە بۆ پەیوەندییە سیاسییەکان، بە تێپەڕین بەناو بەشێکی

زۆری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تردا.

پێم وایە ئەمە یەکەمین جارە کۆمەڵگای ئێمە شار بەو مانایە ئەزموون دەکات کە واڵتەر بنیامین بە شاری ئەدات. شار نەک تەنها وەک شوێنی شتومەک و کەلوپەلی زۆر و بێشومار، وەک فەزایەکی گەورەی پڕ بازاڕ و کۆگای فرەجۆر و فرەڕەنگ، بەڵکو وەک شوێنی دروستبوونی ئەو گەڕۆکانەش کە بەپاڵ ئەم گشتە گەورەیە لە دوکان و بازاڕ و شتومەکدا تێدەپەڕن و سەرسامانە تەماشای قەرەباڵغییەکانی دونیای دەوروبەریان دەکەن، بەلام بێ ئەوەی ئەو قەرەباڵغییە ئەوان ببینن و بێ ئەوەی ئەوانیش ئەو قەرەباڵغییە ببینن. بنیامین ئەم کەسانە بە دەستەواژەی Flâneur ناو دەبات، فلانور وەک گەڕۆکێکی بەردەوامی بێمەبەست بەناو شاردا. بنیامین بەم کەسە، کە بەبێ هیچ مەبەستێکی دیاریکراو بەناو دوکان و بازاڕ و مۆڵ و کۆگاکاندا دەسووڕێتەوە و لە ڕێگای تەماشاکردنەوە ئەزموونی ئەو فەزا تازانە دەکات، ئاکاری سەرەکییشی بەرهەمهێنانی ئەزموونێکی تایبەت و گۆشەنیگایەکی تایبەتە بۆ تەماشاکردن، بەمەش دوورکەوتنەوە و لادان لە مانا و ئەخلاقیاتە بالادەستەکان (Savage, 2000)..

ئەم فەزا تازەیە کە بەرخۆری لە کۆمەڵگای ئێمەدا دروستی کردوە بەبێ بەجێهێشتنی کاریگەریی گەورە و بەرچاو لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و لەسەر پەیوەندیی ئینسان بە خۆی و بە دەوروبەرەکەیەوە تێناپەڕێت. ئەمڕۆ شارەکانی کوردستان سەرلەنوێ دروست دەبنەوە، شارێک لەناو دەچێت و شارێکی تر جێگەکەی

دەگرێتـەوە، مـن لێـرەدا قسـەم لەسـەر بێزەوقـی و پشـێویی ئیسـتاتیکی و دابەشـکرنی ناعەقڵانیـی ڕووبەرەکانـی نـاو ئـەو شـارانە نییـە، هـاوکات بـاس لـە دڵنەسـووتان بـە زەوق و ئیسـتاتیکای نەوەکانـی ڕابـردوو ناکـەم، کـە لەگـەڵ ڕووخاندنـی کەرتـە کۆنەکانـی شـاردا ئەوانیـش دەڕووخێنرێـن و لەنـاو دەبرێن، واتـە قسـەم لەسـەر وێرانکردنـی ڕابـردوو و کەلەپوور و شـوێنپەنجەی دێرینـی نەوەکانـی بـەر لـە ئێمـە نییـە بەسـەر ئـەو شـارانەوە، ئەمانـە هەموویـان دیاردەی هێجگار نێگەتیڤ و ترسـناکن و هەندێکیشـیان دەچنـە خانـەی تاوانـەوە. ئـەوەی مـن دەمەوێـت لەسـەری بوەسـتم ئەوەیـە کـە دروسـتبوونی ئـەم شـارە تازانـە لەسـەر سـڕینەوەی شـارەکانی ڕابـردوو، لەگـەڵ خۆیاندا دیاردە و تەحـەدا و گرفـت و مژدەی نـوێ دەهێنن. لـەم شـارانەدا ڕووە چینایەتییە نایەکسـانەکانی کۆمەڵگای ئێمـە زیـاد لـە هەمـوو کات ئاشـکراتر دەر دەکەوێـت و بەرجەسـتە دەبێـت، شـوێنی نـوێ دروسـت دەبێـت بـە مانـای نوێـوە، جوگرافیـای ڕادیکاڵـی توڕەبوون و چێژ و لـەزەت دروسـت دەبێت، فـەزای دیـن و خواپەرسـتیی نـوێ و جوگرافیـای دانیشـتن و پشـوودان و حەسـانەوەی تـازە دروسـت دەبێـت. فەزایەکـی تایبەتـی تەلارسـازی و ئابـووری و مەدەنـی دروسـت دەبێـت کـە هێمـا بـۆ ڕیزبەسـتنی کۆمەڵایەتیـی نـوێ و جێگۆڕکێکـی چینایەتیـی بەرچـاو و دروسـتبوونی تاکەکەسـی نـوێ دەکات، تاکەکەسـێک دەکرێـت هـەم بـە مانـا دۆرکهایمییەکـەی "نەناسـین" یـان بـە مانـا "گـەڕۆک" واتـە فلانورەکـەی واڵتـەر بنیامین ببینیـن و لـە جووڵـە و کـردە کۆمەڵاییەتـی و کولتـووری و تاکەکەسـییەکانی تێبگەیـن.

گومانم لەوە نییە لەناو ئەم فەزا تازەیەدا ئەزموونی ئینسانی نوێ و زمانی نوێ و خەونی نوێ و تێکشکان و نەهامەتیی نوێ دروست دەبێت. لەگەڵ دروستبوونی شاری نوێدا لە شوێنی شارە کۆنەکان، پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نوێ و توێژی کۆمەڵایەتیی نوێ و ئەخلاقیاتی کۆمەڵایەتیی نوێ و خەون و پەژارەی نوێ دروست و پەروەردە ئەبێت. گومانم لەوە نییە کە تێکەڵبوونی نایاسایی و بەدڕەوشتانەی سیاسەت و سەرمایە و نەخوێندەواری و بێپلانیی هێزە باڵادەسەکانی کوردستان کێشەی گەورە و هەمەلایەن لەم فەزا تازانەدا بۆ ئینسان و کۆمەڵگای ئێمە دروست دەکەن، بەڵام هاوکات گومانم لەوەش نییە ئەم دۆخە کۆمەڵێک ئەگەری تازە دەخاتە بەردەم ئینسانی ئێمە بۆ ئەوەی ڕووبەری هەڵبژاردنەکانی گەورەتر و فراوانتر بکاتەوە و پەیوەندییەکی نوێ، نەک تەنها لەگەڵ کولتوور و ئەخلاق و بەها و نۆرمە باڵادەستەکاندا دروست بکات، بەڵام لەگەڵ خۆی و حەز و ئارەزووەکانیشیدا. بێگومان ئەم دۆخە نوێیە کۆمەڵێک فشار و پاڵەپەستۆی نوێش دروست دەکات، لە فشار و پاڵەپەستۆی گواستنەوە و ماندبوونی جەستەیی و دەروونییەوە بیگرە، بۆ فشاری پیسبوونی ژینگە و زیادبوونی بڕ و ڕادەی توندوتیژی و دزی و بێکاری و هتد... هەموو ئەم گۆڕانانە لە دەیەی داهاتوودا پێداویستیی کۆمەڵگای ئێمە بە سۆسیۆلۆژیای شار و سۆسیۆلۆژیای تازەبوونەوە و بەو بەشەی فیکر و مەعریفە زیاد دەکات کە بە "ئوربانیزم" واتە بە پرۆسەی بەشاربوون، ناو دەبرێت و پێداویستییش بە زانیاری و مەعریفەیەک کە شار و ژیانی شار وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و مەدەنی و فەرهەنگی و ئینسانیی نوێ، زۆر زیاتر دەکات.

وەک وتم ئاستێکی تایبەتی کولتووریی بەرخۆری هێمایە بۆ گرنگیدانێکی زیاتر و تایبەت بە چێژ و لەزەت و ئارەزووەکان و دەشێت هێما بێت بۆ تازەبوونەوەی زەوق و حەز و چێژی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی. وەک نووسەرێک دەنووسێت ئەوەی گرنگە ئاگامان لێ بێت ئەوەیە بە سووک و ئاسانی کەسی بەرخۆر کورت نەکەینەوە بۆ ئینسانێکی "بێمێشکی ناو کۆمەڵگایەکی جەماوەری". (Yan 2010: 209). کردەیەک کە ئەمڕۆ کۆمەڵێک ڕۆشنبیر و خوێندەوار بە ناوی فیکر و فەلسەفە و پرسیاری نەمرەوە و دەیکەن و ئەنجامی ئەدەن. وازهێنان لەو جۆرە قسە گشتگیر و ناکۆنکریت و نامێژووییانە سەرەتای بەرهەمهێنانی زانیارییەکی قابیلی باوەڕپێکردنە لەسەر ئەو کۆمەڵگایەی ئینسانی ئێمە تیایدا دەژی. ئێستا ئیتر لەم دیدە تایبەتەوە هەوڵ ئەدەم لە لاپەڕەکانی داهاتوودا ڕووکارە پۆزەتیڤەکانی دیاردەی بەرخۆری لە کوردستاندا لە پەیوەندیدا بە هەندێک لە دەرکەوتە بەهێز و باڵادەستەکانی دونیای ئێمەوە بخوێنمەوە و نیشانی بدەم چۆن بەرخۆری دەشێت ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ لە تازەکردنەوەی هەندێک ڕەهەندی سیاسی و دینی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی دونیای ئێمەدا ببینێت.

### مۆراڵی بەرخۆریزم و مۆراڵی ناسیۆنالیزم

ناسیۆنالیزم وەک ئایدیۆلۆژیا و وەک بزووتنەوەی سیاسی، بەتایبەتی ناسیۆنالیزمێک ڕووکارە مەدەنی و دیموکراسییەکانی لاواز بێت، بەردەوام پێ لەسەر کۆمەڵێک بەها و نرخی تایبەت دادەگرێت کە ئینسان و کۆمەڵگا بە ئاقاری تەقەشوفگەرایی

و زوهـدی سیاسـی و بەهێزکردنـی ڕۆحـی قوربانیـدان و فراوانکردنـی ڕووبـەری ئینکارکردنی خـود لـە پێناوی مەبەسـتە نەتەوەیی و نیشـتیمانییەکاندا دادەگرێت. ناسـیۆنالیزم هەمیشـە پێ لەسـەر ئـەوە دادەگرێت کـە مەسـەلەیەک هەیـە گەورەتـرە لـە تاکەکـەس، نـرخ و بەهاکـەی بەرزتـر و گرانبەهاتـرە لـە ژیانـی تاکـەکان. بۆیـە داوا لـە تاکەکـەس دەکات بـێ دوودڵـی ژیانی خۆی بخاتـە ژێر دەسـتی پێداویسـتییەکانی ئـەو مەسـەلە گشـتییەوە. هـاوکات ناسـیۆنالیزم مـژدەی جۆرێـک لـە نەمـری ئـەدات کـە لـە دەرەوەی ژیانـی تاکەکەسـیدایە، نەمرییـەک لـە دڵـی میللـەت و لـە ویژدانـی مێژووییدا. بەکورتـی ناسـیۆنالیزم سڵ لـەوە ناکاتـەوە بەئاسـانی تـا ئـەو شـوێنە بـڕوات داوای گیانفیدایـی و قوربانیدانـی بـەردەوام بـە ژیانـی تاکەکەسـەکان بکات لەپێنـاوی مانـەوە و پاراسـتن و ڕزگارکردنـی داواکارییـە هەمەجۆرەکانـی ناسـیۆنالیزمدا. لەڕاسـتیدا ناسـیۆنالیزم تەنهـا ئایدیۆلۆژیـاک نییـە ئـەم داواکارییانـەی هەیـە، هەمـوو ئایدیۆلۆژییـە گەورەکانی دونیـای ئەمڕۆ ئـەم داوایەیـان هەیـە، هـەم سۆسـیالیزم و هـەم لیبرالیـزم و هـەم ئیسـلامیزمیش داوای ئەمـە دەکـەن، بـەڵام هەریەکەیـان بـە شـێوازی جیـاواز و لەپێنـاوی مەسـەلەی دەسـتەجەمعیی جیـاوازدا. لێرەدا مـەودای ئـەوەم نییـە بەدرێژی لەسـەر ئـەم مەسـەلانە بوەسـتم، ئـەوەی دەمەوێـت جەغتـی لـێ بکـەم، ئـەو ڕاسـتییەیە کـە ناسـیۆنالیزم ڕەهەندێکـی دەسـتەجەمعیی هێجـگار بەهێـزی هەیـە کـە تیایـدا تاکەکس دەکرێتـە خزمەتکاری مەسـەلە گشـتییەکان، تـا ئاسـتی قوربانیـدان بـە ژیانـی ئـەو تاکەکەسـە لەپێنـاوی ئـەو مەسـەلە

گشتییانەدا. ناسیۆنالیزم داوای ئەوە دەکات تاکەکەس ژیانی خۆی بخاتە خزمەتی ژیانی نەتەوەوە، کە زۆر جار لە ڕووی کردەگی، واتە عەمەلییەوە، مانای ئەوەی ژیانی خۆی بخاتە خزمەتی ئەو سەرکردە و هێز و لایانانەوە کە بە ناوی نەتەوەوە قسە دەکەن و بە ناوی نوێنەرایەتیکردنی نەتەوەوە ئەدوێن. ئەدەبیاتی سیاسی و ئەخلاقی و ئەدەبیی ئێمە پڕە لە دەرکەوتە جیاوازەکانی ئەم ئەخلاقیاتە ناسیۆنالیستیە.

لەم گۆشەنیگایەوە بەرخۆریزم ئایدیۆلۆژیایەکە تەواو ناکۆک بە ناسیۆنالیزم، یەکەی هەرە سەرەکی و بەردی بناغەی بەرخۆریزم وەک ئایدیۆلۆژیا تاکەکەسە، نەک بوونی دەستەجەمعی و کۆیی، ئینسانە وەک تاکەکەس، نەک وەک ئەندامی گروپێکی دینی و ئەتنی و کۆمەڵایەتیی دیاریکراو. ئەم تاکەکەسەش کەسێکە دەتوانێت و حەز و ئارەزووی تایبەتیی هەبێت و دەشیەوێت بەدەم داخوازییەکانی ئەم حەز و ئارەزووانەوە بچێت، هاوکات بەدیهێنانی ئەم حەز و ئارەزووانە وەک مەسەلەی سەرەکیی ژیانی خۆی وێنا بکات. لە کاتێکدا ناسیۆنالیزم داوای تەقەشوف دەکات، بەرخۆریزم دژ بە تەقەشوفە، ناسیۆنالیزم داوای قوربانیدان بە حەز و ئارەزووە کەسییەکان دەکات، بەرخۆریزم داوا دەکات ئەو حەز و ئارەزووانە لەژێر هیچ بەهانەیکدا دوا نەخرێن، ناسیۆنالیزم داوای خۆشویستنی نەتەوە و داخوازییە نەتەوەییە گشتییەکان دەکات، بەرخۆریزم داوای خۆشویستنی خود و خۆشویستنی ژیانی تاکەکەسی و بەدەمەوەچوونی حەز و ئارەزووەکانی ئەو ژیانە تاکەکەسییە دەکات. ناسیۆنالیزم داوای تاکەکەسێک

دەکات کە خۆی وەک یەکەیەکی بچووکی ناو گشتێکی گەورە ببینێت و ئەو گشتەش لە خۆی و لە ئارەزووەکانی خۆی بە گرنگتر بزانێت، بەڵام بەرخۆریزم ئەو تاکەکەسە دەکاتە سێنتەری ژیان خۆی و وەک گەردوونێکی قابیلی نەگۆڕینەوە و پارچەپارچەنەکردن وێنای دەکات. ناسیۆنالیزم داوای بەپاڵەوانبوون و بەقارەمانبوون لە تاکەکەس دەکات لەپێناوی نەتەوە یان داخوازییەکی نەتەوەییدا، بەڵام بەرخۆریزم هەر لە بنەڕەتەوە بە دەستەواژەکانی قارەمان و پاڵەوان لەسەر ئینسان قسە ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەرخۆریزم ئینسان وەک بوونەوەرێکی خاوەن حەز و ئارەزوو و چێژ وێنا دەکات و جیاوازی ئەم یان ئەو ئینسانیش بە جیاوازیی ڕووبەر و شێواز و ڕەنگی حەز و ئارەزووەکانیدا دەناسێتەوە. لە کاتێکدا ناسیۆنالیزم بەردەوام داوا لە ئینسان دەکات چاوی لەسەر خۆی بێت، خۆی خۆی کۆنترۆڵ و دیسپلین بکات، ڕۆحی فیداییبوون لە خۆیدا بچێنێت و گەورە بکات، ئامادە بێت لەپێناوی نەتەوەدا پشت بکاتە خۆی، بەرخۆریزم داوا لە ئینسان دەکات تەماشای دونیا بکات، بچێتە ناو بازاڕەکانەوە، بکڕێت و بخوات و چێژ ببینێت و کۆنترۆڵی حەز و ئارەزووەکانی نەکات، بەڵکو تێرکردنیان بکاتە مەسەلەی سەرەکیی ژیانی خۆی. لە بەرخۆریزمدا ئینسان دەبێتە بوونەوەرێک حەز و ئارەزووەکانی دوا ناخات، واتە حەزی ئەمڕۆی ناخاتە سبەی، ئارەزووەکانی ئەمڕۆ لە ئێستا و لێرەدا تێر دەکات، قوربانی بە حەزە تایبەتەکانی نادات لەپێناوی حەزە گشتییەکاندا. لە بەرخۆریزمدا ئینسان

باوەشێکی توند بەم ساتەوەختە و بە شتەکانی ناو ئەم ساتەوەختەدا دەکات. لە دەرەوەی ژیانی تایبەتیی تاکەکەس و لە دەرەوەی حەز و ئارەزووەکانی تاکەکەسدا مەسەلەیەکی گەورەتر و گرنگتر نابینێت. بەکورتی بەرخۆریزم داوای ئەوە دەکات ئینسان ژیانی خۆی نەخاتە ژێر ڕەحمەت و سێبەری هیچ ئایدیۆلۆژیایەکەوە کە داوای تەقەشوف و دواخستن و کۆنترۆڵ و پەراوێزخستنی خواست و حەز و ئارەزووەکان لە ئینسان بکات. وەک دەبینین ناسیۆنالیزم و بەرخۆریزم دوو جۆری تەواو جیاواز لە خودسازی و خۆدروستکردن و خۆداهێنانی ئینسانی پێشنیار دەکەن، کە کۆکردنەوەیان بەیەکەوە زەحمەتە.

ئەو خاڵەی دەمەوێت لێرەدا جەغتی لێ بکەم ئەوەیە کە بەرخۆری دەتوانێت وەک ڕێگرێک لەبەردەم مۆراڵی ئاوساو و فووتێکراوی ناسیۆنالیزمدا بوەستێت و ببێتە یەکێک لەو پەناگایانەی تاکەکەس بتوانێت تیایدا بەرگری لەخۆی و لە ویست و حەز و ئارەزووەکانی بکات. ئەگەر ئەخلاقی ناسیۆنالیزم بەردەوام داوای مردن و گیننفیدایی لە ئینسان بکات، کارێکی خراپ نییە جۆرێکی تر لە ئەخلاقیات دروست ببێت، کە نەک تەنها ئەو داوایانە نەکات، بەڵکو سنوورێکیش بۆ ئەو داوایانە دابنێت، ئەخلاقیاتێک ئەوە وەبیری ئینسان بهێنێتەوە کە پێویستە بتوانێت تاکەکەسبوونی خۆی بژی و ڕێزی حەز و ئارەزووە شەخسییەکانی خۆی بگرێت. خاڵێکی تر کە دەکرێت لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە کە بەگژاچوونەوەی ڕەهەندە نێگەتیڤەکانی بەرخۆریزم، ئەو

ڕەهەندانەی بە درێژاییی ئەم نووسینە تیشکمان خستە سەر، بە گەڕانەوە بۆ ئەخلاق و مۆراڵی ناسیۆنالیزم نابێت، بەوە نابێت تاکەکەس پەراوێز بخرێت و بەبێ مەرج داوای قوربانی و گیانفیدایی و خۆنەویستیی لێ بکرێت. بەرەنگاربوونەوەی ڕووە خراپەکانی ئەخلاقیاتی بەرخۆریزم لە ڕێگای گەڕاندنەوە بۆ ئەخلاقیاتی پڕووکێنەری گروپگەرا، گەڕانەوەیەکی ترسناکە بەرەو دواوە. دەرچوون لە داواکاری و فشار و خواستی نادیموکراسی و پاتریارکییانەی سەرجەمی ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی دونیای ئێمە، یەکێکە لە پێداویستییە هەرە سەرەکییەکانی داهێنانی جۆرێکی نوێ لە ئەخلاقیات و جۆرێکی نوێی بەتاکەکەسبوون. دەشێت بەرخۆری ببێتە هۆکارێک بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی نوێ بۆ دروستکردنی شێوازێکی نوێ لە "من" کە بوێرێت تەماشای خۆی و ئارەزوو و حەزەکانی بکات و بشوێرێت لەبەردەم ئەخلاقی باڵادەست و ئەخلاقی ئایدیۆلۆژیا گەورەکاندا بڵێت نا. بەڵام هاوکات منێک کە مشوورخواردنی بۆ خۆی بەشێک بێت لە مشوورخواردنی بۆ ژیانی گشتی و کارکردنی لەسەر خودی خۆی کارکردن بێت لەسەر دەوڵەمەندکردن و فراوانکردنی ژیانی گشتی. بە بۆچوونی من بەرخۆری ناتوانێت ئەم جۆرە خودە دروست بکات، بەڵام دەتوانێت لانی کەم وەک لەمپەرێکی گرنگ لەبەردەم مۆراڵی پڕووکێنەری ناسیۆنالیزمدا بوەستێت و سنوورێک بۆ داخوازییە زۆرەکانی دابنێت.

**بەرخۆریزم و مۆراڵی دینی**

شێوازەی هەرە دیار و باڵادەستی دین لە کوردستاندا، دینێکە لەسەر ترساندنی ئینسان کار دەکات، ترساندنی بە ئاگری جەهەنەم و ئەشکەنجەدانێکی گەورە و بێوێنە بە دڵڕەقیی خودا بەرامبەر بە "بێباوەڕەکان". ئەم شێوازە لە دین ئینسانی ئێمە وەک بوونەوەرێکی بچووک و ژیان خۆشی وەک سەفەرێکی کورت و بێنرخ نمایش دەکات. زوهدی دینی، بە شێوازی جیاواز، بەشێکە لە زۆربەی دەرکەوتەکانی دین لە کوردستاندا، زوهدێک داوای ژیانێکی پڕ تەقەشوف و دەستپێوەگر لە ئینسان دەکات. لەبەرامبەر پیادەکردنی ئەم جۆرە ژیانەدا و وەک پاداشتیش بەرامبەر گوێڕایەڵی بۆ ئەم ئەخلاقە دینییە، دین مژدەی ژیانێکی جاویدانەی پڕ چێژ و لەزەت لە بەهەشتدا بە ئینسان دەبەخشێت. بە زمانی بەرخۆری بدوێم: ئەم شێوازە لە دین دژ بە بەخۆریی سەرزەمینی و لە قازانجی بەرخۆریی ئاسمانی کار دەکات، بەرخۆری نەفی ناکات، بەڵکو داوای دەخات بۆ ڕۆژی دوای ڕۆژی لێپرسینەوە و حیساب. کە ئەمە دەڵێم هاوکات دەبێت ئەوەمان لەیاد بێت کە ئەم ئەخلاقیاتە دینییە باڵادەستە لە کوردستاندا خۆی جۆرێکی تایبەت لە بەرخۆریی دروست کردوە، کە هاریکاری ئەم تێگەیشتنە بۆ دین ئەکات، بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی وەک داڕێژەری ئەخلاقیاتی باڵادەست بەرهەم بهێنێتەوە، لەوانەش کڕین و پۆشینی جلوبەرگی دینی، کۆمەککردن و هاندانی سەفەر و سیاحەتی دینی، گوێگرتن لە مۆسیقا و ئامۆژگاری و وتاری دینی، بڵاوکردنەوەی کتێب و ئەدەبیاتی دینی هتد... ئەوەی بەرخۆریزم بە شێوەیەکی گشتی

ئەنجامی ئەدات پێشنیارکردنی ئەخلاقیاتێکی ترە ناکۆک بەم ئەخلاقیاتە دینییە، ئەخلاقیاتێک لەسەر چێژوەرگرتنێکی گەورە لە ژیانی دونیا و لەو ساڵە کەمانە دروست بووە، کە ئینسان لەسەر ئەم ئەستێرەیە پیایاندا تێدەپەڕێت. بەرخۆری لە ڕێگای دروستکردن و گەورەکردنی ڕووبەری عەلمانیانەی نادینییەوە، واتە لە ڕێگای دروستکردنی شوێنی پشوودان و سەیران و کەیف و سەفا و یاریکردن و کۆبوونەوەوە، دونیایەکی تەریب بەو دونیا دینییە دروست دەکات کە ئامادەیە. ڕەنگە باشترین نموونەیەک بکرێت لێرەدا باسی بکەین: دروستبوونی ژیانی شەوانە لە بەشێکی زۆری شارە گەورە و مامناوەندییەکانی کوردستاندا. بە درێژایی ساڵانێکی درێژ کۆمەڵگای ئێمە یەکێک لەو کۆمەڵگایانە بووە کە ژیانی شەوی تێدا نەبووە، یان زۆر لاواز بووە. لە سەردەمی حوکمڕانیی بەعسدا و بە هۆی نائارامیی دۆخی سیاسییەوە، ئینسانی ئێمە فێری ئەوە ببوو هەر لەدوای خۆرئاوابوونەوە بخزێنە ناو ماڵەکانیان و بۆ کاری زۆر گرنگ و بەناچاری نەبووایە، بە شەودا ئەو ماڵانە بەجێ نەهێڵن. ئەمە بەشێک بوو لە ئاکاری دەستەجەمعیی بەشێکی هێجگار گەورەی کۆمەڵگای ئێمە. شتێکی قابیلی باسکردن بە ناوی ژیانی شەوەوە بوونی نەبوو. بەڵام ئەمڕۆ بەشێکی زۆری بازاڕە گەورەکان و مۆڵەکان بوونەتە شوێنگەلێک خەڵکان لە شەودا سەریان لێ ئەدەن و تیایاندا کۆ دەبنەوە و دەجووڵێن. ئەمڕۆکە لە شارە گەورەکانی کوردستاندا شەوانە خەڵکانێکی زۆر لە ماڵەکانی خۆیان دێنە دەرەوە و دەڕژێنە ناو ئەو مۆڵ و بازاڕە تازانەوە کە دروست کراون، هاتنەدەرەوەی ئافرەتان لە ماڵ و چوونیان

بۆ ئەو شوێنانە دیاردەیەکی بەرچاو و ئاشکرایە. ئەم دۆخە شێوازێکی نوێی ژیانی پێکەوەیی و خێزانی و جۆرێکی تازەی دەرکەوتنی ئینسانی ئێمەی لە فەزای گشتیدا مەیسەر کردوە. بە مانایەکی دیکە ئەو فەزا بەرخۆرییەی کە دروست بووە وای کردوە کۆمەڵگای ئێمە، بەتایبەتی ئافرەتانی ئەو کۆمەڵگایە، کە بە شێوەیەکی بەرفراوان و ڕەها بێبەش بوون لە ژیانی شەو، بکەونە ناو دونیایەکی تازەوە کە تیایدا مەجالی جوولە و دەرکەوتنیان لە فەزای گشتیدا زیاد و فرەجۆر بووە. ئێستا زووە دەرەنجامە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی ئەم دیاردە تازانە بزانین، بەڵام یەک شت ئاشکرایە، کە ئەم گۆڕانە نەک تەنها دژ بە مۆراڵی دینی تەقلیدی و مۆراڵی پاتریارکیەتە، بەڵکو فراوانبوونێکی بەرچاوی ڕووبەر و جوگرافییای عەلمانیانەیە لە دونیای ئێمەدا.

### مۆراڵی بەرخۆریزم و دروستبوونی شوێنی گشتیی نوێ

ئەوەی ئەمڕۆ شارە گەورەکانی کوردستان ببینێت بوونی چەندان شوێنی تایبەت بۆ دانیشتن و پشوودان دەبینێت. چەندان گازینۆ و چاخانە و قاوەخانە و شوێنی تر هەن کە فەزایەک بۆ پشوودان و یەکتربینین دەڕەخسێنن. بە شێوەیەکی گشتی دیاردەی پشوودان بەشێکی گرنگی کردەی بەرخۆرییە، ئەوەی لە شوێنێکدا پشوو ئەدات، پشوودانەکەی هاوشانە بە ئەنجامدانی هەندێک کاری بەرخۆرییانە. یەکێک لە ماناکانی بوونی ئەم شوێنانە ئەوەیە کە خەڵک کاتی ئازادی هەیە، کاتێک دەتوانێت لەو شوێنانەدا بەسەریان

بەرێت. وەکو شوێنی پشوودان، بوونی کاتی ئازادیش بۆ بەسەربردن، بەشێکی گرنگی دونیای بەرخۆرییە، بوونی کات بۆ چوون بۆ بازاڕەکان، بۆ شتکڕین، بۆ سووڕانەوە لەناو مۆڵەکاندا، بۆ تەماشاکردنی جامخانەکان، هتد... دەرکەوتێکی گرنگی بەرخۆرییە. بە حوکمی ئەوەی کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەکی بەرهەمهێن نییە و لێوانلێوە لە بێئیشیی داپۆشراو، بۆیە دۆزینەوەی کات بۆ بەرخۆریی مەسەلەیەکی زەحمەت نییە، ئەوەی تا ماوەیەک لەمەوپێش زەحمەت بوو بوونی شوێنی ماقوڵ بوو بۆ پشوودان. یەکێک لە ئاکارە تازەکانی ئەمڕۆکەی شارەکانی کوردستان دروستکردنی شوێنە بۆ ئەو کاتە ئازاد و بۆ ئەو کردەی بەرخۆرییەی لە بوونی ئەو کاتە ئازادەوە دروست دەبێت.

بەم جۆرە دروستکردنی شوێنی تایبەت بۆ پشوودان و کاتبەسەربردن، دروستکردنی شوێنی گشتی بۆ یەکدیبینین و گفتوگۆ، بوونەتە پیشەسازییەکی گەورە لە کوردستاندا. ئەم شوێنە گشتییانە فرەجۆرن و بۆ هەریەکێکیشیان خەڵکی جیاواز دەچێت. ئەو شوێنانەی کەس و خێزان و گروپە دەوڵەمەندەکانی بۆ دەچێت، جیا بوونەتەوە لەو شوێنانەی کەسانی کەمدەرامەت و دەرامەت مامناوەندەکانی بۆ دەچێت. ئەوەی گەنجان ڕووی تێ دەکەن جیا بۆتەوە لەوەی کە بەتەمەنان بۆی دەچن، شوێنی هونەرمەندان و نووسەران و ڕۆشنبیران جیا بۆتەوە لە شوێنی گروپەکانی تر. بەڵام ئەوەی ئاکاری هەموو ئەم شوێنانە بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە بەرخۆرییە، دروستبوونی ئەم ڕووبەرە گشتییە جیاوازانە

بەشێکی گرنگی ئەم دونیا بەرخۆرەیە کە دروست بووە.

ئەم شوێنانەش هەم وەک ئەگەرێک لەبەردەم دروستبوونی تاکگەراییدا ئامادەن، هەم هانیشی ئەدەن. لە ڕاستییشدا گەورەبوونی ئەم پیشەسازیی پشوودانە بە پلەی یەکەم رووی لە تاکەکەسە، تاکەکەسێک بیەوێت پشوو بدات و پارە سەرف بکات. ئەم شوێنانە کەمتر ئەو ڕۆحە دەستەجەمعییە هان ئەدەن کە لە چاخانە تەقلیدییەکانی جاراندا هەبوو. لە چاخانەی تەقلیدیدا سنووری نێوان کەسەکان دیار نییە، یان لاوازە، نزیکی کورسییەکان لەیەکەوە کەسەکان بەیەکتری تێکەڵ دەکەن، ژمارەیەکی زۆری لە ئامادەبووان دەتوانن لەپاڵ یەکدا و لەگەڵ یەکدا دانیشن، بەڵام لەم شوێنە گشتییە نوێیانەدا سنوورەکان ئاشکران، شوێنەکان لەیەکتری جیا کراونەتەوە، ئینسانەکان دەتوانن جۆرێک لە تایبەتکاریی خۆیان هەبێت. ئەم شوێنانە زۆر جار بە جۆرێک دروست کراون لە دوو کەس یان لە باشترین دۆخدا لە چوار کەس زیاتر پێکەوە نەتوانن بەیەکەوە دابنیشن. واتە تاکبوون و تاکگەرایی بەشێکی گرنگی تەلارسازی و ڕێکخستن و دیکۆری ناوەکیی ئەو شوێنانەیە. ئەوانەش کە دەچنە ئەو شوێنانە نەهاتوون بۆ یاریکردن لەگەڵ یەکدا، بەڵکو زۆر جار بۆ یەکتربینین و قسەکردن و گفتگۆکردن هاتوون. وەک وتم ئەم جۆرە پێکەوەبوونە کۆمەڵایەتییە کەمتر دەستەجەمعی و ڕێکخراوە و زۆرتر تاکەکەسی و نارێکخراوە، تەنها ئەوانە تیایدا بەشدار دەبن کە یەکتری دەبینن و دەدوێنن. ئەم جۆرە یەکدیبینین و پێکەوەبوون و دواندنە، یەکدیبینین و پێکەوەبوونێکی تایبەتی

ناو شوێنێکی گشتییە، واتە پێکەوەبوونەکان جۆرێک لە ئاشکرایی ئاراستەیان دەکات، بەبێ ئەوەی ئەو ئاشکراییە سنووری پێکەوەبوونە تایبەتەکان تێپەڕێنێت و بەیەکتریان تێکەڵ بکات. لۆژیکی ئەم شوێنە گشتییە تازانە لۆژیکی هاندان و بەرگریکردن و بەرفراوانکردنی دیاردەی تاکگەرایی و تایبەتبوونە. ڕاستە ئەم لۆژیکە لۆژیکێکی بازرگانییە و قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایە ئاراستەی دەکات، بەڵام هاوکات بەخشینی ڕووبەرێکی گشتییشە بە پێکەوەبوونی تایبەت، بە چێژ و زەوقی تایبەت، بە ئارەزووی تایبەت، بەکورتی بەتاکەکەس. یەکێک لە دیاردە هەرە بەرچاوەکانی دروستبوونی ئەم فەزا تایبەتە بریتییە لە ئامادەگیی ئافرەت لەناویدا. لەم ڕووبەرە تایبەتانەدا، نێر و مێ ئاسنتر بەیەک دەگەن و ئاسانتر دەتوانن سنوورێکی تا ڕادەیەک پارێزراو بەدەوری خۆیاندا بکێشن. ئەگەر لە شەقام و گۆڕەپانە گشتییەکاندا ڕۆحی دەستەجەمعی بەسەر کردەی پێکەوەبوونی نێر و مێ لە دونیای ئێمەدا زاڵ بێت، ئەوا لەم شوێنە تازانەدا ڕۆحی تاکایەتی و تاکگەرایی باڵادەستە.

بەکورتی ئەم شوێنە گشتییە تازانە مەودای دروستبوونی جۆرێکی نوێی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی دەڕەخسێنن جیاواز لە شوێن و ڕووبەرە تەقلیدییەکانی یەکتربینین و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی لە دونیای ئێمەدا. لەم شوێنە تازانەدا ئەوەی لە ئامێز دەگیرێت بەختەوەریی تاکەکەسییە، کە لە زۆر ڕووەوە دژ بەو مۆراڵ و ئەخلاقە دەستەجەمعییەیە کە ئایین و ناسیۆنالیزم و پاتریارکییەت لە دونیای ئێمەدا سەپاندوویانە.

هاوکات دەرچوونیشە لەو ڕۆحی تەقەشوف و دەستپێوەگرتنی هەم ناسیۆنالیزم و هەم دین و هەم ئەخلاقیاتی سوننەتی لە کۆمەڵگای ئێمەدا داوای دەکەن. لە زۆر ڕووەوە ئەم شوێنە تازانە بڕ و ڕادەی ئازادیی تاکەکەسییش زیاد دەکەن و مەودای بەیەکگەیشتن و یەکدیبینین و گفتوگۆ و ڕاگۆڕکێ زیاد دەکەن. پرسیار ئەوەیە ئایا ئەم پشوودان و ئازادییە تاکەکەسییە کە بەرخۆری دەیبەخشێت، دەتوانێت لە مەودای دووردا ببێتە سەرەتایەک بۆ لەدایکبوونی وشیارییەکی نوێ تیایدا تاکەکەس خۆی وەک بوونێکی سەربەخۆ و ئازاد و بەختەوەری و دابینکردنی ئارەزووەکانی ئەو تاکەکەسە خۆشی، پایە سەرەکییەکانی ئەو وشیارییە بن، ئایا ئەم وشیارییە دەتوانێت بپەڕێتەوە بۆ ئاستەکان و ڕووبەرەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی؟ یانی ئەم جۆرە لە وشیاری بچێتە ناو تێگەیشتنەوە بۆ سیاسەت، بۆ دین، بۆ پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی هتد...؟ پێم وایە یەکێک لە تەحەدا گەورەکانی ساڵانی داهاتوو وەڵامدانەوەی کۆمەڵگای ئێمەیە بەم پرسیارانە.

**مۆراڵی بەرخۆریزم و گۆڕانی ماناکانی پیاوەتی**

یەکێک لەو بوارانەی کە دەشێت بەرخۆری کاریگەرییەکی گرنگی لەسەر بەجێ بهێڵێت، بواری پیاوەتییە، مەبەستم بواری تێگەیشتنی کۆمەڵگای ئێمەیە بۆ ماناکانی پیاوبوون و پیاوەتی. بە شێوەیەکی گشتی کە باس لە بەرخۆری دەکرێت ڕاستەوخۆ وێنەی بەرخۆریی ئافرەتان دێتە بەرچاو

و چالاکی بەرخۆری وەک چالاکییەکی ژنانە، یان چالاکی ژنان وێنا دەکرێت، بە شێوەیەک وەک ئەوەی بەرخۆری بە شێوەیەکی سەرەکی ڕووی لە ئافرەتان بێت، یان بازاڕی بەرخۆری بە پلەی یەکەم بازاڕی ژنان بێت. وردبوونەوە لە چالاکیی بەرخۆری لە کۆمەڵگای ئێمە و دەرەوەی ئێمەشدا ئەوەمان بۆ دەر دەخات ئەم دیدە تەواو ناڕاستە. ئەمڕۆ بەشێکی گەورە و گرنگی بەرخۆری ڕووی لە پیاوانە، بازاڕی بەرخۆری پیاوانە بازاڕێکی گەورەیە، ئیتر لە دەیان جۆر و مارکەی بۆیاخی قژ و سمێڵەوە بیگرە، بۆ بازاڕی جل و جوانپۆشی، بۆ بازاڕی بۆن و گەنجدەرکەوتن و قۆزبوون و ناسکدەرکەوتن و سەرنجڕاکێشی هتد... ئەمە جگە لە بازاڕی سەیارە و خواردنەوە و چەک و سەفەر و سیاحەت، کە بە پلەی یەکەم بازاڕێکی پیاوانەن. ئەو ئاستی بازاڕەی من لێرەدا باسی دەکەم ئاستی یەکەمیانە، واتە ئەو ئاستەیە کە پەیوەندیی بە دەرکەوتنی وێنە جەستەییەکانی پیاوەتییەوە هەیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا. بە بۆچوونی من لەم ئاستەدا کۆمەڵێک وێنەی نوێ بۆ پیاوەتی لە دروستبووندایە کە ناکۆک بەوە نەگونجاون لەگەڵ ئەو وێنە تەقلیدی و باڵادەستانەی پیاوەتیدا کە ئەخلاقیاتی تەقلیدی و دین و ناسیۆنالیزم بۆ پیاوەتییان هەیە.

ناسیۆنالیزم وێنەیەک بۆ پیاوبوون دروست دەکات کە وێنەی پاڵەوانێکی نادونیایی و لەخۆبوردووە، کە ئامادەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجە نەتەوەییەکان خۆی بەکوشت بدات، پیاوێکی سادە و بێتەماحی دونیایی، مامناوەندی لە هەموو

بوارەکاندا، لە جنس و چێژەوە بیگرە، بۆ قسە و گوفتار و ڕەفتار، جلوبەرگ و سەروڕوخساریشی بە جۆرێک نمایش دەکات بەرجەستەکەری خۆشویستنی نیشتیمان و ڕۆحی پاڵەوانێتی و قوربانیدانی نەتەوایەتی بێت. ئەم جۆرە پیاوەتییە لەگەڵ پیاوەتییەک گرنگییەکی گەورە بە چێژ و تێرکردنی ئارەزووەکان دەدات، ناگونجێت. لە کتێبێکی هێجگار گرنگیدا، کۆمەڵناسی ئەڵمانی: جۆرج مۆسەدا، بەوردی لەو دۆخی تەقەشوفە جنسییە ئەدوێت کە ناسیۆنالیزم و سێکس بەیەکدییەوە گرێ ئەدات. ناسیۆنالیزم یەکێکە لەو ئایدۆلۆژییانە کە سێکس، وەک سیمبۆلی حەزکردن لە ژیان و ئامادەگی بۆ چێژوەرگرتن، کورت دەکاتەوە بۆ کردەی دروستکردنی ئەو منالانەی کە دەواتر دەبێت پاڵەوانانە بەرگری لەنەتەوە بکەن، پیاوانێکی تەندروست و بەهێز کە لەباتی عاشقی هەر شتێکی تر بن، عاشقی نەتەوەن (Mosse 1988). ئەو وێنەی ناسیۆنالیزم بۆ پیاوەتی دروستی دەکات، هیچی ئەوتۆی لەو وێنەیە جیاواز نییە کە دین بۆ پیاوەتی دروستی دەکات، بەتایبەتی دینێکی سیاسی کە وەک ناسیۆنالیزم لە هەوڵی دروستکردنی کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا بێت، کە تیایدا دین سەرچاوە سەرەکییەکانی ژیان بێت. ئەو وێنە دینیانەی ئەمڕۆکە شێوازە جیاوازەکانی ئیسلامی سیاسی و سەلەفییەتی دینی بە فەزای گشتیدا بڵاوی دەکەنەوە وێنەی پیاوەتییەکی خەمبار و تووڕە و ناودنیاییە. دیارترین دەرکەوتی پیاوەتییەکی ڕیشدارە، ڕیشی درێژ یان کورت بەپێی بڕ و ڕادەی دینداری و ئاراستە سیاسییە

دینییەکە دەگۆڕێت، بە جلێکی نائامادە و سەرنجڕانەکێشەوە. بە شێوەیەکی گشتی پیاوەتییەکی چلکن، کە تەماشات کرد ئەو خاڵەت لا بچەسپێت ئەم کەسە هەم دینییە و هەم لەپێناوی قیامەتدا دەستی لە دونیا شتووە، یان لانی کەم کەسێکە دونیای ئەمڕۆی بە قیامەتی بەیانی گۆڕیوەتەوە.

بە بۆچوونی من ئەو شێوازە تازانەی پیاوەتی کە ئەمڕۆ لەپاڵ بەرخۆریدا دروست دەبن، شێوازێک کە گرنگییەکی هێجگار گەورە بە لەش و بە دەرکەوتەکانی لەش لە فەزای گشتیدا ئەدات، لە زۆر ڕووەوە ناکۆکە بەم دوو وێنە باڵادەستەی پیاوەتی لە دونیای ئێمەدا.

ئەو نرخەی بەرخۆری ئەمڕۆکە بە پیاوەتی ئەدات، نرخێکە لەپاڵ بەهاکانی قۆزبوون و گەنجبوون و ناسکبوون و سەرنجڕاکێشبووندا بەرجەستەیە، پیاوەتییەک ئەو مەرجانەی تێدا نەبێت، وەک پیاوەتی مامەڵە ناکرێت، یان لانی کەم وەک پیاوەتییەکی تەقلیدیی دواکەوتوو نمیاش دەکرێت. بەرخۆریی بەهاکانی قۆزبوون و ناسکبوون و گەنجبوون و سەرنجڕاکێشبوونی کردوە بە بەهای گرنگ و بە ڕووبەرێکی هێجگار گەورەی جوگرافیای کۆمەڵایەتی ئێمەدا بڵاوی کردۆتەوە. ئەو نرخەی ئەمڕۆ بە نمایشکردنی لەشێکی پیاوانەی ناسک و سەرنجڕاکێش ئەدرێت، لە سەردەمەکانی تری کۆمەڵگای ئێمەدا ئامادە نەبووە. مەبەستم لە نمایشکردنی ئەم لەشەش نمایشکردنیەتی وەک لەشێکی گەنج، جوان، ناسک، سەرنجڕاکێش و جنسی. لەڕاستیدا ئەم گرنگیدانە بە نمایشکردنی جەستە و ئەم گرنگیدانە بە ڕووکاری دەرەوەی

ئینسـان، چ لای ژن چ لای پیاو، خەریکە وەک عوسـابی لێ دێت، عوسـابێک لـە سـەرێکەوە ژیانـی ئینسـان بـە ڕادەیەکی گـەورە ڕووکـەش دەکات، بـەلاَم هـاوکات هەسـتکردن بـە جەسـتە و گرنگیدان بـە دەرکەوتنی لەنـاو فـەزای گشـتیدا بەهێز و گرنگ دەکات (Featherstone 1991).

وەک وتم ئـەم دۆخـە تازەیـە مانـا و شـێوازی نوێی پیاوەتی دروسـت و بلاَو دەکاتـەوە و دەشـیانخاتە پەیوەندییەکی نوێوە بـە شـێوازی نماییشـکردن و دەرخسـتنی جەسـتەوە لـە فـەزای گشـتیی کۆمەڵگادا. بـۆ نموونـە ئەمڕۆکـە بەشـێکی بەرچـاوی گەنجـان لـە ڕێگـای سـتایلێکی تایبەتـی قژبڕیـن و جلوبەرگـەوە خۆیان نماییش دەکـەن، زۆر جیاواز لـەوەی پازدە یـان بیست سـاڵێک لەمەوبـەر ئامـادە بـوو، ئەمـڕۆ شـێوازەکانی قژبڕیـن تـەواو فرەجـۆرن و لـە گەنجێکەوە بـۆ گەنجێکی تـر دەگۆڕێت، واتـە ئـەو دۆخـی لێکچوونـەی سـالاَنی پێشـووی بەجـێ هێشـتوە و فرەجـۆر بـووە. بەشـێکی زۆری ئـەم فرەجۆرییەش پێ لەسـەر شووناسـی تاکەکەسـی هەریەکێـک لـەو گەنجانـە دادەگرێـت وەک کەسـایەتیی جیـاواز و خـاوەن شووناسـی جیـاواز. ئەمـە جگـە لـە پەنابردنـی ژمارەیەکـی تـا دێـت زۆرتـر لـە پیـاوان بـۆ "پیشەسـازیی جوانسـازی و گەنجسـازی." زۆربوونـی ژمـارەی ئەوانـەی کـە سـمێڵ و ڕیشـیان ئەتاشـن و بۆنـی فرەشـێوە بـەکار دەهێنـن و دەسـتکاریی قەبـارە و درێـژی و کورتـی لووتیـان دەکـەن و شـێوەی دەموپلیـان دەسـکاری دەکـەن و دەگـۆڕن، تـا دێـت ڕوو لـە زیادبوونـە. ئەمـەش زۆر ناکۆکـە بـە وێنـە تەقلیدییەکانـی پیاوەتـی، یـان بـەو وێنـە سـەلەفییە

دینییـەی پیاوەتـی، کـە تێکەڵێکـی سـەرنجڕاکێشـە لـە چڵکنـی و پشتگوێخسـتنی لـەش و ناشـیرینکردنی ڕوخسـار لـە ڕێـگای ڕیشهێشـتنەوەیەکی ناڕێکەوە. ئەگـەر ئـەوەی باسـم کرد دۆخـی بەشـێک لـە پیاوانـی گەنـج بێـت، ئـەوا پیاوانـی بەسـاڵاچوو دەسـتەیەک نیـن لـە دەرەوەی ئـەم پیشەسـازییە نوێیـەدا بـن. ئـەم دەسـتەیەش لـە پیـاوان لـە ڕێـگای بۆیاخکردنـی قـژ و سمێڵ و پۆشـینی جلوبەرگـی تایبەتـەوە دەیانەوێت گەنجبوون و چوسـتوچالاکبوونی خۆیـان نیشـان بـدەن. بەکورتـی بەرخـۆری دۆخێکـی دروسـت کـردوە خەریکـە وا دەکات لـەش، وەک ئانتۆنـی گیدنـز ئەڵێـت، ببێـت بـە "پـرۆژە" و وەک پـرۆژەش لەلایـەن تاکەکەسـەوە ببینرێـت (Giddns 1991). هەمـوو ئـەم شـتانە وا دەکات جەسـتە چیـدی تەنهـا لـە مانـا بایۆلۆژییەکەیدا کـورت نەبێتـەوە، مانـا کۆمەڵایەتـی و ڕەمـزی و تاکەکەسییەکانیشـی لەپاڵ بازاڕێکـی گـەورەی نمایشـکردنی جەسـتەدا گـەورە ببـن و گرنگییەکـی زۆر پەیدا بکـەن. جەسـتە وردە وردە ببێتـە دروسـتکراوێکی کۆمەڵایەتـی و کولتووریـی گرنـگ و ببێتـە یەکێـک لـە ئامرازە سـەرەکییەکانی تەعبیرکردنـی ئینسـان لـە خـۆی و لـە حـەز و ئارەزووەکانـی، تەنانـەت لـە وشـیاری و تێڕوانینەکانیشـی. ئەمـەش بـە بۆچوونـی مـن دەشـێت سـەرەتایەک بێت بۆ دروستبوونی گۆڕان لە ماناکانی پیاوەتیدا و هـاوکات تەحەدایەکی گـەورەش بێت بە ڕووی مانا باڵادەسـتەکانی پیاوەتیـی تەقلیدیـدا. ئـەم گۆڕانـە لـە ماناکانـی پیاوەتیدا سـەیر نییـە، چونکـە چەمکی پیاوەتـی چەمکێکی بگۆڕە و بەپێـی سـەردەمە مێژووییـە جیاوازەکان دەرکەوتـی جیـاواز

و ناوەرۆکی جیاواز دەگرێتە خۆی (Connel 1995).

بە بۆچوونی من ئەمڕۆ دۆخێک لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەدروستبووندایە کە تیایدا شێوازە جیاوازەکانی پیاوەتی چیدی تەنها لە ڕێگای خۆبەراوردکردن و چوونە پەیوەندییەوە لەگەڵ ژنبووندا دروست نابن، بەڵکو لەپاڵ خۆبەراوردکردن و ململانێی نێوان شێوازە جیاوازەکانی پیاوەتی خۆشییەوە دروست دەبێت. چۆن شێوازە جیاوازەکانی پیاوەتی خۆیان ڕیز دەکەنەوە و کام هەرەمیەتی نوێ دروست دەکەن، واتە کام شێوازی پیاوەتی دەبێتە پیاوەتیی خاوەن هەیمەنە و کامیان دەگۆڕێن بۆ پیاوەتیی لاواز و لاوەکی، ئەمەیان پرسیارێکی کراوەیە، بەلام لە هەموو دۆخەکاندا بەرخۆری، بێگومان لەپاڵ زۆر هۆکاری تردا، دەشێت ڕۆڵێکی گرنگ ببینێت لە بەلاداخستنی ئەم ململانێیەدا. لەم ئاستەشدا گرەوی سەرەکیی کۆمەڵگای ئێمە لەوەدایە تا چەند دەتوانێت کراوە بێت بە ڕووی ئەو شێوازە جیاواز و هەندێک جار ناکۆکانەی پیاوەتیدا بەیەکتری. بەکورتی ئەوەی کە دەشێت لە ئایندەدا چاوەڕوان بین ڕوو بدات ململانێ و بەریەککەوتنی زیاتری شێوە جیاوازەکانی پیاوەتییە لەسەر "هەیمەنە" لە کۆمەڵگای ئێمەدا. پرسیارەکە ئەوەیە ئەم ململانێییە بە کوێ دەگات و کام شێوازی پیاوەتی دەبێتە شێوازی بالادەست؟ ئایا ئەو شێوازە نەرمەی پیاوەتی کە لای زۆرێک لە گەنجان، لەپاڵ جلوبەرگی نوێ و قژبڕینی تایبەت و بێسمێڵی و هێمنییەوە دروست دەبێت و گرنگیدان بە لەش تیایدا خاڵێکی هێجگار گرنگە، بالادەست دەبێت، یاخود جۆرە تەقلیدییەکانی

پیاوەتی باڵادەستیی خۆیان دەپارێزن کە پیاوەتییەکە لەسەر فەرامۆشکردنی لەش و توورەبوون و بەرزڕاگرتنی بەهاکانی قارەمانێتی و گیانفیدایی و پشتکردنە دونیا کار دەکەن؟

**دەرەنجام**

بوونی بەرخۆری بە ئایدیۆلۆژیا کۆتایی قۆناغێکی گرنگە لە مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئێمەدا، دەتوانم پێی دابگرم و بڵێم ئەمڕۆ شێوازێکی نوێی "خودسازی" لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەدروستبووندایە، خودسازییەک بە پلەی یەکەم دەست و پەنجەکانی دەسەڵات لە ڕێگای بەرخۆرییەوە ئاراستەی دەکات، بەڵام بێگومان ناتوانێت هەموو دەرەنجامەکانی کۆنترۆڵ بکات. ئێمە لە فەیلەسوفی فەرەنسی میشێل فوکۆوە ئەو ڕاستییە فێر بووین کە دەسەڵات سیاسەتێکی تایبەت لە بەتاکەکەسبوون مەیسەر دەکات، جۆرێکی تایبەت لە کردە و گوتاری "خودسازی" دەسەپێنێت.

پرۆسەی بەرهەمهێنانی ئەم خودە بەرخۆرە یەکێکە لە ئامرازە هەرەسەرەکییەکانی ئەو مۆدێلەی لە دەسەڵات کە ئەمڕۆ باڵادەستە، دروستکردنی ئەم خودەش بەشێکە لە ستراتیژی بەگژاچوونەوەی ئەو قەیرانە گەورانەی کە ڕووبەڕوویان بووەتەوە. بەرپرسە پێشمەرگەکانی شاخ کە دواتر بوونە سەرمایەدارە گەورەکانی وڵات، ئەوانەی کە وەک دەڵێن لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا بە پێڵاوی لاستیکەوە گەڕانەوە شارەکان ئەمڕۆ هەندێکیان بوونەتە خاوەنی فڕۆکەی شەخسیی خۆیان، ئەمانە ئەو هێزەن کە لە پشتی

ستراتیژە فراوانەکانی بەرخۆرییەوەن لە کوردستاندا. وەک لەم نووسینەدا نیشانم دا ئەم ستراتیژە دەتوانێت کاریگەریی زۆر نێگەتیڤ و خراپ لەسەر تاکەکەس و کۆمەڵگای ئێمە جێ بهێڵێت، دەیەوێت دونیای ڕۆحیی ئینسانی ئێمە بە ڕادەیەکی ترسناک بچووک و بەرتەسک بکاتەوە، ڕەهەندی سیاسی لەم ئینسانەدا بچووک یان تەواو وێران بکات، بە ڕادەیەک وا لەم ئینسانە بکات لە لووتی خۆی دوورتر و لە گیرفنی خۆی دوورتر نەڕوانێت. بەڵام ئەم ستراتیژە وەک هەموو ستراتیژێکی کۆمەڵایەتیی دەسەڵات، ستراتیژیەتێکی فرەسەرە، ئەگەر ئەوەی دەسەڵات دەیەوێت ئەگەرێک بێت لە ئەگەرەکانی ئەو ستراتیژە، ئەوا ئەگەرەکانی تری ئەم ستراتیژە ڕێک پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی دەسەڵات دەبن. وەک نیشانم دا بەرخۆریی میکانیزمی ناوەکیی تایبەت بە خۆی هەیە و بوونیشی بە ئایدۆلۆژیای باڵادەست، تەنها ئینسانی گوێڕایەڵ و بێباک بەرهەم ناهێنێت، وەک دەسەڵات دەیەوێت، بەڵکو ئینسانی ناڕازی و تووڕەش دروست دەکات. بەرخۆری دەتوانێت بۆ ماوەیەکی کەم کۆمەڵگا بێدەنگ بکات، بەڵام لە مەودای دووردا دەبێتە سەرزەمینی دروستبوونی دەنگی تووڕە و ناڕازیی زۆر. ئەوانەی ئەمڕۆ ئاستی بەرخۆرییان نزمە و ئەو کاڵایانەی بەکاری دەهێنن هەرزان و خراپن، سبەینێ بەم ئاست و شێوازەی بەرخۆرییە ڕازی نابن. کردەی گەشەکردنی دابینکردنی ئاستێکی ماقووڵی بەرخۆریی بۆ هەمووان دەکرێت بەئاسانی ببێتە هۆی دروستبوونی وشیارییەک کە بە ناوی مافەوە قسە بکات، مافی تاکەکەس

و گروپەکان لەوەدا کە ئاستێکی ماقوڵی بەرخۆرییان بۆ دابین بکرێت. بە حوکمی ئەوەش لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئاستی هێجگار نایەکسان و پەرگیری بەرخۆری لەتەنیشت یەکەوە ئامادەن، بۆیە دەشێت خودی بەرخۆریی خۆی ببێتە ڕووبەرێکی گرنگی دروستبوونی ململانێی کۆمەڵایەتی و سیاسی. ئەوەی وا بزانرێت بەرخۆریی ئەمڕۆ و سبەینێ و دووسبەیش ئینسانەکان بێدەنگ دەکات و بە پاسیڤی دەیانهێڵێتەوە، بە هەڵە لە چۆنیەتیی کارکردنی بەرخۆری وەک چالاکییەکی ئینسانی تێگەیشتوە.

شتێکی دیکە کە من لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵم داوە نیشانی بدەم، وازهێنانە لەو لۆژیکە ڕۆشنبیرییەی لە دونیای ئێمەدا تەنها لە ڕێگای ڕەنگی ڕەش و ڕەنگی سپییەوە بیر دەکاتەوە، شتەکان تەنها بەسەر یان باش و یان خراپدا دابەش دەکات. لەباتیی ئەوە هەوڵێکی میتۆدی و تیوریی تایبەتم داوە بۆ ئەوەی بتوانین دیاردەکان لە ئاڵۆزبوونە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسییەکانی خۆیاندا ببینین. بۆ نموونە کە باسمان لە "بەرخۆری" و "تاکگەرای" کرد کورتیان نەکەینەوە بۆ دوو خراپەی ڕەها و خۆشمان بە دژایەتیکردنیانەوە سەرقاڵ بکەین لە ڕێگای ناونانی ئەو زۆرایەتییە بەرخۆرەوە بە گێل و گەمژە و نەزان و ئەحمەق و گاگەل و زۆرێکی تر لەم دەستەواژانە کە هێما بۆ ڕۆحێکی نوخبەراگەیی توندڕەوی نیمچە فاشی دەکەن. لە ڕاستیدا ئەم لۆژیکە ڕۆشنبیرییە نەک تەنها هەڵگری ڕەگەزێکی فاشییانەی ترسناکە، بەڵکو هاوکات لۆژیکی بەرگریکردنە لە سوفیزمێکی

کۆمەڵایەتی و سیاسی و هەڵگری داواکاریی ئەوەیە ئینسانی ئێمە وەک زاهیدی سەردەمە دێرینەکان بژی، وەک سوفییەکی دژەدونیایی لەناو ئەو ژینگە کۆمەڵایەتی و سیاسییەدا ئامادە بێت کە تیایدا دەژی.

لەم گۆشەنیگایەوە ئەم نووسینە چەند سەرقاڵی ئەوەیە لە ڕەهەندە خراپ و نێگەتیڤەکانی بەرخۆری لە دونیای ئێمەدا بدوێ، ئاواش سەرقاڵی دۆزینەوەی ڕەهەند و ئەگەرە پۆزەتیڤەکانی ئەم دیاردەیەیە، هەوڵی بینین و دۆزینەوەی ئەو ڕەهەندانە ئەدات و ئەگەرە پۆزەتیڤەکانی نیشان ئەدات. لەوانەش، بۆ نموونە، ڕۆڵی بەرخۆری لە دروستبوونی "من" و "خود"ێکی تاکەکەسانی سەربەخۆدا، بەتایبەتی سەربەخۆ لە پەیوەندیدا بەو "من"انەوە کە دین و ناسیۆنالیزم و بەها دەستەجەمعییە خنکێنەرەکانی تری دونیای ئێمە، دەیانەوێت بیانپارێزن و بێ هیچ گۆڕانکارییەک درێژە بە بوونیان بدەن. کە ئەمە دەڵێم، ئەو ڕاستییەش دەزانم کە دەشێت بەرخۆریزم و ئایدیۆلۆژیای کومەڵایەتیی چەپێنەر و شێوازی کۆمەڵایەتیبوونی خنکێنەر بەیەکەوە بڕۆن، کۆمەڵگای سعودی نموونەیەکی بەرچاوی تێکەڵبوونی بەرخۆرییەکی بەرفراوانە بە دەسەڵاتێکی دینی و سیاسیی هێجگار چەپێنەر. وڵاتێکە لە سەرێکەوە بەتەواوی نوقمە لەناو بەرخۆریدا، بەلام لە سەرێکی دیکەوە خاوەنی دەسەڵات کۆمەڵگایەکی چەپێنەر و دیسپلینکەری بێوێنە. سەرەڕای ئەم ڕاستییانە خاڵێک کە گرنگە بیبینین و ئاگامان لێی بێت و کاری لەسەر بکەین ئەم ئەگەرەیە: بەرخۆری وەک چۆن دەشێت تاکەکەسی نەرجسیی

پەرگیر و دوژمن بە کۆمەڵگا و ناحەز بە شێوازە جیاوازەکانی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی، دروست بکات، واتە خود و منێکی فووتێکراو و هەڵئاوساو و نەخۆش دروست بکات، کە بێباک بەپاڵ هەموو شتەکان و دیاردەکاندا تێپەڕێت، وەک چۆن دەشتوانێت کۆمەڵگایەکی دیسپلینکراو و گەمارۆدراو و خەڵەتێنراو لەناو بەرخۆریدا دروست بکات، ئاواش دەتوانێت وەک سەرەتایەک بۆ دروستبوونی منێکی بەرپرسیار و خاوەن حەز و ویست و ئارەزوو و ئەخلاقی تایبەت کار بکات، منێک فشارە ئەخلاقی و کولتووری و ڕەمزییە پرووکێنەرەکانی کۆمەڵگا و سیاسەت قبووڵ نەکات و بە شێوەیەکی وشیارانە خەریکی دروستکردنی خۆی و دروستکردنی ئەو ژینگە ئینسانییە بێت کە تییادا دەژی. وەک وتم ئەمە ئەگەرێکە و پێویستە بتوانین ببینین و بەرجەستەبوونە واقیعییەکانی بخوێنینەوە و ناو بنێین. گۆڕانکاری بە داواکرنی مەحاڵ دروست نابێت، بەڵکو بە ناونانی ئەگەرە نوێکان و ناونانی بەرجەستەبوونەکانیان لەناو واقیعدا دروست دەبێت.

دواهەمین دەرەنجامێک بکرێت لە کۆتایی ئەم نووسینەدا جەغتی لێ بکەین، ئەوەیە تێپەڕاندنی ڕووکارە خراپەکانی ئەخلاقیاتی بەرخۆریزم بە گەڕاندنەوە بۆ ئەخلاقیاتی دین و ئەخلاقیاتی ناسیۆنالیزم مەیسەر نابێت، بەوە نابێت ئینسانی ئێمە ناچار بکرێت بچێتەوە باوەشی ئەخلاقی چەپێنەری دینی و داوا پرووکێنەرەکانی ناسیۆنالیزم لە دونیای ئێمەدا، یەکێکیان دوای زوهدی دونیای و ئەوی تریان داوای زوهدی سیاسی دەکات، واتە تێپەڕاندنی ڕووکارە خراپەکانی ئەخلاقیاتی

بەرخۆریزم لە ڕێگای کوشتنی نەفس و کۆنترۆڵکردنێکی پەرگیری ڕۆح و ئاراستەکردنی ویستی تاکەکەسی نابێت. تێپەڕین لە ئەخلاقیاتی بەرخۆریزم بە گواستنەوە دەبێت بۆ هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگیی شێلگیرتر و کراوەتر، بەدروستکردنی فەزایەکی نوێ بۆ خودسازییەکی نوێ، خودسازییەک تیایدا تاکەکەسێک بکرێت دروست ببێت کە خەم و مشووری خۆی خوارد، خەم و مشووروی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی خۆشی و خەمی پەیوەندییەکانی خۆی بە دەوروبەریشیەوە بخوات[1].

---

[1] هەموو ئەو ڕێژە و ژمارە و ئامارانەی لەم نووسینەدا بەکار هاتوون، لە ئاماری ڕەسمی... لە سلێمانی وەر گیراون.

# سەرچاوەکان


1-Adorno, Theodor (2002). The Culture Industry:Selected Essays on Mass Culture. Routledge, New York.

2-Adorno, Theodor (1941). “On Popular Music,” Studies in Philosophy and Social Sciences (1941), Vol. IX, No. 1.

3-Beblawi & Luciani 1987. The Rentier State. London, Routledge.

4-Bottomore,Tom (2002). The Frankfurt School and Its Critics. Routledge, London and New York.

5-Fine, Alan and Sandstrom, Kent (1993. Ideology in Action: A Pragmatic Approach to a Contested Concept. Sociological Theory,Vol. 11, No. 1, (Mar., 1993), pp. 21-38.

6-Hall, S., Winlow, S. and Ancrum, C., (2008). Criminal Identities and Consumer Culture. Cullompton: Willan.

7-Hayward, K., (2004). Consumer Culture and Crime in Late Modernity. In Summer, C. (ed.) The Blackwell Companion to Criminology. Oxford: Blackwell.

8-Kunneman, H.P. (1996). Van theemutscultuur naar walkman-ego: Contouren van postmoderne individualiteit. Amsterdam/Meppel: Boom.

9-Kunneman (1996 b).Een interview met Harry Kunneman. Groene Amsterdammer, nummer 51, 18-21-1966.

10-Kunneman, H.P. (1998). Postmoderne moraliteit. Amsterdam: Boom.

11-Kunneman, Harry (2009). "Voorbij het dikke-ik. Bouwstenen voor een kritisch humanisme – Deel 1", Amsterdam, Uitgeverij SWP, 3e druk

12-Marcuse, Herbert (1991). "Introduction to the Second Edition". One-dimensional Man: studies in ideology of advanced industrial society. London: Routledge. pp. xi

13- Mosse, G. L. (1988). Nationalism and sexuality: middle-class morality and sexual norms in modern Europe. Madison, University of Wisconsin Press.

14- Rowman & Littlefield (1993). Emile Durkheim and the Reformation of Sociology, STJEPAN G. MESTROVIC. To- towa, NJ: . 156 pp.

15-Sartori, Giovanni. 1969. "Politics, Ideology, and Belief Systems." American Political Science Review 63:398- 411.

16- Savage, M., (2000). Walter Benjamin's urban thought: a critical analysis, in: Crang &

Thrift (red.), Thinking space in de serie Critical Geography, p. 33-49.

17-Van Koppen, Kris (2002). Echte natuur. een sociaaltheoretisch onderzoek naar natuurwaarering en natuurbescherming in de moderne samenleving. Proefschrift wageningen Universiteit.

18-Yan, Yunxiang (2010). The Individualization of Chinese Society. Berg, Oxford.

# ئیسلامی ئیخوانی و ئیسلامی سەلەفی

**سەرەتا**

کۆمەڵگای ئێمە لەبەردەم دوو پرۆژەی دینیی گەورەدا وەستاوە، کە هەریەکێکیان خەونی ئەوە دەبینێت سەرجەمی فەزای ئایینی لە کۆمەڵگای ئێمەدا داگیر بکات و بۆچوون و لێکدانەوە و ئاکاری دینیی خۆی بکات، بۆچوون و لێکدانەوە و ئاکاری باڵادەست لە وڵاتەکەدا. هاوکات دەیانەوێت هەم لە ڕێگای لێکدانەوەکانیانەوە بۆ دین لە ئاستی فیکریدا و هەم لە ڕێگای هەڵسوکەوت و پراکتیکی دینییانەوە "هەیمەنەیەکی دینی و کولتووری" پەیدا بکەن و هەموو لێکدانەوەکانی تری دین و هەموو دەرکەوتە کولتوورییە نادینییەکان، یان یاساغ بکەن، یان بێنرخ، یان لە باشترین دۆخدا لە هەندێکیان بێدەنگ بن و کێشەی ڕۆژانە و بەردەوامیش بۆ ئەوانی تریان دروست بکەن. ئەم دوو پرۆژەیە بەدەستهێنانی "هەیمەنەی دینی" وەک بنەما و پێشمەرجی پەیداکردنی "هەیمەنەی سیاسی" دەبینن و لەم ڕێگەیەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان باڵادەستیی دینی و باڵادەستیی سیاسییدا

دروست دەکەن. پرۆژەی یەکەمیان پرۆژەی بەسیاسیکردنی بەردەوامی ئایینە، کە لە بنەڕەتدا پرۆژەی ئیخوانی موسلمینە و ئەمڕۆ لە بەشێکی گەورەی ناوچەکە و لە دونیای ئێمەدا بەخەستی ئامادەیە. ئەوی تریان پرۆژەی سەلەفیەتی دینییە، کە ئەویش لە دۆخی گەشەکردن و بەهێزبووندایە و لەسەر نیشاندان و نمایشکردنی بەردەوام و ئاشکرای دین لە فەزای گشتیدا کار دەکات. ئەم سەلەفیەتە ئاکارێکی شانۆییانە و ئیستیعرازی بە دین ئەبەخشێت و لە ڕێگای دروستکردنی کۆمەڵێک وێنەی دینییەوە بە فەزای گشتیی کۆمەڵگادا بڵاوی دەکاتەوە. هەردوو پرۆژەکەش دین لەوە دەر دەکەن شتێک بێت پەیوەست بە دونیای ناوەکی و ویژدانی و ڕۆحیی ئینسانەوە، یان لانی کەم ئەم ڕەهەندە ڕەهەندی هەرە لاواز و پشتگوێخراوی ئەم دوو پرۆژەیەیە. هاوکات هەردوو پرۆژەکە جۆرێک لە دینداری دروست و گەورە دەکەن، کە بێبەشە لە هەر قووڵاییەکی ڕۆحیی ڕاستەقینە و بەتاڵە لە هەر هەستێکی ئەخلاقیی تەندروست و دابڕاوە لە هەر پرسیارێکی وجودییانە، کە تام و چێژێکی دینیی قووڵ بە ژیان و بە ئینسانبوون ببەخشن. لە ڕاستیدا لەو کاتەدا ئەم دوو پرۆژەیە دین لە ڕەهەندە ئەخلاقی و ئینسانییە قووڵەکانی دادەبڕن، لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ گرێی ئەدەنەوە بە وێناکردنێکی فووتێکراو و نەرجسییانەوە بۆ "خودی دینی"ی خۆی، لەمەدا کەسی دیندار وەک کەسێکی پاکژ و بێگەرد و وەک بوونەوەرێکی نموونەیی نمایش دەکرێت و هاوکات دەکرێتە ئەلتەرناتیڤی هەموو جۆرەکانی تری بەکەسبوون و بەئینسانبوون.(١)

ئـەم نەرجسـیەتە دینییـە لـە دوو ئاسـتی سـەرەکیدا دەر دەکەوێـت. یەکەمیـان لـە ئاسـتی تەماشـاکردنی ئـەو خـودە دینییـەدا بۆ خـۆی وەک هەڵگری یەکەمین و دواهەمین هەقیقەت، خـۆی لەسـەر ڕێـی ڕاسـت و هەمـوو دونیـای دەرەوەی خـۆی گومـڕا. دووهەمیـان ئاسـتی وێناکردنـی ئـەو خـودە دینییەیـە بـۆ ئیسـلام وەک "چارەسـەری" هەمـوو کێشـە تاکەکەسـی و دەسـتەجەمعییەکانی دونیای مۆدێرن. هەردوو ئاسـتەکەش دوو ئاسـتی پڕ کێشـە و قەیرانـن و لـە ڕەوتـی سیاسـی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیـی دونیـای ئێمـەدا هەڵگـری ئاکارێکـی نادیموکـراس و دەسـەڵاتگەرن.

**خودسازییەکی نەرجسییانە**

پیشەسـازیی بەرهەمهێنانـی خودێکـی نەرجسـی، یەکێکـە لـەو پیشەسـازییە سـەرەکییانەی ئیسـلامی سیاسـی بـە درێژایـی نیـوەی دووهەمـی سـەدەی بیسـتەم کاری تێدا کـردوە و کاری تێـدا دەکات. لـەم پیشەسـازییەدا ئیخوانـەکان بەرهەمهێنـەری سـەرەکین، ئەگـەر سـەرکیترین بەرهەمهێنـەر و خاوەنـی پیشەسـازییەکەش نەبـن. لـەم پیشەسـازییە تایبەتـەدا خودێکـی ئیسـلامیی خەیاڵـی بەرهـەم دەهێنرێـت، کـە لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە هەڵـە و بێنموونەیـە، نەرجەسـتییەتێکی پەڕگیـر ئاراسـتەی پرۆسـەکانی ئـەم بەرهەمهێنانـە دەکات و پارچـە جیاوازەکانـی بەیەکـەوە گـرێ ئـەدات و وێنەیەکـی گشـتیی لـێ دروسـت دەکات. لـەم پرۆژەیـەدا فـوو بـەو تێگەیشـتنە نەرجسـییانەدا دەکرێـت کـە ئـەم خـودە ئیسـلامییە خەیاڵـی و گریمانکـراوە دەکاتـە خاوەنـی تاکـە دیـن و تاکـە ئەخـلاق

و تاکە تێگەیشتن و تاکە لێکدانەوەی ڕاستەقینەی دونیا. ئیسلامیش دەکات دینێک بۆ هەموو وەرزەکان و دەیخاتە شوێن و بری هەموو ئەگەرە شارستانیەتییەکانی تر. ئەم دونیابینییە نەرجسییە پەیوندییەکی پتەو و بنەڕەتی لەنێوان دین و پێشکەوتن و دین و دەرکەوتە جیاوازەکانی دونیادا پێشنیار دەکات، بە شێوەیەکی هەمەلایەن دینداری و ئەخلاق بەیەکەوە گرێ ئەدات و لە دەرەوەی ئەخلاقیاتی دینیدا، کە زۆر جار کورت کراوتەوە بۆ پەیڕەویکردنی هەندێک ئەمر و نەهی و حەلاڵ و حەرامی دینیی دابڕاو لە هەر قووڵاییەکی ویژدانی و ڕۆحی، دونیا وەک بیابانێکی پڕ گوناه و لێوانلێو لە خراپەکاری دەبینێت و مامەڵە دەکات. ئەم خودە دینییە خۆی وەک خودێکی نەگۆڕی ئەبەدی نمایش دەکات و پێی وایە لە سەرەتای مێژووەوە و بەبێ هیچ گۆڕانێک بۆ ئەمڕۆ هاتووە و تا کۆتایی مێژووش بە هەمان شێوە و بەبێ هیچ گۆڕانێکی قابیلی باسکردن دەمێنێتەوە. ئەم دیدە دان بەوەدا دەنێت کە کۆمەڵگا موسڵمانەکانی ئەمڕۆ کۆمەڵگای دواکەوتوو و نادیموکراس و بێدادپەروەریین، کۆمەڵگایەکن تیایاندا بەهێز لاواز و گەورە بچووک و دەوڵەمەند هەژار و نێر مێ، بێڕێز و بێماف و بچووک و گرنگن دەکات، بەڵام هەمیشە هۆکاری گەیشتن بەم دۆخە نالەبارە بۆ تێکەڵبوونی "فیکری ئیسلامیی ڕەسەن"ی ئەم کۆمەڵگایانە بە خلتەی فیکر و بیروبۆچوونە "ناڕەسەن" و "هاوردە"کانەوە گرێ ئەدات. هەموو کارەسات و دواکەوتنەکان ئەداتە پاڵ هێنانی ئەو شتەی بە هۆ و بێهۆ بە "عەلمانیەت" ناوی دەبەن و دەیکەنە سەرچاوەی هەموو ناشیرینییەکانی دونیای ئێمە. ئەم دیدە

کە وێنەیەکی شەیتانی و جەهەنەمییانەی عەلمانیەت دەکێشێت، هاوکات وێنەیەکی زێڕینی ڕابردوویەکی دینیپێشکەوتووی گریمانکراو دروست دەکات و گەڕانەوە بۆ ئەو ڕابردووە وەک چارەسەری کێشەکانی دونیای ئەمڕۆ دەبینێت. یان لانی کەم ئەو ڕابردووە بۆ ئاستی مۆدێلێکی گەردوونی بەرز دەکاتەوە و هەوڵی سەرلەنوێ دروستکردنەوە و ژیاندنەوەی لە دونیای ئەمڕۆدا ئەدات.(٢)

بەکورتی ئەم دیدە نەرجسییە هۆکاری دواکەوتنەکان بۆ دوورکەوتنەوە لەو خودە دێرینە پاکژە و دوورکەوتنەوە لە دید و تێڕوانین و "سەوابیتەکانی" ئەو خودە دێرینە دەبینێت و مامەڵە دەکات. لە بەرامبەر وێنەی ئەم خودە نەگۆڕ و ئەبەدییەشدا، وێنەی "ئەوی تر"ێکی ناحەز و جیاواز و بەخیل دروست دەکات کە گوایە ئەم خودە دینییە ڕەسەنە کەوتۆتە پەیوەندییەکی گرفتئامێز و هەڕەشەکارەوە لەگەڵیدا. ئەم "ئەویتر"ە کە ڕقێکی شارستانی و سیاسی و فەرهەنگی لەم خودە ئیسلامییە پاکژەیە، هەندێک جار ڕۆژئاوایە کە جارێک بە مەسیحیەتی سەلیبی و جارێک بە داهێنەری عەلمانیەت و جارێک بە سەرمایەداری و جارێک بە ئیمپریالیزم، یەکسان دەکرێت. هەندێک جاری تریش ئەم "ئەویتر"ە ئەو هێز و گروپ و ڕۆشنبیرە ناوخۆییانەن، کە گوایە بە هۆی دوورکەوتنەوەیان لە دین "ڕەسەنایەتی"ی خۆیان دۆڕاندوە و شتێک دەڵێن و دەنووسن و بڵاو دەکەنەوە لەگەڵ "جەوهەر"ی گریمانکراوی کۆمەڵگاکەیاندا ناگونجێت. لەم ڕووەوە لە سەرەتای شەستەکانەوە ئەدەبیاتێکی ڕۆمانسییانەی زۆروزەبەند نووسراوە کە باس لە"غەرەبزەدەگی" و

"خۆدفرۆشی"ی فیکری و کولتووری و ڕەمزی دەکات و داوای ئاشتبوونەوە و "گەڕاندنەوە بۆ خود" دەکات وەک هەنگاوی یەکەمی دەرچوون لەو "نامۆبوونە کولتووری" و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییە گوایە ئەم کۆمەڵگایانەی تێکەوتوە.(٣) ئەمە جگە لە دووبارەکردنەوەی بەردەوامی ئەو قەوانانەی کە باس لەوە دەکەن ئەم نوخبە "غەرەبزەدە"یە لە قسەکردن و نووسین و شێوەژیانیاندا بەردەوام هێرش دەکەن و پەلامار دەبەنە سەر موقەدەساتی کۆمەڵگا و هەوڵ ئەدەن لە ڕێگای تێکدانی ئەو موقەدەساتانەوە کۆمەڵگا "لەیەک بترازێنن" و "هەڵی بوەشێننەوە"، واتە بیکەن بە "تیکەیەکی ئاسان" بۆ دوژمنان. بەکورتی هەردوو دیوەکەی ئەم دوو پرۆژە دینییە وێنەی خودێکی ئیسلامیی وەک خودێکی بێگەرد و پاکژ و پێشکەوتوو دروست دەکەن و خۆرئاوا و نۆکەرە عەلمانییە ناوەکییەکانی، بە هۆکاری کێشە و گرفت و دواکەوتنی کۆمەڵگاکانیان دەزانن و ئەوانن وایان کردوە ئەم خودە ئیسلامییە پاکژ و بێگەردە پڕ ببێت لە خڵتەی کولتووری و ئەخلاقی و سیاسی و ڕەمزیی بێگانە.

بێگومان. حیکایەتی ئەم دیدە نەرجسییە لەوەی لە سەرەوەدا باسمان کرد کۆتایی نایەت، بەڵکو هاوکات دونیا لەسەر بنەمای ئەوەی چی لەگەڵ دیندا دەگونجێت و چی لەگەڵ دیندا ناگونجێت، دابەش دەکات. ئەوەی لە دیدی ئەواندا لەگەڵ دیندا ناگونجێت حەرام و ئەوەی پێیان وایە دین دەیسەلمێنێت، بەبێ بیرکردنەوە لە ناوەڕۆکەکەی حەڵاڵ دەکەن. لە دوادەرەنجامدا ئەم لۆژیکە دوولایەنە کارێک دەکات ڕووبەرێکی هێجگار گەورەی چالاکیی ئینسانی،

بەتایبەتی برێکی هێجگار زۆری چالاکییە عەقڵی و گومانکەر و ئازادەکانی ئینسان و سەرجەمی ئەو پرسیار و پرس و تێڕوانینانەی ئینسان کە لەگەڵ حیکایەت و ڕاڤەکردن و گریمانە دینییەکاندا ناگونجێن، حەرام بکرێن، یان وەک هێرش و پەلامار و فشار بۆ سەر موقەدەساتی دینی وێنا بکرێن. پەنابردن بۆ بەموقەدەسکردنی کۆمەڵێک دەرکەوتی دینی و بۆ پاراستنی ئەم جیاکارییەیە، بۆ جیاکردنەوەی ڕووبەری دین لە نادین و کردنی ڕووبەری دین بە ڕووبەرێکی موقەدەس و ڕووبەری نادینیش بە حەرامێکی کولتووری و کۆمەڵایەتیو سیاسی، کۆڵەکە سەرەکییەکانی پاراستنی ئەم نەرجسیەتە دینییەیە.

بە بۆچوونی من ئەوەی دەبێت جێی ئەم دابەشکردنە دینییە بەرتەسکە بگرێتەوە، دابەشکردنێکی دیکەیە لەباتی ئەوەی بپرسێت کامە دین و کامە نادینە، بپرسێت چی بۆ ئینسان باشە و چی خراپە؟ ژیانی باش کامەیە و ژیانی خراپ کامەیە؟ چی کۆمەڵگا پێش دەخات و چی پاشی دەخات؟ لەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەشدا ئەوەی گرنگە جەغتی لێ بکەین بەخشینی ئازادییە بە ئینسان کە بتوانێت هەم باشە بکات و هەم خراپە، هەم هەڵە بکات و هەم ناهەڵە، جارێک خۆی بە خاوەنی هەقیقەت بزانێت و جارێکی تر ئەوی تر. ئەم دابەشکردنە تازەیە لەباتی دین، ئینسان دەکاتە سێنتەری بیرکردنەوە و ئارکارەکان و هەوڵی دروستکردنی ئینسانێکی عەقڵانیی خاوەن ویژدان و خاوەن بڕیاری سەربەخۆ و خاوەنی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی و خاوەن ئازادی ئەدات. بێگومان دین دەتوانێت بەشێک بێت لە

کردەی دروستبوونی ئەم ئینسان و کۆمەڵگا ئازاد و کراوەیە، بەڵام ناتوانێت هەموو کردەکە بێت، دەشێت خشتێک بێت لە نەخشەیەکی شارستانی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیی گەورە، بەڵام ناتوانێت هەموو نەخشەکە و تاکە نەخشە بێت.

**ئیسلام وەک تاکە چارەسەر**

وەک پێشتر هێمامان پێ کرد، دیوێکی تری ئەو دیدە نەرجسیەی سەرەوە، بینینی دینە وەک چارەسەرێک بۆ هەموو کێشەکانی ئینسان و هەموو نەهامەتییەکانی کۆمەڵگا. بینینی ئیسلامە وەک وەڵامێک بۆ هەموو قەیرانەکان لە هەموو سەردەمەکاندا، ئیتر لە قەیرانی دواکەوتن و هەژاری و لاوازی و نەبوونی ئازادی و نەبوونی دیموکراسیەت و نەبوونی مافەوە بیگرە، تا بە قەیرانی وێرانبوونی پەیوەندیی نێوان نێر و مێ و گەورە و بچووک و دیندار و بێدین و کێشەی جنس و گەنج و منداڵ و پیر و دەیان کێشەی گەورەی تری لەو بابەتە دەگات. لێرەدا هێزێکی سیحریی گەورە و فووتێکراو بە ئیسلام دەبەخشرێت و وەک سەرەتا و کۆتاییی هەموو چارەسەرێک وێنا دەکرێت. دروشمی "گەڕاندنەوە بۆ ئیسلام" یان "ئیسلام چارەسەر" لە دروستکردنی ئەم وێنە ئەفسانەییەوە بۆ تواناکانی دین بەگشتی و بۆ تواناکانی ئیسلام بەتایبەتی، هاتووە. ئەم دیدە هێزێک بە دین دەبەخشێت کە نییەتی، دین بە کۆمەڵێک ئەرک بار دەکات کە ناتوانێت جێبەجێیان بکات، چاوەڕوانییەکی لە دین هەیە کە ناماقووڵ و نامێژوویی و ناعەقڵانییە. هاوکات ئەم دیدە هەوڵێکی بێبڕانەوە ئەدات بۆ بێترخکردنی هەموو ئەو چالاکی

و بیرکردنەوە نادینییانەی کە دەکرێت هەڵگری وەڵامی ڕاستەقینە بن بە بەشێکی زۆری ئەو کێشانە.

بە بۆچوونی من دیندارێک ڕێزی توانا و سنووری دینەکەی خۆی بگرێت، تێگەیشتنێکی دروستی بۆ ئەرک و توانا و ڕۆڵی دین هەبێت، چارەسەری ئەو هەموو قەیرانە قووڵانە بە دین نابەخشێت، لە دیندا بەدوای وەڵامدانەوەی تەحەدا مێژووییەکاندا ناگەڕێت، چونکە دین نەک ئەمەی پێ ناکرێت، بەڵکو چارەسەری هەریەکێک لەو کێشانە پێویستی بە دەیان چالاکیی عەقڵی و سیاسی و ڕەمزیی نادینی و هەندێک دژەدین هەیە. پێویستی بە وەڵامی کولتووری و سیاسی و ڕەمزیی نوێ هەیە کە بەشی هەرەزۆریان دەکەونە دەرەوەی دین و هەندێکیشیان نارێک و نەگونجاون لەگەڵ دیندا و هەندێکیشیان دەشێت دژ بە بیرکردنەوەی دینی بن.

ئەو کێشانەی ئەمڕۆ کۆمەڵگای ئێمە و کۆمەڵگاکانی دەوروبەرمان ڕووبەڕوویان بوونەتەوە ئەو کێشانەن کە تازەبوونەوەی دونیا لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن، کێشەی کۆمەڵگا و ئینسان و سەردەمە مۆدێرنەکانە. بەخشینی چارەسەری کێشە و تەحەداکانی مۆدێرنە بە دین، بەتایبەتی تەحەدای دروستبوونی بەردەوامی جیاوازیی لە بوارە جیاوازەکانی ژیانی ئینسانی و کۆمەڵایەتی و دینی و زانستی و سیاسیدا، کارێکی نەکردەیە. چاوەڕوانیی ئەوەی کە دین بتوانێت کێشەی دروستبوونی دیدی جیاواز لەناو خۆیدا و دروستبوونی دیدی جیاواز لە دەرەوەی دیندا و دروستبوونی دیدی دژەدینیش بە شێوەیەکی دیموکراسییانە و ئینسانییانە ڕێک و چارەسەر بکات، چاوەڕوانییەکی ناماقوڵ و ناڕاستە.

با لە سەرەتاوە ئەو بۆچوونە ئاشکرا بێت کە مۆدێرنە دینی نییە، بەڵکو کۆمەڵێک بنەمای سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژی و فەرهەنگیی تایبەتی هەیە. ئەوەی مۆدێرنە لە ئاستی سیاسیدا دروست دەکات، هاتنەکایە و دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن و دەزگا تازەکانی حوکمڕانی و ئەو دید و تێڕوانین و بیروبۆچوون و تیورانەیە کە لەگەڵ هاتن و دروستبوونی ئەم دەوڵەتەدا دێنە کایەوە. لەوانەش، بۆ نموونە مەسەلەی پەیمانی کۆمەڵایەتی، لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، مافی لێپرسینەوەی سیاسی، هاوولاتیبوونی یاسایی و مافپەروەریی دەستووری و لێبوردنی سیاسی و دینی و کۆمەڵایەتی هتد... دەشێت دین ڕۆڵێک لە دروستبوونی بەشێکی بچووک یان گەورەی دروستبوونی ئەم دەوڵەتە مۆدێرنەدا ببینێت، بەلام خودی پرۆژەکە خۆی، ناوەرۆکەکەی، مەبەست و ئیشکردنەکانی، یاسا و پرنسیپەکانی دینی نیین.

گەر تەماشای ئاستە کۆمەڵایەتییەکەی مۆدێرنە بکەین، دەبینین لەوێشدا هاتنی مۆدێرنە مانای هاتنەکایەی کۆمەڵێک هێز و گروپ و چینوتوێژی جیاوازە، کە بە هەموو ناکۆکییەکانی نێوانییانەوە هێشتا سوود و قازانجیان لە تازەکردنەوەی دونیادایە، لەوانەش چینی بۆرژوازی، چینی ناوەند و تەنانەت بەشێکی بەرچاوی چینەکانی خوارەوە، ئەمە جگە لەڕۆشنبیران و کەرتە خوێندەوارەکانی کۆمەڵگا، جگە لە دروستبوونی ئەو ژمارە زۆرە لە کەسانی میهەنی و لێزانی بوارەکانی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی. هەموو ئەمانە لە ڕێگای تازەکردنەوەی دونیاوە، لە ڕێگای بەرهەمهێنانی کایەی کۆمەڵایەتی و پیشەیی و زانستیی جیاوازەوە، لە ڕێگای

داهێنانی شێوە ژیانی نوێوە، شوێن و جێی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی خۆیان بەهێز دەکەن و لەگەڵ خۆیاندا دونیای دەوروبەر و ژینگەکەیان تازە دەکەنەوە. لێرەشدا دین دەتوانێت بەشێک بێت لە دروستبوونی ئەو شتانەدا، بەڵام پرۆسەی دروستبوونەکە خۆی و پرۆسەی دروستبوون و ناوەرۆکی بەها و نۆرمەکانی ئەو گۆڕانکارییانە و چۆنیەتیی دروستبوون و کارکردنی یاسا ناوەکییەکانی ناو کایەکان، پرۆسەیەکی دینی نییە. ئەوەی دین لێرەدا دەتوانێت ئەنجامی بدات خۆگونجاندنە لەگەڵ دروستبوونی ئەو دونیا پلورالەدا و وازهێنانە لە تەماحی ئەوەی سەرجەمی یاسا و بەهاکانی ئەو دونیا پلورالهدەستنیشان بکات.

ئاستێکی تری هاتنی مۆدێرنە ئاستە فیکری و ئایدیۆلۆژییەکەیەتی، لێرەشدا بیرۆکەیەک کە سەرجەمی ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنەکان بەرگری لێ دەکەن ئەو ڕاستییەیە کە ئینسان چ وەک تاکەکەس و چ وەک ئەندامی گروپ یان نەتەوە یان تەنانەت دەستەیەکی دینیی دیاریکراو، خۆی بکەری سەرەکیی ژیانی خۆی و خۆی دروستکەری دونیای خۆیەتی. بەشی هەرەزۆری ئەم ئایدیۆلۆژیایانە پێ لەسەر ڕۆڵی عەقڵ و زانست و بیرکردنەوەی ئازاد و ڕەخنەیی لە کردەی تازەکردنەوەی دونیادا دادەگرن. ئەمانەش فرەجۆرن، هەندێک لەو ئایدیۆلۆژیایانە پێ لەسەر ڕۆڵی گرنگیی تاکەکەسی ئازاد دادەگرن، هەندێکیان جەخت لە ڕۆڵی زانست دەکەن، ئەوانی تریان ڕۆڵی ئەم چین یان ئەو چینی کۆمەڵایەتی بە گرنگ دەزانن، ئەوی تریان ڕۆڵی نەتەوە و سەرکردەی بەهێز بە گرنگ دەزانێت هتد... ئەوەی لەم ئایدیۆلۆژیانەدا تێبینی

دەکرێت، ئەوەیە کە دەشێت دین وەک ڕەگەزێک لەناویاندا ئامادە بێت، بەڵام هیچیان ئایدیۆلۆژیای دینی نین و لە دیندا بەدوای ڕەوایەتی و ناوەڕۆکدا ناگەڕێن. بە مانایەکی تر پرۆژە ئایدۆلۆژییەکان دەشێت ڕەهەندی دینییان هەبێت، بەڵام خۆیان پرۆژەی دینی نین.

جگە لە هەموو ئەمانە مۆدێرنە هەندێک بنەمای فەرهەنگی و کولتووریی گشتییشی هەیە کە تیایاندا بیرۆکەی سەرەکی بیرۆکەی لێبووردنی دینی و سیاسی و فەرهەنگییە، پێداگرتنە لەسەر ئینسان وەک بوونەوەرێکی خاوەن ماف، وەک کەسێک خۆی نووسەر و بکەری ژیانی خۆیەتی، نەک لە دەرەوەڕا نەخشەی ئەو ژیانەی بۆ بکێشن و کاری ئەو تەنها جێبەجێکردنی ئەو نەخشانە بێت. مرۆڤی ناو ئەم ژینگە مۆدێرنە کەسێکە دەتوانێت لە دونیایەکی ئاڵۆز و پلورالدا بژی، لەپاڵ ئینسان و گروپ و دیدە جیاوازەکاندا بژی، بەبێ ئەوەی حەز و ویستی ئەوەی هەبێت ئەوەی خۆی بە ڕاستی دەزانێت بەسەر هەمواندا بیسەپێنێت، یان ناچار بێت ئەوەی کەسانی تر بە هەقیقەتی دەزانن ئەمیش بە هەقیقەتی بزانێت. جۆرێک لە ڕێژەگەرایی تەندروست سەرجەمی پەیوەندییەکان و بەرخوردەکان و بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگا بەیەکەوە گرێ ئەدات. وەک دەبینین مۆدێرنە لەم ئاستەشدا دیسانەوە پرۆژەیەکی دینی نییە، بەڵام دەشێت دین لەم ئاستەشدا ئامادە بێت و ڕۆڵێکی پۆزەتیف یان نێگەتیڤ، لە دروستبوونی ئەو ڕۆحیەتە دیموکراسی و ڕێژەگەراییە تەندروستەدا ببینێت.

بەکورتی لە هەموو ئەو دۆخانەدا دین دەتوانێت ببێت بە یەکێک لە ئامرازەکانی دروستکردنی دونیایەکی تازەی

دیموکراس و دادەپەروەر و ڕێزگری ماف و جیاوازی، بەڵام ناتوانێت تاقە هۆکار و تاقە ئامرازی دروستکردنی ئەو دونیایە بێت، ناتوانێت ببێت بە داگیرکەری سەرجەمی بوارەکان، ناتوانێت لۆژیک و خواست و حەڵاڵ و حەرامەکانی خۆی بەسەر هەموو ئەو ڕووبەرانەدا بسەپێنێت کە دروست دەبن و تازە دەبنەوە و دەگۆڕێن. گەر دین هەوڵی ئەوەی دا، ئەودەم دەبێت بە ئایدۆلۆژیایەکی تۆتالیتاری و دەبێت بە هەڵگری پرۆژەیەکی سیاسیی نادیموکراسی دژ بە جیاوازی و فرەدەنگی. دەبێت بە دینێکی بنلادنی و تاڵیبانی و سعودی و ئێرانی و لەوە دەکەوێت دینێک بێت لەناو مۆدێرنەدا ئامادە بێت و بەشێک بێت لە پرۆسەی دروستکردن و بەهێزکردنی دونیایەکی نوێی کراوە و دیموکراس و ڕێزبەخش و مافدۆست. کە ئەمانەشی نەکرد دینێک دروست دەبێت کە دەبێت بە دوژمنی لۆژیکە سەرەکییەکەی مۆدێرنە. بە مانایەکی تر، دین بۆ ئەوەی بتوانێت ببێت بە بەشێک لەپرۆژەی دروستکردنی دونیایەکی پڕ لە جیاوازی و پلورال و فرەمافی وەک دونیای مۆدێرنە، دەبێت واز لە سەرجەمی ئەو تەماحە تۆتالیتاریانە بهێنێت کە وای لێ دەکات بە ناوی موقەدەسێکی گەردوونیی نەگۆڕەوە قسە بکات و هەمووان ناچار بکات ئەو موقەدەسە قبووڵ بکەن. دین لەم ئاستە سیاسییە گشتییەدا، دەبێت خۆی وەک "ڕا"یەک لەپاڵ ڕاکانی تردا ببینێت و چ مافێک بە خۆی ئەدات بۆ ئەوەی وەکو ڕا ئامادە بێت، دەبێت هەمان مافیش بە نادین و دژەدینیش بدات کە هەبن و ئامادە بن. بەکورتی چارەسەری کێشەکانی مۆدێرنە و تەحەداکانی بە دین ناکرێت، بەڵکو بە ئینسان دەکرێت، مۆدێرنە دین

دروستی نەکردوە، بەڵکو ئینسان دروستی کردوە، ئینسانیش تەنها بوونەوەرێکی دینی نییە، بەڵکو بوونهوەرێکی بێدینیشە، بۆیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دونیای مۆدێرن، تەنها فیکری دینی بەس نییە، بەڵکو سەرجەمی ئەو فیکرە نادینی و دژەدینییانەش پێویستن کە مۆدێرنە لەگەڵ هاتنی خۆیدا دروستیان دەکات.

### دوو پرۆژەی پرتەماح

ئەگەرچی دین لە ئێستای کوردستاندا فرەجۆر و فرەدەرکەوتە، بەڵام هێدی هێدی بەرەو ئەوە دەڕوات لە دوو جۆری سەرەکیدا نیشتەجێ بکرێت.(٤) جۆری یەکەمیان بەسیاسیکردنی زیاتر و زیاتری دین و گەورەکردنی ئەو لەشکرەیە لە چالاکەوانی سیاسیی دۆگماییی توندڕەو و نیمچەتوندڕەو، کە بە ناوی دین و موقەدەساتی دینییەوە سیاسەت دەکەن. دووهەمیان ئەو جۆرەی دینە کە هەڵگری ڕۆحێکی ئیستیعرازی، خۆنماییشەکاری ڕووکەشە و خۆی لە کۆمەڵێک سرووت و شێوازی تایبەتی جلپۆشی و دەرکەوتنی تایبەتی جەستەوە لە ناو فەزای گشتیدا، بەرجەستە دەکات. بۆ مەبەستی سادەکردنەوە دەکرێت ئەم دوو دەرکەوتەی دین لەمرۆکەی کوردستاندا بە دوو پرۆژەی دینیی سیاسیی سەرەکیی ئەمرۆکەی ناوچەکەوە ببەستینەوە. یەکەمیان پرۆژەی ئیخوان موسلیمینە، دووهەمیان پرۆژەی سەلەفیەتە لە ناوچەکەدا. یەکەمیان لەسەر بەسیاسیکردنێکی ڕەها و هەمەلایەنی دین کار دەکات، دووهەمیان لاوازکردنی هەموو

قووڵاییە ڕۆحی و ئەخلاقی و ویژدانییەکانی دین ئاراستەی دەکات. با کەمەکێک وردتر لەسەر هەردوو پرۆژەکە قسە بکەین.

**بەسیاسیکردنی ڕەهای دین**

ئەمڕۆ پرۆسەیەکی بەرفراوانی بەسیاسیکردنی دین لە ناوچەکە و لە کوردستاندا ئامادەیە. ئەم پرۆسەیەش لەلایەن زیاد لە هێز و گروپێکی کۆمەڵایەتییەوە ئاراستە دەکرێت، ئەوانەی لە دەسەڵاتدان ئەم کارە ئەنجام ئەدەن و ئەوانەشی لە دەرەوەی دەسەڵاتدان هەمان کار ئەنجام ئەدەن. وەک پێشتریش وتم هەردوو لا لەشکرێکی گەورەیان لە کادر و چالاکەوانی دینی دروست کردوە، کە ئاکاری سەرەکی و شێوازی کارکردنیان ئەوەیە بە ناوی موقەدەس و هەقیقەتێکی دینیی ڕەهاوە سیاسەت دەکەن و بێ هیچ گومان و دوودڵییەک خۆیان بە نوێنەری ئەو موقەدەسانە دەزانن. ئەم لەشکرە لە کادری سیاسی و دینیی لانی کەمی ئامادەیی ئەوەیان تێدا نییە تێڕوانیان بۆ دین و تێگەیشتنیان بۆ موقەدەسی دینی، وەک مەسەلەیەکی ڕێژەیی ببین و ئەوەی ئەوان بە موقەدەسی دەزانن و بە ناوی موقەدەسەوە دەیڵێن، وەک "ڕا"یەکی تایبەتی ناو چەندان ڕای جیاوازی ناو فەزای گشتی کۆمەڵگا، وێنا بکەن. ئەمانە گەمەیەکی ترسناک لەگەڵ موقەدەسدا دەکەن و سەمایەکی قەیراناوی لەگەڵ موقەدەسەکانیاندا دەکەن، ئەمانە موقەدەسی دینی دەکەن بە موقەدەسی سیاسی و موقەدەسی سیاسییش دەکەن بە موقەدەسی دینی. بەم تێکەڵکردنەشیان فەزایەکی دینی و سیاسی هێجگار چەپێنەر

و ترسناک دروست دەکەن و ڕووبەڕێکی هێجگار گەورەی کۆمەڵگا و ژیانی ئینسانی بە ناوی موقەدەسەوە تاریک و بێلێپرسینەوە دەکەن. ئەمانە فەزای کۆمەڵایەتی پڕ دەکەن لە حەڵاڵ و حەرامی دینی و سیاسیی موتڵەق، بە جۆرێک هەموو چالاکەوانێکی گەنجی ناو ئەم فەزایە دەتوانێت لەو کاتەدا کە باسی حیزب و دیدەکانی حیزبەکەی خۆی دەکات، باس لە خودا و پێغەمبەر و ئەسحابە و سەرجەمی کەلەپووری دینی بەموقەدەسکراو بکات و لەو کاتەشدا باس لە مێژووی دین و چییەتی موقەدەسەکانی دەکات، باس لە حیزب و گروپە سیاسییەکەی خۆی و سەرکردەکانی بکات. بەمەش ئەگەری تەکفیرکردنی ڕای جیاواز و دیدی جیاواز، بەتایبەتی دیدی نادینی، گەورەتر و فراوانتر دەکاتەوە و فەزایەک دروست دەکات تیایدا بۆ قسەکردن پێویست بێت ڕوخسەت لە هەڵگران و نوێنەرانی ئەو موقەدەسانە وەر بگیرێت. لە چەند ساڵی ڕابردوودا چەندان جار دەرکەوتە جیاوازەکانی ئەم دۆخەمان لە کوردستاندا بینی و ئەو مەترسییانەمان بۆ دەر کەوت چۆن ئەم پرۆسەی بەسیاسیکردنە بەرفراوانەی دین و چۆن پرۆسەی دروستکردنی ئەو لەشکرە لە کادر و چالاکەوانی دینیی گەنج و دروستکردنی ئەو فەزا دینییە پڕ توندوتیژی و فشارە ڕەمزی و ناڕەمزییە، دۆخێکی دروست کردوە خەریکە خودی کۆمەڵگا خۆی لە فەزایەکەوە بۆ ئاڵوگۆڕی بیروبۆچوون و ئەرگومێنتی جیاواز، دەگۆڕێت بۆ ئامرازێکی گەورەی سانسۆرکردن. شتێک لە عەقڵیەتی ئەم هێزە دینییانەدا بە ناوی ڕێژەگراییەوە بوونی نییە، هیچ جۆرە پەیوەندییەک لەنێوان "هەقیقەت" و "ڕا"دا نابینن،

توانای جیاکردنەوەی فەزای گشتییان لە فەزای تایبەتی و موتڵەقەکانی ناو ژیانی تاکەکەسی و لە ژیانی گشتی نییە. مەترسیی ئەم ستراتیژیەتە ئیخوانییەی بەدینیکردنی سیاسەت و بە سیاسیکردنی دین لەم خاڵەدایە، واتە لەوەدایە هەوڵی ئەوە ئەدات کۆمەڵگا خۆی بکات بە هێزێکی سانسۆرکەر بەسەر هەموو دەنگێکەوە جیاواز لە دەنگە دینییەکانی ئەوان و هەڵگری موقەدەسێک جیاواز لە موقەدەساتی ئەوان. بەمەش پانتایی ئازاد بۆ گۆڕینەوەی ئەرگومێنت و بیروبۆچوونی جیاواز بە ڕادەیەکی ترسناک بچووک و بەرتەسک دەکەنەوە و لەشکرێک لە چالاکەوان دروست دەکەن کە لە ڕێگای بڵاوبوونەوەیان بەناو کۆمەڵگادا و چاندنیان لە هەموو شوێنێکدا، کاریان گۆڕینی کۆمەڵگا بێت بۆ ماشێنێکی گەورەی سانسۆرکردن.

بە بۆچوونی من مەترسیی دۆخێکی لەو بابەتە لەوەدا نییە کە دین بەسیاسی کراوە، مەسەلەکە هەر لەبنەڕەتەوە پەیوەندیی بە بەسیاسیبوونی دین خۆیەوە نییە، چونکە دین دەتوانێت بەسیاسی ببێت و ببێت بە یەکێک لە گەمەکەرەکانی ناو کایەی سیاسەت، بەڵکو پەیوەندیی بەوەوە هەیە ئاخۆ دین چ سیاسەتێک دەکات، دەبێت بە کام سیاسەت، بە چ شێوەیەک و لە کام ڕێگاوە دەبێت بە سیاسەت؟ چۆن لەناو کایەی دەرەوەی سیاسەت و لەناو فەزای گشتیدا وەک هێزێکی سیاسی دەجووڵێتەوە؟ بەناوی چییەوە سیاسەت دەکات و چ پەیوەندییەک لەنێوان سیاسەت و موقەدەسدا پێشنیار دەکات؟ بەکورتی مەسەلەکە هەر لە بنەڕەتەوە پەیوەندیی بەوەوە هەیە داخۆ هێزە دینییە سیاسییەکان چۆن مامەڵەی

موقەدەسەکانی خۆیان دەکەن، چۆن مامەڵە لەگەڵ هەقیقەتدا دەکەن، کاتێک ئەم هەقیقەت و موقەدەسانە لەڕێی چالاکیی سیاسییەوە لە "مەجالی تایبەت"ەوە دەگوازتەوە بۆ "مەجالی گشتی"ی کۆمەڵگا. تا ئەم ساتەی ئێستاشمان بەسیاسیبوونی دین لە کوردستاندا لە هەموو ئەو ئاستانەدا کە لە سەرەوە هێمام پێ کردن، کێشەی گەورەی دروست کردوە. لە سەرێکەوە ئەو دینە بەسیاسی کراوە دینێک نییە بیەوێت ڕا و بۆچوون و دیدی جیاواز قبوول بکات، بەتایبەتی دیدی نادینی و دژەدینی، ئەو دینە بەسیاسیکراوە کە دەچێتە ناو فەزای گشتییەوە وەک موتڵەقێک دەچێت بە هێزێکی گەورەی ناچارکردن و بە کۆمەڵێک ئەحکامی ڕەها و پێشوەخت دانراوەوە، نەک هەر خۆی وەک ڕایەک لەپاڵ ڕاکانی تردا نابینێت، بەڵکو دەیەوێت ڕۆڵی ئەو چوارچێوە گشتییە گەورە و بەزۆرسەپێنراوە ببینێت کە هەموو ڕایەک ناچار بێت لە هەناویدا دروست ببێت و بەپێی خواستەکانی ئەو و لە ڕێگای بەگشتیکردن و قبوولکردنی حەڵاڵ و حەرامەکانی ئەوەوە بدوێت.

ئەم هێزانە گەر لە ئاستی میدیاکانیاندا بانگەشەی قبوولکردنی جیاوازییش بکەن، ئەوا بە شێوەیەکی کردەگی ئەم بانگێشەیەی خۆیان قبوول نەکردوە و شتێک دەکەن ڕێک پێچەوانەی ئەمە. ئەم هێزانە هەر دەمنادەمێک بەناوی پاراستنی موقەدەساتی دینی و بەناوی ئەوەی گوایە زۆرینەی کۆمەڵگا موسڵمانە، داوای بێدەنگکردنی هەموو ئەو دەنگانە دەکەن کە ئەم دیدەیان قبوول نییە، داوای داگاییکردنی ئەوانە دەکەن کە لە دیدی ئەواندا موقەدەساتیان بریندار

کـردوە. بەمـەش داوای پاراسـتنی هەمـوو ئـەو بنەمـا سیاسـییە نادیموکراسـییانە دەکـەن کـە ئـەم شـێوازە لـە بەسیاسـیکردنی دین دەیەوێت دروسـتی بکات. لەمـەش بترازێت تا ئێسـتا هیچ هێزێکی دینـی لـە کوردسـتاندا دینیبوونـی دونیابینییەکـەی خۆی وەک دیاردەیەکی ڕێژەیی نەناساندوە و هەموو دەرکەوتنەکانی دیـدی خـۆی لەنـاو فـەزای گشـتی کۆمەڵـگای ئێمـەدا، وەک دەرکەوتنـی موقەدەسـێکی ئاسـمانی نیشـان داوە و بـە نـاوی کۆمەڵێـک "سـەوابیتی دینـی" نەگـۆڕەوە دواوە. "کۆمەڵێـک سـەوابیت" گوایـە ناکرێـت بگۆڕدرێـن و نابێـت دەسـتیان بـۆ ببرێت و نابێت ڕەخنە بکرێن. بەکورتـی دینی بەسیاسـیکراو لـە کوردسـتاندا دینێکە بە زۆربەی پێداویستییە گرنگەکانـی ژیانی دیموکراسـی ناکۆکە، دینێکە سیاسـەتێکی نادیموکـراس بەرهـەم دەهێنێت و دەپارێزێت، لەسـەر بە موتڵەقکردنی موقەدەسـەکانی کار دەکات و لەشـکرێکیش لـە چالاکەوانـی تـووڕە دروسـت دەکات هەمـوو ڕەخنەیـەک لـە دیـن وەک کوفـر و وێرانکردنـی موقـەدەس وێنـا دەکات. تاکـە شـتێک ئـەم شـێوازە لـە دینـی سیاسـی نارێژەیی و نادیموکـراس لە دیموکراسیەتدا دەیبینێت "حوکمـی زۆرینە"یـە، چونکـە پێیـان وایـە زۆرینـەی کۆمەڵـگا موسـڵمانە و ئەوانیش هەڵگری ویسـت و خواسـتی ئـەو زۆرینـە موسـڵمانانەن. بۆیـە دەتوانـن و دەیانەوێت بەنـاوی خواسـت و ویسـتی ئـەم زۆرینەیـەوە هـەم بدوێـن و قسـە بکـەن، هـەم دەزگاکانی دەوڵـەت و کایـە جیاوازەکانی کۆمەڵگا بەڕێوە ببەن و ئاراسـتە بکـەن. هـاوکات هەمـوو ڕێکەوتنێکـی کۆمەڵایەتـی لـە وڵاتەکـەدا لەسـەر بنەمـای سـەپاندنی دیـدی ئـەو "زۆرینـە" گریمـان کـراوە دەبینـن و پێیـان وایـە ڕێککەوتنـی کۆمەڵایەتـی

بەگشتی و دیموکراسیەت بەتایبەتی مانای سەپاندنی دیدی ئەو زۆرینەیە بەسەر هەموو کۆمەڵگادا.

بۆ نیشاندانی مەترسییەکانی گەورەکانی ئەم دیدە دەمەوێت کەمەکێک لەسەر شوێن و جێی "حوکمی زۆرینە" لە دیموکراسیەتدا بدوێم و ئەو ڕاستییە سادەیە نیشان بدەم کە کورتکردنەوەی دیموکراسیەت بۆ "حوکمی زۆرینە"، نەک تەنها بەدحاڵیبوون و تێنەگەیشتنێکی خراپ و ناڕاستە لەدیموکراسیەت، بەڵکو ئەم دیدە دەربڕی تێگەیشتنێکی فاشییانەیە بۆ دیموکراسیەت.

## دیموکراسیەت و ستەمگەری زۆرینە

ئەوەی زۆرێک لە ئیسلامییەکانی کوردستان بە شێوەیەکی بەردەوام بەر گوێی کۆمەڵگای ئێمەی دەخەن، ئەوەیە کە ئەم کۆمەڵگایە ٩٥٪ی موسڵمانە، بۆیە دەبێت ڕێز لە ویستی ئەم زۆرینە گەورەیەی کۆمەڵگا بگیرێت. وەستانێکی ڕەخنەگرانە لەسەر ئەم ڕێژەیە و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی کارێکی هێجگار پێویست و گرنگە. تێبینی یەکەم لەسەر ئەم ڕێژەیە ئەوەیە کە ڕێژەیەکی مەزەندەکراوە، گشتگیرییەکە پشتی بە هیچ لێکۆڵینەوە و زانیارییەکی کۆنکریت نەبەستوە. تا ئەو شوێنەی من ئاگادار بم هیچ کەس و لایەنێک لە کوردستاندا ڕاپرسی لەسەر بڕ و ڕادەی دینداری و بێدینی لە کوردستاندا نەکردوە، تا بزانین خەڵک چەندی ئیماندارە و چەندیش بێئیمان. گەر شتێکی لەو بابەتەش ڕوو بدات، دەبێت حیساب بۆ ترسی خەڵک لە وەڵامدانەوەیەکی ئاشکرا و ڕاستەوخۆی پرسیاری دینداری و بێدینی، بکەین. بەتایبەتی

لەپاڵ بەهێزبوونی پرۆژەی ئیخوانی و سەلەفی لە کوردستاندا و لەپاڵ گەورەبوون و بەرفراوانبوونی ژمارەی ئەو کەس و لایەن و دەزگایانەدا کە ئامادەن زۆر بەئاسانی حوکمی تەکفیرکردنی ئینسان لە کۆمەڵگای ئێمەدا بدەن.

ڕەنگە ئەم ڕێژەی موسڵمانبوونە کۆمەڵگای ئێمەدا لەوەدا ڕاست بێت کە لەسەر تەسکەرە و دەفتەرنفووس و دۆکۆمێنتە ڕەسمییەکانی تری وڵاتی ئێمە نووسراوە کە ئیسلام دینی هەڵگرەکەیانە، بەڵام کەسێک خۆی و دەوروبەرەکەی نەخڵەتێنێت، ئەو ڕاستییە سادەیە دەزانێت کەس بە تەسکەرە و دەفتەرنفووس و دۆکۆمێنتی ڕەسمی نابێت بە ئیماندار و بێئیمان. دینداری بە بوون و نەبوونی دۆکۆمێنت ناسەلمێندرێت، بەڵکو بە دڵ و دەروون و هەستکردن دەسەلمێت، هەر هێزێک پەنا بۆ تەسکەرە و ناسنامە ببات بۆ باسکردنی دین، هەم فێڵ لە خۆی و هەم فێڵ لە کۆمەڵگا و هەم فێڵ لەو دینەش دەکات کە گوایە بەرگری لێ دەکات. لەمەش بترازێت گەر تەنانەت وای دابنێین ئەو ڕێژەیە کە تەسکەرە و دەفتەرنفووسەکان باسی دەکەن ڕاستە و وای دابنێین مادام لەوێدا نووسراوە خەڵک موسڵمانە، کەواتە هەموویان موسڵمانن. ئەودەم لە دۆخێکی وادا ئەو پرسیارەی دەبێت لە خۆمانی بکەین ئەوەیە: ئایا ئەم زۆرینەیە چۆن و بە چ مانایەک موسڵمانن؟ دین چ مانایەکی بۆ هەریەکێک لەوان هەیە و چ شوێن و جێیەک لە ژیانیاندا داگیر دەکات؟ ئایا دین چ ڕۆڵێک دەبینێت لە تێڕوانینیاندا بۆ خۆیان و بۆ کۆمەڵگا و بۆ دونیا؟ تاچەند دەیانەوێت ژیانیان لەپاڵ دیندا ڕێک بخەن و تا چەند نایانەوێت دین ڕێکخەری ژیانیان بێت؟

کە ئەو پرسیارانە دەکەم دەزانم بەشێکی گەورە و بەرچاوی کۆمەڵگای ئێمە دینی نین بەو مانایەی هەڵگرانی ئەو دوو پرۆژە گەورەیە بە دینی ئەدەن. هەر کەسێک، بۆ نموونە، لە کاتی بانگداندا بە شارەکانی کوردستاندا تێپەڕێت، ئەو ڕاستییەی بۆ دەر دەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆری خەڵک نوێژ ناکەن، ئەوەی تەماشای یانە و سەیرانگە و مەیخانەکانی کوردستان بکات، دەزانێت ژمارەیەکی زۆر لەوانەی لەسەر تەسکەرەکانیان نووسراوە موسڵمان، بەئاشکرا ژیانێکی نادینی بەسەر دەبەن، یان ئەو تێگەیشتنەیان بۆ دین نییە کە هێزە ئیخوانی و سەلەفییەکانی کوردستان بۆ دینیان هەیە. خۆ ئەوەشی تەماشای ڕێژەی هەوادارانی هێزە ئیسلامییەکان خۆیان بکات، بۆی دەر دەکەوێت ژمارەی ئەوانەی بەدوای ئەم هێزانەوەن زۆر کەمترە لە ژمارەی ئەوانەی لە دەوری هێزە عەلمانییەکانی کوردستان کۆ بوونەتەوە، بەشێک لە هۆکاری کۆبوونەوەی ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵکی کوردستان لەدەوری ئەو هێزە عەلمانییە گەندەڵ و نادیموکراسانە، پەیوەندیی بە ترسی ئەو کۆمەڵگایەوە هەیە لەو پرۆژە ئیخوانی و سەلەفییەی لە وڵاتەکەدایە. بەکورتی ئەو خاڵەی من دەمەوێت نیشانی بدەم و بەرگری لێ بکەم ئەوەیە کە گەر ڕاستیش بێت ٩٥٪ی خەڵکی کوردستان موسڵمان بن، ئەمە مانای ئەوە نییە ٩٥٪ خەڵک دەیانەوێت لە کۆمەڵگایەکی دینیدا بژین و سیستمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی دینییان هەبێت و یاساکان و پەیوەندییەکان و شێوازە جیاوازەکانی ژیان دین بیانبات بەڕێوە و بەها و نرخە کۆمەڵایەتییەکانیش بەها و نرخی دینی بن. ئەم ڕێژەیە مانای ئەوە نییە هەموو

کۆمەڵگا دەیەوێت ئەو جلوبەرگە دینییە بپۆشن کە ئیخوانی و سەلەفییەکان بە جلوبەرگی شەرعیی دەزانن، یان ئەو کتێبانە بخوێننەوە کە دینین و سەیری ئەو کەناڵە تەلەفیزۆنە بکەن کە باسی دینیان بۆ دەکات.

خۆ گەر هەنگاوێک زیاتر بچینە پێشەوە و ڕێژەکە کەمەکێک وردتر بکەینەوە، ئەوکات دەکرێت بڵێین ژمارەی ئەوانەی لەناو ئەو ٩٥٪ـەی خەڵکدا کە دیندارن، هەموویان هەڵگری یەک تێگەیشتن نین بۆ دین و هەموویان هەمان داواکاری و هەمان چاوەڕوانییان لە دین نییە و هەمان ڕۆڵیش بە دین لەژیانی خۆیاندا نابەخشن. بەکورتی قسەکردن لەو ڕێژەیە بەو ڕەهاییە نەک تەنها قسەکردنێکی بێمانایە، بەڵکو حیساباتێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژیی زۆر تایبەتی لەپشتە بۆ سەپاندنی پرۆژەیەکی سیاسی و دینی کە "زۆرینەی" بەرچاوی کۆمەڵگا نایەوێت بسەپێنرێت. ئەم تەعمیم و گشتگیرییە سادە و هەڵەیە ئەوەندەی هەندێک ڕاستی گرنگمان لەسەر تەماحی سیاسی هێزە ئیسلامی و خوێندەوارەکانیان پێدەڵێت، ئەوەندە ڕاستییەکی سۆسیۆلۆژیمان پێ ناڵێت کە لەپاڵیدا بزانین کۆمەڵگای ئێمە چی دەوێت و چ تێڕوانین و چاوەڕوانییەکی لە دین هەیە؟ لە ڕاستیدا تاقە شتێک ئەم گریمانەی ٩٥٪ بسەلمێنێت، خودی گریمانەکە خۆیەتی، نەک لێکۆڵینەوە و تێڕامانێکی ورد لەو ڕێژەیە و وردکردنەوەی ڕێژەکە بۆ زانیاریی سۆسیۆلۆژیانەی زانستی لەسەر کۆمەڵگای ئێمە.

خاڵێکی تر لە پەیوەندیدا بەم ڕێژەیەوە بینینی ئەو ڕاستییەیە ئەوانەی بەردەوام باس لەم ڕێژەیە دەکەن کۆمەڵێک کۆمەڵناس و سیاسەتناس و زانای بوارە جیاوازەکانی ژیانی

کۆمەڵایەتی نین، بەڵکو کادرە سیاسییەکانی ئیسلامی سیاسی و هەندێک لە خوێندەوارەکانیانن، ئەو چالاکەوانانەن کە دینیان بە شێوەیەکی خراپ کردۆتە بنەمای سیاسەتکردن و نیازیان وایە کۆمەڵگای ئێمە بکەن بە ئامرازێکی گەورەی سانسۆرکردن بەسەر خۆی و بەسەر دەنگە نادینی و دژەدینییەکانەوە. لە هەموو ئەمانەش بترازێت ئەوەی دەڵێت کۆمەڵگای ئێمە ٩٥٪ی موسڵمانە، دەیەوێت بەناوی زۆرایەتییەکی ڕەهاوە قسە بکات، قسەکردنیش بەناوی زۆرایەتییەکی ڕەهاوە قسەکردنێکە لە فاشییەتەوە نزیکە نەک لەدیموکراسیەتەوە.

دیموکراسیەت شێوازێکە لە حوکمڕانی، کورت ناکرێتەوە بۆ حوکمی زۆرینە بەتەنها. لە تیۆرەی دیموکراسیەتدا، بۆ نموونە، لای جۆن ستیوارت، یەکێک لەو خاڵە سەرکی و گرنگانەی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە باس دەکرێت، مەترسیی دروستبوونی "ستەمگەری زۆرینە"یە، واتە مەترسیی گۆڕانی "زۆرایەتیی دیموکراسییانەیە" بۆ "زۆرایەتییەکی ستەمگەر". لە سەردەمی جۆن ستیوارت میلەوە هەست بە مەترسیی ئەوە کراوە کە شێوازی دیموکراسییانەی حوکمڕانی ئەگەری دروستبوونی جۆرێک لە ستەمگەری نوێ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت کە مەترسیی "ستەمگەری زۆرینە"یە. بۆیە هەر لە سەردەمی ئەم نووسەرەوە داوای کۆمەڵێک میکانیزم و ڕێگری دەستووریی کراوە کە نەهێڵێت دەسەڵاتی زۆرینە ببێت بە دەسەڵاتێکی ستەمگەر، یان ببێتە هۆکاری دروستبوونی "دیکتاتۆریەتێکی نوێ" لەژێر چەتری دیموکراسییدا. ئەمە وای کردوە تیۆرەی

دیموکراسیەت لە سەردەمی جۆن ستیوارت میلەوە سەرقاڵی ئەوە بێت سنوورەکانی دەسەڵاتی زۆرینە دەستنیشان بکات و ئەو بەند و خاڵ و پرنسیپانە بەئاشکرا بناسێنێت کە زۆرینە بۆی نییە بیانگۆڕێت و دەسکارییان بکات. لە هەموو دۆخێکدا دەسەڵاتی زۆرینە نابێت بێڕێزی بەرامبەر بە کەمینە بکات و نابێت ڕا و بۆچوونەکانی کەمینە بەهەند وەر نەگرێت، زۆرینە بۆی نییە ئەوەی دەیەوێت بەبێ حیسابکردن بۆ ماف و ویست و ئازادی کەمینەکان بیسەپێنێت و خۆی چی بە ڕاست زانی ئەوە بکات. ئەوەشی کە نابێت هیچ زۆرینەیەک بە هیچ جۆرێک دەستی بۆ ببات مەسەلەی مافە دەستوورییەکانی تاکەکەس و گروپەکانە، مافی ئازادی بە هەموو شێوەکانیەوە، بە مافی بوون یان نەبوونی دینەوە، مافی سەربەخۆبوون و مافی بوونی ژیانی تاکەکەسی تایبەت و پارێزراو و دەستبۆنەبراو. ئەمە جگە لە مافی یەکسانبوون لە بەردەمی یاسادا بۆ هەمووان، دیندار و بێدین و هەژار و دەوڵەمەند، نێر و مێ هتد... پاراستنی ئەم مافانە و ڕێگرتن لە دیکتاتۆریەت و ستەمگەری زۆرینە وای کردوە هەموو سیستمێکی دیموکراسی پێویستی بە دەستور یان ڕێککەوتنێکی کۆمەڵایەتی هەبێت، مافەکانی هەمووانی پێشوەخت ڕێک خستبێت، بۆ ئەوەی مەودا بە زۆرینە نەدرێت چۆنی ویست وا دەسکارییان بکات و چۆنی ویست وا حوکمڕانی بکات.

لە ڕاستیدا جۆن ستیوارت میل و زۆر نووسەری تری بواری تیورەی دیموکراسیەت تەنها کێشەیان لەگەڵ "زۆرینەی سیاسیدا" نییە، واتە تەنها لە دروستبوونی ستەمگەریی سیاسیی زۆرینە ناترسن، بەڵکو ترسێکی زۆرتر و گەورەتریشیان لە

"زۆرینەی ئەخلاقی" هەیە. واتە ترسیان لەو ستەمگەرییە هەیە کە دەشێت زۆرینە بە ناوی پاراستنی ئەخلاقی کۆمەڵگاوە لەسەر تاکەکەسەکان پیادەی بکات. جۆن ستیوارت میل لەم ڕووەوە دەنووسێت: "پاراستنی ئینسان لە زۆرینەی سیاسی بەتەنها بەس نییە، بەڵکو پێویستە ئینسان لە بیروبۆچوون و هەست و نەستە باڵادەستەکانیش بپارێزرێت. پێویستە ئینسان لەو مەیلەی کۆمەڵگا بپارێزێت کە دەیەوێت بیروبۆچوون و کردەوەکانی کۆمەڵگا وەک یاسای ئەخلاقی بەسەر ئەوانەدا بسەپێنێت کە نایانەوێت پەیڕەویان بکەن، کۆمەڵگا بۆیە ئەمە دەکات بۆ ئەوەی ڕێ بگرێت لە دروستبوونی هەر جۆرێک لە تاکەکەس و هەر شێوازێک لە بەتاکەکەسبوون کە لەگەڵ ڕاوبۆچوونی ئەخلاقیی زۆرینەدا نەگونجێت." بەکورتی میل پێی وایە ئەرکی دیموکراسیەت بریتییە لە ڕێگرتن لە "سەپاندنی ئەو مۆدێلە ئەخلاقییەی کە زۆرینە باوەڕیان پێیەتی بەسەر هەمواندا".(٥).

لێرەوە ئـەوەی پێویسـتە ئیسـلامییەکانی کوردسـتان وازی لێ بهێنن: مەسـەلەی قسـەکردنە بـە نـاوی هەمـوو یـان زۆرینەی کۆمەڵـگاوە، قسـەکردنە بەنـاوی "موقەدەسـاتی زۆرینــە" "ڕا و بۆچوونــی زۆرینــە" و "ئەلاقــی زۆرینــە" و هتــد... هەمــوو قسـەکردنێکی ڕەهـا بـە نـاوی ئـەو زۆرینانـە سـتەمگەرییەکی نوێمـان بـۆ دروسـت دەکات، بـەڵام سـتەمگەرییەک لـە ڕێگای سـندوقەکانی دەنگدانـەوە. ئیسـلامییەکان دەبێـت لـە هەمـووان زیاتـر ڕێـزی ئـەو پرنسـیپە بگـرن کـە نابێـت زۆرینـە هەمـوو بڕیـارەکان بـدات، ئـەوان گـەر تەنهـا سـەیری پەرلەمانـی کوردسـتان خـۆی و سـەیری شـوێن و جێـی خۆیـان و

بزووتنـەوەی گـۆڕان لـەو پەرلەمانـدا وەک کەمینـە بکـەن و شـوێن و جێی پارتـی و یەکێتییش وەک زۆرینەیەکی پەرلەمانی ببینـن، دەبێـت لـەوە تێبگـەن دەشـێت چ جـۆرە سـتەمگەرییەکی گـەورە لـە پشـتی حوکمـی ڕەهـای زۆرینـەوە ئامـادە بێـت.

## دینی خۆنماییشکەر

پێشـتر وتـم دیـن لـە کوردسـتاندا بـەرەو ئـەوە دەڕوات لـە دوو جـۆری سـەرەکیدا دەر بکەوێـت. جـۆری یەکەمیـان ئـەو بەسیاسـیکردنە نادیموکراسـییەی بەردەوامـی دینـە کـە لاپەڕەکانـی پێشـوودا باسـم کـرد و ئەمەشـم وەک پرۆژەیەکـی ئێخوانـی ناسـاند، ئێسـتا دەمەوێت باس لە پرۆژەی دووهەمیان بکەم کە پرۆژەی "نماییشـکردن و نیشـاندانێکی بەرچـاو زەقی دیندارییـە لـە فـەزای گشـتی"دا. مەبەسـتم لەمـەش پـرۆژەی سـەلەفییەتی دینییـە لـە کوردسـتاندا. بـە شـێوەیەکی گشـتی ئـەم پرۆژەیـە پرۆژەی بەرجەسـتەکردن و نیشـندانی ئاشـکرای تێگەیشـتنێکی دۆگمایـی و داخـراوی دینـە لەنـاو فـەزای گشـتیدا و هەوڵدانـە بـۆ سـەپاندنی ئـەم تێگەیشـتنە دینییە بەسـەر ئاسـتە جیاوازەکانـی ژیانـی کۆمەڵایەتیدا. لە ڕاسـتیدا سـەلەفیەتی دینـی بـەو شـێوازە وەهابییـەی ئەمـڕۆ گرتویەتییـە خـۆی، دژ بـە بەشـێکی هێجگار گـەورە و گرنگـی مێژووی ئیسـلام خۆشـیەتی، دژ بەو مێژووەی کە ئیسـلامی لەگەڵ فیکر و فەلسـەفە و شـیعر و جوانـی و داهێنـان و ڕۆحانیەتێکـی قووڵـدا کـۆ کردۆتـەوە و گونجانـدوە. ئـەم سـەلەفیەتە لـە شـەڕێکی دەسـتەویەخە و هەمەلایەندایـە لەگـەڵ هەمـوو ئـەو ڕووکارانـەی ئیسـلامدا کـە دیـن تەنهـا بـۆ کۆمەڵێـک ئەحکامـی دینیـی سـادە و کۆمەڵێـک

لێکدانەوەی حەرفی تێکستە دینییەکان کورت ناکاتەوە، بەڵکو وەک شارستانیەتێکی فرەدەموچا و فرەدەرکەوت دەبینێت. لەڕاستیدا ئەم سەلەفیەتە پرۆژەی گرگنکردن و بێڕۆحکردن و تەحنیتکردنی دینە.

ئەگەرچی سەلەفییەکان خۆیان وەک بزووتنەوە و کەسایەتی و ڕێبازی ناسیاسی دەناسێنن و دین لە شێوازی مۆدێلێکی ئیستیعرازیی تایبەتی دینداریدا نمایش دەکەن، بەڵام لە هەر هەلومەرجێکدا توانای ئەوەیان هەبێت ئەو دیندارییە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەی بڵاوی دەکەنەوە، بگۆڕن بۆ پرۆژەیەکی سیاسی، درێغی ناکەن و درێغیشیان نەکردوە. لەم ڕووەوە ئەزموونی سەلەفییەکانی میسر باشترین نموونەی ئامادەگیی هێزە سەلەفییەکانن بۆ ئەم جۆرە وەرچەرخانە. بە درێژایی قۆناغی حوکمڕانی حوسنی موبارەک، سەلەفیەکانی میسر خۆیان وەک هێزێکی ناسیاسی دەناساند و وەک هێزی ناسیاسی کە خەریکی بڵاوکردنەوەی دیندارین کاریان دەکرد، بەڵام کە موبارەک لە کەوتن نزیکبووەوە لە ماوەیەکی کەمدا خۆیان گۆڕی بۆ هێزێکی سیاسیی ڕێکخراو و نزیکەی ٢٠ لە سەدی دەنگەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەو وڵاتەیان برد.

بە هەرحاڵ ئەوەی من لێرەدا دەمەوێت نیشانی بدەم ڕەهەندە سیاسییەکانی سەلەفیەت نییە، بەڵکو ئەو ڕۆحە ئیستیعرازی و خۆنمایشکارەیە کە سەلەفییەکان بە دین و دینداریی دەبەخشن. خاڵی سەرەکی لەم ڕۆحە خۆنمایشکار و ئیستیعرازییەدا ئەوەیە کە دینداری لێرەدا پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە ناوەوەی ئینسان و بە دۆخێکی

ڕۆحـی و ویژدانیـی پێگەیشـتوو و بـە قووڵاییيەكـی دەروونـی تاكەكەسـیی تایبەتـەوە نییـە، بەڵكـو، بـە پلـەی یەكـەم، چالاكیـی خۆدەرخسـتن و خۆنماییشـكردنێكی نەرجسـییانەیە لەنـاو فـەزای گشـتیی كۆمەڵـگادا. سـەلەفیەت ئەوەنـدەی سـەرقاڵی ڕووكاری دەرەوەی دینـە و ئەوەنـدەی دەیەوێـت دینـداری ببینرێـت و نماییـش بكرێـت، ئەوەنـدە لـە خەمـی ئـەوەدا نییـە دیـن لـە نـاوەوەڕا ئینسـان دروسـت بكاتـەوە و قووڵایـی و دەوڵەمەندییەكی ڕۆحی بـە ئینسـان ببەخشـێت. بـەم كارەشـیان سـەلەفیەت دیـن كـورت دەكەنـەوە بـۆ توێكڵێكـی دەرەكـی و بـۆ شـێوازێكی دەركەوتـن و خۆنماییشـكردن و خۆنیشـاندان لەنـاو پێكەوەبوونـی كۆمەڵایەتیدا. ئەركـی سـەرەكیی ئـەم توێكڵكاری و ڕووكەشـییە دەرەكییـە جیاكردنـەوەی ئینسـانی بەنـاو ئیمانـدارە لـە ئینسـانی بێئیمـان، دروسـتكردنی سـنوورێكی بینـراوە لەنێوان دین و نادینـدا، جیاكردنـەوەی ئـەوەی دەشـێت و دەبێت هەبێت، لەوەیـە كـە ناشـێت و نابێتهەبێت. سـەلەفییەت هەوڵـی گۆڕینـی دیـن بـۆ دیوارێـك ئـەدات كـە بتوانێـت دیـن لـە نادیـن جیـا بكاتـەوە، ئـەم دیـوارەش دەبێـت ببینرێـت و هەسـتی پـێ بكرێـت. بەمـەش لەڕاسـتیدا دیـن كـورت دەكاتـەوە بـۆ دەركەوتەكانـی لەنـاو فـەزای گشـتیدا. ئـەم سـتراتیژەیە وا دەكات ئـەم جـۆرە لـە دینـداری سـەلەفییانە ئـەو گرنگییـە گەورەیـە بـە جلوبەرگـی دینـی و حیجـاب و ڕیـش و سـمێڵ و خۆداپۆشـین و سـەرجەمی شـتە ڕووكەشـەكانی تـری ئیمانـداری بـدات، كـە ڕۆژانـە وەك بەشـێك لـە دیمەنـە گشـتییەكانی نـاو فـەزای گشـتیی شـارەكانی كوردسـتان دەیانبینیـن. ڕاسـتیش ئەوەیـە چەنـدە دیـن كـورت

ببێتەوە بۆ ڕووە ڕووکەشەکانی دین، لە کاکڵەوە ببێت بە توێکڵ، ئەوەندە لە ڕووی ڕۆحی و دەروونی و ویژدانییەوە لاواز و بێهێز دەبێت و هەموو مانا قووڵەکانی دینداری لەدەست ئەدات. ئەمەیە وای کردوە یەکێک لە دوژمنە هەرە گەورەکانی سەلەفیەتی دینی، ئەو ڕێبازە دینییانەی تر بێت کە گرنگی بە ڕەهەندە ڕۆحییەکانی دین دەدەن تا بە ڕووکارە دەرەکی و ڕووکەشەکانی دین و خەریکی ناوەوەی مرۆڤن نەک دەرەوەی مرۆڤ.

ئەو هەڵە گەورەیەی سەلەفییەت دەیکات ئەوەیە، کە پێیان وایە دەرکەوتنی دین لە فەزای گشتیدا و نیشاندانی دینداری لە ڕێگای توێکڵە ڕووکەش و دەرەکییەکانی دینەوە، کۆتایی بە کێشە گەورەکانی کۆمەڵگا دەهێنێت. بۆ نموونە زۆرێک لە سەلەفییەکان پێیان وایە گەر ئافرەت حیجابی لەسەر کرد، ئیتر کێشەی پەیوەندیی نێوان نێر و مێ، مەسەلەی شوێن و جێی ئافرەت لە کۆمەڵگادا، یەکسانیی نێوان پیاو و ئافرەت، چارەسەر کراوە یان چارەسەر دەکرێت. پێیان وایە کە حیجابپۆشی کۆتایی بە قەیرانی دروستکردن و تێکدان و بە قەیرانی بونیادی دەسەڵاتگەر و پاتریارکییانەی خێزان دەهێنێت، ئەو قاتوقڕییە جنسییەی کە هەیە و ئەو دواکەوتنە ترسناکەی تەمەن و توانای شووکردن و ژنهێنان و لەویشەوە دواکەوتنی دەستپێکردنی ژیانێکی سێکسیی ڕێکخراو، بە داپۆشینی قژ و بە ڕیشهێشتنەوە و بە بەهێزکردنی ڕۆحیەتی ئیستیعرازیی دین لە کۆمەڵگادا، کۆتایی پێ دێت. ئەمانە پێیان وایە گەر منداڵانی قوتابخانەی سەرەتاییان فێری ئەوە

کرد قورئـان دەرخ بکـەن، ئیدی ئـەو منالانـە ڕێگای خۆیـان لەنـاو دونیـای ئاڵۆزی ئەمڕۆدا دۆزیوەتـەوە و دەشـتوانن وەک بوونـەوەری سـەربەخۆ و ئـازاد ژیانـی خۆیـان ڕێک بخـەن. ئەمانـە لەباتیـی ئـەوەی منـدالان فێـری زمانـە زیندووەکانـی دونیا و فێری پەروەردەیەکی دیموکراسییانەیان بکەن، فێریـان بکەن دونیا لەگـەڵ کەسـان و بیروبۆچوونـە جیاوازەکانی نـاو ژینگـە کۆمەڵایەتییەکـەی خۆیـدا دابـەش بکـەن، دینداریيەکـی بێقوولاییـان پێ ئەدەن دابڕاو لـە پێداویسـتییە هـەرە سـادەکانی ژیانیـان و داخـراو بـە ڕووی هـەر کرانەوەیەکـی ئینسـانی و کولتووریـدا.

سـەلەفیەتی دینـی بانگەشـەی بوونـی یـەک شـێواز لـە دینـی ڕاستەقینە و یـەک شـێواز لـە دینداری و یـەک جۆر لێکدانـەوەی دروسـت بـۆ دیـن دەکات، ئەویـش دینداریـی نـەوە کۆنەکانـی سـەرەتای ئیسـلامە لـە کۆمەڵـگای بەدەویـی ئـەو ڕۆژگارە دێرینـەدا. ئـەم پێداگرتنـە لەسـەر بوونـی یـەک دینـی ڕاسـتەقینە و یـەک لێکدانـەوە و یـەک شـێوازی درسـتی دینـداری، لـە زۆر ڕووەوە سـەرلەنوێ بەرهەمهێنانـەوەی ئـەو کولتـوورە سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگییەیـە کـە لەگـەڵ ئەزموونـی تاکـە حیزبی و تاکە سـەرۆکی و تاکە ئایدیۆلۆژیادا لـەم ناوچەیـەدا باڵادەسـت بـوو، تاکچێتییـەک لـە نیـو سـەدەی ڕابـردوودا ئـەو هەمـوو زیانـە گەورانـەی بـە مێژووی میلەتـان و کۆمەڵگاکانـی ئـەم ناوچەیـە گەیاند و بەردەوامیش دەیگەیەنێت. بـەم مانایە، بەتایبەتـی لـە ڕووە سیاسـی و فەرهەنگییەکەیـدا، سـەلەفیەتی دینـی گەڕانـەوە نییـە بـۆ دینـی ڕاسـتەقینە، یـان بـۆ "سـەلەفی

سالح" وەک خۆیان دەڵێن، بەڵکو دیوی ئەودیوی سەرجەمی ئەو دید و تێڕوانین و ئاکارە تۆتالیتارییانەیە کە بەشێکی ناشیرینی مێژووی سەدەی بیستەمی ئەم ناوچەیەیە. لە ڕووی مێژووییەوە ناکرێت بەهێزبوونی سەلەفیەتی دینی لەم ناوچەیەدا لە ئابووریی نەوت و لهتێکەڵبوونی دۆلاری نەوتی سعودی بە وەهابیزم، واتە بە دیدێکی دینی گشتگیری نادیموکراس و داخراو و دۆگمایی دابڕین. ڕۆڵی ڕێبازی وەهابیزمی سعودی و ڕۆڵی دۆلارەکانی نەوتی سعودییە لەم ڕووەوە هێجگار ڕۆڵێکی گەورە و بەرچاوە.

بە بۆچوونی من کێشەی سەلەفیەتی دینی، وەک کێشەی تێڕوانینی ئیخوانەکان بۆ دین، لە سیاسیبوون و ناسیاسیبوونیدا نییە، چونکە من باوەڕم وایە هەموو گروپێکی دینی پێویستە ئەگەر و توانای ئەوەی لەبەردەمدا بێت خۆی وەک گروپێکی سیاسییش نمایش بکات، کێشەکە، وەک وتم، لە بەسیاسیبوونی دیندا نییە، کێشەکە لەوەدایە سەلەفیەتی دینی ئەو شێوازە میللییەی دین، واتە ئەو دینە شەعبییە، وێران دەکات کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئامادەیە. دیدنێکی میللی کە بە حوکمی میللیبوونی کراوەتر و پەیوەندیدارتر و ئینسانیتر و لە ڕاستیشدا عەقلانیترە لەو دینەی کە سەرقاڵی خۆنماییشکردن و خۆ ئیستعرازکردنە لهناو فەزای گشتیی کۆمەڵگادا. بە درێژاییی چەندان سەدە چەندان گروپی هێزی دینیی جیاواز، چەندان گروپی نادینی و تەنانەت دژەدین، توانیویانە لەپاڵ یەکدا و لەپاڵ ئەم دینە میللیەدا بژین، بەلام بالادەستبوونی سەلەفیەت لە کۆمەڵگای

ئێمـەدا ڕێگای ژیـان لـە بەردەمـی هەمـوو ئـەو گروپانـەدا دادەخـات کـە هەمـان تێگەیشـتنی ئەوانیـان بـۆ دیـن نییـە. لـەم ڕووەوە ئەزموونـی بێمافکـردن و بێڕیزیکـردن بەرامبـەر بـە هەمـوو ڕێبـازە دینییەکانـی تـر، جیـاواز لـە ڕێبـازی وەهابـی، لـە وڵاتێکـی وەک سـعودیەدا، ئەزموونێکـی هێجگار تاڵـە و شـایانی دووبارەکردنـەوە نییـە لـە هیـچ شـوێنێکی دونیـادا. بەکورتـی دەسـکاریکردنی دینـی میللـی بـە ئاراسـتەی کردنـی بـە دینێکـی سـەلەفی ئـەو مەترسـییە گەورەیەیـە کـە سـەلەفیەت ئەمـڕۆ لەسـەر کۆمەڵگای ئێمـەی هەیەتـی.

## کێشەی تر

لـە کوردسـتاندا ئـەم دوو شـێوازەی دیـن، کـە باسـمان کـردن، کۆمەڵێـک کێشـەی گەوەیـان هەیـە، لەپێـش هەمووشـیانەوە کێشـەی ئەوەیـە کـە ناتوانـن لەگـەڵ ئازادیـدا بژیـن، ناتوانـن ئینسـان وەک گەورەتریـن بەهـا تەماشـا بکـەن، ناتوانـن لەگـەڵ داهێنانـدا تەبـا بـن، ناتوانـن دەسـت نەبـەن بـۆ ژیانـی تاکەکەسـیی ئینسـان، لـەوە تێناگـەن دینـی ڕاسـتەقینە لـە ڕابـردووەوە ناهێنرێـت، تەماحـی ئەوەیـان نەبێـت هەمـوو کێشـەکانی بوونـی ئینسـان لـە کۆمەڵگا هاوچەرخەکانـدا بـە دیـن چارەسـەر بکـەن. بەکورتـی کێشـەی سـەرەکیی ئـەم دوو شـێوازە لـە دیـن لـە کوردسـتاندا لەوەدایـە کـە ناتوانـن دیـن وەک پارچـە و بـەش و ڕەهەندێـک لـە ڕەهەندەکانی ژیـان، نـەک وەک هەمـوو ژیـان، وێنـا بکـەن. ناتوانـن ئـەوە قبـووڵ بکـەن کـە نادیـن وەک دیـن بەشـێکە لـە خولیـای ئینسـان و بەشـێکە لـە مێژووی کۆمەڵگاکانـی دونیـا.

ئەم شێوازە لە دینی سیاسی و لە سەلەفیەت لە کوردستاندا نایانەوێت ئەو ڕاستییە ببینن کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دونیای ئەمڕۆ فیکری تر و دیدی تر و بیرکردنەوەی تر و شێوازی بەرخوردی تر و عەقلانیەتی تر پێویستن، کە هەموویان یان زۆربەیان لە دەرەوەی دین و لە دەرەوەی دینداریيدا دروست دەبن و دەژین. نایانەوێت ئەوە ببینن هەموو ئەم شتانە نەک تەنها بۆ چارەسەکردنی بەشێکی هێجگار زۆری کێشە و گرفتەکانی ئینسان و کۆمەڵگا هاوچەرخەکانی ئەمڕۆ پێویستن، بەڵکو بۆ تازەکردنەوەی دین خۆشی پێویستن، بۆ کردنی دین بە بەشێکی گرنگی ڕەهەندی ناوەکیی مرۆڤی ئیماندار خۆشی پێویستن، بۆ بەخشینی قووڵاییەکی دەروونی و ویژدانی و ئەخلاقیو ڕەمزی بە دینداری پێویستن، هەر وەک چۆن بۆ کردنی دینی سیاسی بە دینێکی سیاسیی دیموکراس پێویستن. هەموو ئەوانە بۆ دروستکردنی باوەڕێک پێویستن بتوانێت ئینسان لە ڕووی ڕۆحییەوە دەوڵەمەند بکات، نەک هەژاریٚ بکات، بیکات بە مرۆڤێکی ئازادتر و لێبوردەتر، نەک بە کادرێکی سیاسی و دینیی وا، کە سڵ لەوە نەکاتەوە بە ناوی خودا و پێغەمبەرەکانەوە بدوێت و کێی ویست و چۆنی ویست وا کەسانی دەوروبەری تەکفیر بکات. ئەوەی ئەمڕۆ لە دونیای ئێمەدا پێویستە بێدینی نییە، بەڵکو ئەو جۆرەیە لە دین و دینداری کە تەماحی ئەوەیان نییە لە ڕێگای دروستکردنی وێنەیەکی ناشیرن و ناقۆڵای دینەکانی تر و شێوازەکانی تری بیرکردنەوە و داهێنان و ژیانەوە، وێنەیەکی

جـوان و فریشـتەیی و موقـەدەس بـۆ خۆیـان دروسـت بکـەن. بەکورتی جۆرێک لـە تێگەیشـتن بـۆ دیـن و جۆرێک لـە دینداری پێویسـتن کـە موقەدەسبوونی خـۆی لەسـەر لەعنەتکردن لەوانی تـر دروسـت نـەکات.

## دەرەنجام

ئـەو شـێوازە تازانـەی دیـن و دینـداری کـە لـە دونیـای ئێمـەدا خەریکـە بالادەسـت دەبـن تێکەڵێکـە لـە ئیسـلامی ئیخوانـی و ئیسـلامی سـەلەفی. ئیسـلامی ئیخوانـی دەیەوێـت تـا سـەر ئێسـقان سیاسـی بێـت و ئیسـلامی سـەلەفییش دەیەوێـت رۆحێکـی شـانۆیی و خۆنماییشـکەری ئیسـتیعرازی بـە دیـن ببەخشـێت. ترسـناکیی ئـەم دوو شـێوەیە لـە ئیسـلام لـە بوونـی خۆیانـدا نییـە، چونکـە تـا ئەمـرۆش بەشـێکی کەمـی کۆمەڵگای ئێمـە بـاوەڕی سیاسـی و فەرهەنگـی و دینـی و کۆمەلایەتیـی خـۆی بـەم دوو شـێوە تایبەتـەی بەگەڕخسـتنی دیـن لـە کۆمەڵگای ئێمـەدا بەخشـیوە. ترسـناکیی ئـەم دوو شـێوەیەی دین ئـەو کات دەسـت پێ دەکات کـە ئیسـلامی میللی، ئیسـلامی نـاو دڵـی ئیمانـدار و خوداناسـە سـادە و ئاسـاییەکانی دونیـای ئێمـە، دەکەوێتـە ژێـر کاریگەریـی ئـەو دوو تێگەیشـتنەی تـرەوە بـۆ ئیسـلام. ئـەو کاتـەی ئیسـلامی میللـی، کـە تـا ڕادەیەکـی زۆر ئیسـلامێکی هێمـن و کـراوە و لێبوردەیـە، لەگـەڵ ئـەم دوو پرۆژە ئیسـلامییەدا تەماهـی دەکات و دەبێتـە هەڵگـری هەمـان ڕۆحیەتـی سیاسـی و هەمـان ڕۆحیەتـی خۆسـەپاندن و توورەبـوون و دروسـتکردنی گـرژی و قیڕەقیـڕ و هاتوهـاوار و نەفرەتکـردن لـە نادیـن و دژەدیـن. ئیسـلامی میللـی ئیسـلامێکە بەشـێکە لـە

پەیوەندیی هاوسێیەتی و بەدەمەوەچوون و مشوورخواردنی کۆمەڵایەتی، بەڵام ئەو دوو ئیسلامەی تر هەڵگری پرۆژەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی تایبەتن، کە تا ئەم ساتەش ناکۆکن بە سەرەتا هەرە سەرەتاییەکانی دیموکراسیەت و قبووڵکردنی جیاوازی و بەدەمیەکەوەچوونی کۆمەڵایەتی. دەڵێم ئەو کاتەی ئەم دوو شێوازەی ئیسلام لەوەدا سەر دەکەون ئیسلامی میللی وێران بکەن، یان وەک ئیسلامی خۆیانی لێ بکەن، واتە هەم بیکەن بە ئیسلامێکی سیاسی و هەم بە ئیسلامێکی خۆنماییشکەر و ڕووکەشی ئیستیعرازیی کۆنەپارێز، ئەودەم دین لە دونیای ئێمەدا دەبێتە دیاردەیەکی مەترسیدار، دەبێتە هەڕەشەیەکی گەورە لە هێمنی و ئارامیی کۆمەڵایەتی، دەبێتە مەترسی لەسەر ئاساییشی گشتیی ئەو کۆمەڵگایە.

ئیسلامی ئیخوانی و ئیسلامی سەلەفی تەنها ئیسلامی میللی وێران ناکەن لە ڕێگای سەپاندنی لێکدانەوە و بۆچوونەکانی خۆیانەوە بەسەر ئەو ئیسلامییە میللییەدا، بەڵکو لە ڕێگای بەموقەدەسکردنی دینەوە هەموو وزەیەکی ڕەخنەیی و هەموو ئازادییەکی ڕاستەقینە لە بیرکردنەوەدا دەکوژن. ئەم دوو جۆرە لە ئیسلام کێشەیان لەگەڵ ئەوەدا نییە ڕۆژانە دەیەها نیوەخوێندەواری دینیی دونیای ئێمە پڕ لە ئەفسانە و جەهل و خورافەت بکەن، بەڵام گەر هاوشێوە عەلمانییەکانیان، واتە نیوەخوێندەوارێکی عەلمانی، شتێکی خراپی لەسەر دین وت، ئیتر شوتی ئینزار لێ ئەدەن و هێزی ڕێکخراوەیی و میدیاییی خۆیان وا جۆش ئەدەن وەک ئەوەی دۆخی ناکاو هاتبێتە کایەوە. لەباتیی ئەوەی خۆیان لەگەڵ هەلومەرج و ژینگەیەکی فرەدەنگ و فرەئارا و فرەبیرکردنەوەدا بگونجێنن، پەلاماری

هەموو ئەو دەنگانە ئەدەن کە بە زەوق و ویستی ئەوان باسی دین ناکات. سپینۆزا لە کتێبی: "*نامەیەک دەربارەی لاهوت و سیاسەت*" بەرگری لە تێزێکی سادە، بەڵام هێجگار گرنگ، دەکات، کە پێم وایە هێزە ئیسلامییەکانی دونیای ئێمە پێویستیان بەوەیە گوێی لێ بگرن. بە بۆچوونی سپینۆزا تەندروستی و پێشکەوتن و ڕزگاربوونی کۆمەڵگاکان لەوەدایە ئازادیی بیرکردنەوەیان تیادا پیادە بکرێت، ڕووبەری ئەم پیادەکردنەش تا بێت گەورەتر بکرێت و بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بکرێتەوە. چونکە کوشتنی ئەم ئازادییە بەناوی پاراستنی موقەدەساتەوە، کوشتنی توانای داهێنان و تازەکردنەوە و پێشکەوتنە لە ئینساندا.

ئەگەرچی لە یەکەمین تەماشاکردندا جۆرێک لە ناکۆکی لەنێوان ئیسلامی ئیخوانی و ئیخوانی سەلەفیدا دەر دەکەوێت، بەڵام دواجار بەو پێکهاتە و عەقلییەت و خەیاڵە سیاسی و فەرهەنگییەی ئەمڕۆکە ئەم دوو هێزە هەیانە، ئەوان لە ئاستی قووڵدا نەک بەیەکتری ناکۆک نین و نابن، بەڵکو کاری یەکتری تەواو دەکەن. لای هەردوو هێزەکە ئیسلامی سیاسی، یان دینی بەسیاسیکراو، لەسەر عەرشی ئیسلامێکی کۆمەڵایەتیی کۆنەپارێز و داخراو و ئیستیعرازی دادەنیشێت و بە هەردووکیشیان دینێکی پڕ تەماحی تۆتالیتاریانەی گشتگیر و نادیموکراس و دەسەڵاتگەر دروست دەکەن.

لە ڕاستیدا ئەو ئیسلامەی ئەم دوو هێزە بە جیا لەیەکتر و بەیەکەوە بەرهەمی دەهێنن، ئیسلامێکە دابڕاو لە سەرجەمی ئەو پێشمەرجانەی کە دین دەکەنە ئامرازێک بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی کراوە و دیموکراس و ڕێزگر لە

جیاوازی و بەرگریکەر لە مافی لەویترنەچوون. بەم عەقڵیەت و تێگەیشتنەوەی ئەمڕۆیانەوە تێکەڵکردنی پرۆژەی ئیخوانی و پرۆژەی سەلەفیەت بەیەکتری جگە لەمەبەستە سیاسییەکانیان، مەبەستێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی ترسناکیشیان هەیە: مەبەستی گۆڕینی کۆمەڵگا بۆ دەزگایەکی گەورەی سانسۆری دینی و کردنی ئەم سانسۆرەش بە سانسۆری باڵادەست لە وڵاتدا. لێرەدا سانسۆر چیتر کردەیەک نییە ئەم یان ئەو دەزگا، یان ئەم یان ئەو هێزی سیاسی بەتەنها پێی هەڵسێت، بەڵکو دەیانەوێت کۆمەڵگا خۆی پێی هەڵبستێت و کۆمەڵگا خۆی سنووری ئازادییەکان و مافەکان و جیاوازییەکان بە سنوورەکانی دین تەسک بکاتەوە. ئەمەش کۆمەڵگا لەفەزایەکی پڕ دید و بۆچوون و خەون و چاوەڕوانیی جیاوازەوە دەگۆڕێت بۆ ڕووبەرێکی گەورە و هەمەلایەنی دیسپلین و سانسۆرکردن. ئەم جۆرە شێوازەی دینی بە سیاسیکراو ڕووبەرە مەدەنییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەگۆڕن بۆ ڕووبەری دینی و بەمەش دای دەخەن بە ڕووی دینی تر و نادین و دژەدیندا.

# سەرچاوەکان

١- دەربارەی نارسیسمی دینی، بڕوانە:
Marjorie J. Cooper and Chris Pullig (2012). !Number One! Does Narcissism Impair Ethical Judgment Even for the Highly Religious?. Journal of Business Ethics 2012.

٢- دەربارەی پەیوەندییەکی کەلەپووری بە ڕابردووەوە بڕوانە:
محمد عابد الجابری (١٩٩٣). نحن والتراث، قراوات معاصرهفی تراثنا الفلسفی. المرکز الثقافی العربی. الطبعە: ٦. بیروت، لبنان.

٣- ڕەنگە بەناوبانگترین کتێبێک لە سەدەی بیستەمدا لەم بارەیەوە نووسرابێت، کتێبی: "غەرەب زەدەیی" جەلای ئال ئەحمەد بێت. ئەم کتێبەی ئالی ئەحمەد کتێبێکی ئایدیۆلۆژیی بێپەردەیە، زیاتر لەبەیاننامەی هێزێکی سیاسی دەچێت کە بڕیاری دابێت بە گژ هەموو شتێکی خۆرئاواییدا بچێتەوە، تا کتێبی

ڕۆشنبیرێک بیەوێت داوەرییەکی هێمن و لەسەرخۆی فیکر بکات. کتێبەکە هێرشێکی گەورەیە بۆ سەر هەموو ئەو ڕۆشنبیرانەی بێ گرێی دەروونی فیکری خۆرئاوا وەک مەرجع دەبینن، ئالی ئەحمەد ئەم بینینە لە دیدێکی ناسیۆنالیستیی کولتوورگەراوە وەک نەخۆشی و بیماری وێنا دەکات.

٤- بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر دەرکەوتە جیاوازەکانی دین لەمڕۆی کوردستاندا، بڕوانە کتێبی: "دین و دونیا"ی من.

٥- بڕوانە:

John Stuart Mill (1969). On Liberty. Harvard University. p. 9.

# کورد و پرۆژە گەورەکان

## سەرەتا: چوار پرۆژەی سەرەکی

کۆمەڵگای ئێمە هاوسێ و هاوسنووری کۆمەڵێک دەوڵەتی گەورەی ناوچەکەیە، ئەوەی لەو دەوڵەتانەدا ڕوو دەدات و ئەوەی کۆمەڵگای ئێمە دەیەوێت و داوای دەکات، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەیەکەوە هەیە. "ئێستای" ئێمە و "ئێستای" ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگا دراوسێیانەمان بە سەدان شێوەی جیاواز بەیەکدییەوە گرێ دراون. بۆیە زۆر جار بۆ تێگەیشتن لە بەشێک لە دیاردە و ڕووداوەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمە، تێگەیشتن لە ویست و پلان و ستراستیژیەتی ئیشکردنی دەوڵەتە دراوسێکانمان پێویستە. لە فیکری کۆمەلایەتی و سیاسیدا ئەدەبیاتێکی گەورە هەیە پێ لەسەر گرنگیی شوێن و جێی و هەڵکەوتی جیۆسیاسی و جیۆکولتووریی کۆمەڵگاکان دادەگرێت لە بەدەستهێنانی ئەم یان ئەو داخوازی و پیادەکردنی ئەم یان ئەو مۆدێلی سیاسیدا. هەموو خوێنەرێکی سادە ئەو ڕاستییە دەزانێت کۆمەڵگایەک دراوسێی وەک سعودییە و ئێرانی هەبێت، لە دۆخێکی جیاوازدا دەبێت لەوەی سویسرا

و فەرەنسای وەک دراوسێ هەبێت. میلەتێک لەناو فەزایەکی سیاسی و کولتووریی وەک "ئەورووپای یەکگرتوو"دا بژی، جیاوازە لەوەی لەناو ئەو فەزا دینی و تائیفی و توندوتیژەدا بژی کە بۆ نموونە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئامادەیە. ئەم ئاستەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی ئاستێکی گرنگە و زۆر جار بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵێک دیاردەی ناو کۆمەڵگایەکی دیاریکراو دەبێت تەماشای ئەم ئاستە ناوچەییە بکرێت و لەو ئێستا تایبەتانە بڕوانرێت کە لەو ناوچەیەدا لەئارادان.

هەموو کۆمەڵگاکانی دونیا، بە کۆمەڵگای ئێمەوە، بەشێکن لە ژینگەیەکی نەتەوەیی و ناوچەیی و جیهانیی فراوان. بوونیشیان لەناو ئەم ژینگەیەدا مانای لەناو زیاد لە ئاستێکی بوونی کۆمەڵایەتی لەو کۆمەڵگایانەدا. ئاستێکیان ئەو ئاستە ناوەکییەیە، کە بۆ نموونە لە وتاری یەکەم و دووهەمی ئەم کتێبەدا باسم لێ کردن، واتە ئاستی ئامادەگیی بەرخۆری و دین وەک ئایدیۆلۆژیا یان دیاردەیەکی جەماوەری و سیاسیی بەرفراوان، بەڵام ئاستی دووهەمیان ئەو ئاستە ناوچەییەیە، واتە ئیقلیمییەیە، کە ئەم کۆمەڵگایە تیایدا ئامادەیە و بەشێکە لە گرفت و تەحەدا و ئەگەر و مژدەکانی. وەک چۆن ئەو سیستەمە ئیقلیمییەش بەشێکە لە یەکەیەکی گەورەتردا، کە لە زمانی زانستە سیاسییەکاندا پێی دەگوترێت "نیزامی نێودەوڵەتی"wolrd order. من لەم وتارەدا هەوڵ ئەدەم لە ئاستە ناوچەییەکە بدوێم و بۆ ئەم مەبەستەش چوار لەو پرۆژە سیاسییە ناوچەییە گەورانە ئەدوێم کە لە ناوچەکەدا ئامادەن و هەریەکێکیشیان پەیوەندیی ڕاستەوخۆ

و ناڕاستەوخۆیان بە کۆمەڵگای ئێمەوە و بە هەندێک لە دیاردەکانی ناوییەوە هەیە.

ئەگەرچی هۆکاری سەرەکیی پشتی نووسینی ئەم وتارە ئەو دەنگەدەنگ و هاتوهاوارە زۆرەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بوو لەسەر مژدەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی و ئەو هەڕەشانەی بە شێوەی وەرزی و بێ هیچ ئەنجامێکی پۆزەتیڤ، بە دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە دەیکات، دەڵێم ئەگەرچی ئەمە هۆکارە ڕاستەوخۆکەی نووسینی ئەم وتارەیە، بەڵام مەبەستی وتارەکە شیکردنەوەی ئەم هۆکارە سەرەتاییە تێدەپەڕێنێت و دەیەوێت وێنەیەکی ئێستایی ئەو ناوچەیە بکێشێت کە کۆمەڵگای ئێمە لەناو هاوکێشە ئاڵۆزەکانیدا ئامادەیە.

هەر چاودێرێکی ڕاستەقینە لە ئێستای ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕابمێنێت، ئەو ڕاستییەی بۆ دەر دەکەوێت کە کۆمەڵێک پرۆژەی سیاسیی گەورە لە ناوچەکەدا ئامادەن و هەریەکێکیش لەو پرۆژانە بکەرێکی بەهێز یان چەند بکەرێکی بەهێز هەڵگریانە. من لێرەدا چوار پرۆژەی سەرەکی لەو پرۆژانە لەیەکتری جیا دەکەمەوە: پرۆژەی تورکی، پرۆژەی ئێرانی، پرۆژەی سعودی-خەلیجی و پرۆژەی ئەمەریکی-ئیسرائیلی. دەکرێت پرۆژەی "بەهاری عەرەبی"یش بخەینە پاڵ ئەم پرۆژانە، بەڵام لەبەر ئەوەی پرۆژەی ئەم بەهارە تا ئێستا قووڵاییە ئیقلیمی و لە هەندێک دۆخیشدا تەنانەت شووناسە ناوەکییەکەشیان ڕۆشن نییە، بۆیە بە پێویستمان نەزانی لێرەدا باسی بکەین. لە نووسینی ئەمڕۆدا باس لە

پرۆژەی تورکی دەکەم بەو هیوایەی لە داهاتوودا باس لە سێ پرۆژەکەی تریش بکەم.

**پرۆژەی یەکەم**

**تورکیا و خەونی سەرلەنوێ بەئیمپراتۆریەتبوون**

تورکیا دەوڵەتێکی گەورە و بەهێزی ناوچەکەیە و تا دێت ڕۆڵێکی گەورەتر و فرەلایەنتریش لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەگێڕێت. ئەوەی لە سیاسەتی تورکیای دە ساڵی ڕابردوو ڕابمێنێت، گۆڕانێکی بەرچاو لە پەیوەندیی نێوان تورکیا و وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تێبینی دەکات، بەتایبەتی لەگەڵ دراوسێکانیدا. تورکیا لەم دەیەی دواییدا، بە پێچەوانەی ساڵانی هەشتا و نەوەدەوە، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران و عێراق و سووریادا بەهێز کردوە، بە شێوەیەکی چالاکتر و فراوانتر بە مەسەلەی فەلەستینەوە خەریکە، پەیوەندیی بەهێزی لەگەڵ سعودیە و وڵاتانی کەنداودا هەیە، هەوڵی نزیککردنەوەی وڵاتە عەرەبییەکان و ئیسرائیل ئەدات لەیەکتری و سەرقاڵی دروستکردنی پەیوەندییە لەنێوان لایەنە ناکۆکەکانی ناو لوبنان و ئەو دەوڵەتانەی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە کێشەکانی ناو لوبنانەوە هەیە. لە ساڵی ٢٠٠٧یشەوە پەیوەندییەکانی هەم بە هەرێمی کوردستانەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و هەم مەسەلەی کورد لە ناوخۆی تورکیاشدا لەگۆڕاندایە. بەشی هەرەزۆری ئەم گۆڕانکارییانەش پەیوەندییان بە بەدەسەڵاتگەیشتنی "پارتی عەدالەت و پێشکەوتن"ەوە هەیە، کە لە ساڵی ٢٠٠٢ تا ئێستا لە تورکیادا دەسەڵاتی بەدەستە. شارەزایانی تورکیا، ئەم

سیاسـه‌ته نوێیـه‌ی حكومه‌تـی توركیـا به‌رامبـه‌ر بـه ناوچه‌كـه بـه سـێ هـۆكاری سـه‌ره‌كییه‌وه گـرێ ئـه‌ده‌ن. یه‌كه‌میـان گه‌ڕانـی توركیایـه بـه‌دوای سـه‌رچاوه‌ی وزه‌دا بـۆ به‌هێزكردنـی ئابوورییه‌كـه‌ی و به‌رده‌وامیـدان بـه گه‌شـه و په‌ره‌سـه‌ندنی ئـه‌و ئابوورییـه. دووهه‌میـان هه‌وڵدانـی توركیایـه بـۆ پاراسـتنی ئاسایيشـی نه‌ته‌وه‌یی خۆی، به‌تایبه‌تی كۆنترۆڵكردنی مه‌سـه‌له‌ی كورد و پاراسـتنی توركیا لـه ده‌ره‌نجامـه چاوه‌ڕواننه‌كراوه‌كانی گه‌شـه‌كردنی ئـه‌م مه‌سـه‌له‌یه. سێهه‌میش هه‌وڵدانی توركیایه بۆ بوونـی بـه زلهێزێكی ناوچه‌یی و بـه هێزێكی جیهانیی به‌هێز و یه‌كێک لـه گه‌مه‌كـه‌ره گه‌وره‌كانـی دونیـا.(١) ئـه‌م سـێ ڕه‌هه‌نـده گرنگه بـه قووڵـی ده‌ستنیشـانی سیاسـه‌تی توركیا لـه ناوچه‌كـه‌دا ده‌كـه‌ن و هێڵـه گشـتییه‌كانی پـرۆژه‌ی توركیـا بـۆ ناوچه‌كـه ده‌ستنیشـان ئه‌كـه‌ن.

### له هێزی زبره‌وه و بۆ هێزی نه‌رم

بـه درێژاییـی مێـژووی خـۆی په‌یوه‌ندییه‌كانـی توركیـا بـه ناوچه‌كـه‌وه په‌یوه‌ندییه‌كـی ئاڵـۆز بـووه، لـه‌م په‌یوه‌ندییانـه‌دا توركیـا هـه‌م په‌نـای بـۆ "هێـزی ڕووت" بـردووه، ئـه‌وه‌ی بـه ئینگلیـزی پێـی ده‌گوترێـت "هـارد پـاوه‌ر"، بـۆ نموونـه لـه مه‌سـه‌له‌ی قوبـرس و لـه هه‌ڕه‌شـه‌ی سـه‌ربازی لـه سـووریا لـه سـاڵی ١٩٩٨و ناچاركردنـی ئـه‌و وڵاتـه بۆ ده‌ركردنـی عه‌بـدوڵا ئـۆچ ئالانـی سـه‌رۆكی پارتـی كرێكارانـی كوردسـتان (په‌كه‌كـه). لـه ڕاسـتیدا یه‌كـه‌م فشـاری گـه‌وره‌ی توركیا بۆ سـه‌ر سـووریا سـاڵی ١٩٨٧ ده‌سـتی پێ كرد، ئه‌ودەم تورگوت ئۆزالی سـه‌رۆک

وەزیرانی تورکیا هەوڵی دا لە ڕێگای کەمکردنەوەی بەشی سووریا لە ئاوی دیجلە و فورات فشار بخاتە سەر سووریا و ڕێگە لەوە بگرێت سووریا ڕێ بە چالاکیی پەکەکە لە سووریا و لوبناندا بدات، بەڵام ئەم سیاسەتەی ئوزال سەری نەگرت، ئەوە بوو تورکیا دواجار لە ساڵی ١٩٩٨دا هێزێکی سەربازیی گەورەی هێنایە سەر سنوورەکانی سووریا و ئەو وڵاتەی ناچار کرد دەست لە یارمەتیدانی پارتی کرێکارانی کوردستان، پەکەکە، هەڵبگرێت. سووریا عەبدوڵا ئۆچ ئالانی ناچار کرد سووریا بەجێ بهێڵێت و دواتر لە شاری نایروبیی پایتەختی کینیا لهشوباتی ساڵی ١٩٩٩دا لەلایەن تورکیاوە دەستگیر بکرێت و بە فڕۆکە بیفڕێننەوە بۆ تورکیا.(٢)

لە ئێستادا تورکیا وازی لە بەکارهێنانی هێزی ڕووت، "هێزی زبر" هێناوە لە پەیوەندیدا بە دراوسێکانیەوە و ئەو شێوازە لە هێز بەکار دەهێنێت کە لە زانستە سیاسییەکاندا پێی دەگوترێت "هێزی نەرم"، بە ئینگلیزییەکەی "سۆفت پاوەر". بە پلەی یەکەم سەردەمی حوکمڕانیی پارتی عەدالەت و پێشکەوتن بە سەردەمی بەکارهێنانی "هێزی نەرم" لە پەیوەندییەکانی تورکیادا بە دەرەوەی خۆیەوە، ناو دەبرێت. ئەم هێزە نەرمەش بریتییە لە هێزی بازرگانی و پەیوەندیی ئاڵوگۆڕی پارەوپوول، بڵاوکردنەوەی کولتوور، بەکارهێنانی پەیوەندیی دینی و ئەتنی و خستنەگەڕی پەیوەندیی دیپلۆماسی لەباتیی هەڕەشە و پەلاماری سەربازی. بەکارهێنانی ئەم ستراتیژیەتە نوێیە لەسەر پرنسیپێکی سیاسیی نوێ دامەزراوە کە تورکیا ناوی ناوە: "پلەی سفری کێشە لەگەڵ

دراوسێکاندا".(٣) پیادەکردنی ئەم سیاسەتە ستراتیژیەتی سەرەکیی وەدیهێنانی ئەو سێ مەبەستە سەرەکییەیە کە لە سەرەوە هێمامان پێ کرد، یانی بە مەبەستی گەیشتن بە وزە، پاراستنی تورکیا لهدەرەنجامەکانی مەسەلەی کورد و هەوڵی تورکیا بۆ بوونی بە گەمەکەرێکی ناوچەیی و جیهانیی گرنگ.

**تورکیا و عوسمانیزمی نوێ**

"عوسمانیزمی نوێ" ئەو ناوەیە کە زۆر جار لە سیاسەتی ئەمڕۆکەی تورکیا دەنرێت، بۆ ئەنجامدانی ئەو سێ مەبەستەی باسمان کرد. لە دیدی تورکەکاندا "عوسمانیزمی نوێ" هەم ڕەهەندی ناوەکی و هەم ڕەهەندەی دەرەکییشی هەیە. ڕەهەندە ناوەکییەکەی لەناو تورکیا خۆیدا لەسەر دروستکردنی "ڕێککەوتنێکی نەتەوەیی" نوێ کار دەکات، کە تیایدا تورکیا خۆی وەک دەوڵەتێکی فرەکولتووری و فرەنەتەوە، بەڵام یەکگرتوو، ببینێت و وێنا بکات. ڕەهەندە دەرەکییەکەشی هەوڵی ئەوە ئەدات تورکیا وەک هێزێکی گەورە و بەهێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا دەر بکەوێت و ببینرێت.(٤)

عوسمانیزمی نوێ سێ ڕەهەندی سەرەکیی هەیە. یەکەم: ئاشتبوونەوەی تورکیا لەگەڵ ڕابردووی ئیسلامی و عوسمانیی تورکیادا، چ لە ناوخۆی تورکیا خۆیدا و چ لە پەیوەندی تورکیادا بە دونیای دەرەوەوە. ئەمەش مانای پێشنیارکردنی شێوازێکی هێمن و نەرم لە عەلمانیەت، ناکۆک بەو شێوە توندڕەوەی کە تورکیای کەمالیزم هەڵگریبو.

هاوکات هەوڵدان بۆ سەرلەنوێ پیادەکردنەوەی کاریگەریی لەسەر ئەو بەشانەی دونیا، کە پێشتر بەشێک بوون لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. ئەمەش مانای دوورکەوتنەوە لەو پێداگرتنە پەرگیرەی کەمالیزم لەسەر تورکبوون دای دەگرت و کرانەوەی تورکیا بە ڕووی فرەشووناسی و فرەکولتووریدا. ڕەهەندی دووهەمی عوسمانیزمی نوێ باوەڕبوونە بە خۆ و گەورەکردنی ئەو هەستەیە کە تورکیا وڵاتێکی گەورە و گرنگە لە ناوچەکەدا، لەم ڕووەوە عوسمانیزمی نوێ خەونی ئەوەی هەیە تورکیا وەک زلهێزێکی ناوچەیی و نێودەوڵەتی وێنا بکرێت و واشی نیشان بدات تورکیا دەتوانێت ڕۆڵی ئەم زلهێزە ناوچەیی و نێودەوڵەتییە لە ئاستی دیپلۆماسی و کولتووری و ئابووری و سیاسیدا ببینێت. ڕەهەندی سێهەمی ئەم سیاسەتە تازەیە باوەشکردنی تورکیایە هەم بە خۆرئاوادا و هەم بە دونیای ئیسلامیدا لە یەک کاتدا، لەمەشدا تورکیا دەیەوێت خۆی وەک "ئەستەمبوڵێکی گەورە" نیشان بدات. وەک چۆن ئەستەمبوڵ پردێکە لەنێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، بە هەمان شێوە تورکیا وەک گشتێک دەیەوێت ببێتە ئەستەمبوڵێکی گەورە لە ناوچەکەدا، ئەمەش لە دیدی دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆکەی تورکیادا مانای دوورکەوتنەوە لە دۆگما ئایدیۆلۆژی و سیاسییە تەقلیدییەکانی تورکیای کەمالیزم و کرانەوە بە ڕووی بەشە جیاوازەکانی دونیادا.(٥)

بۆ پیادەکردنی ئەم پرۆژەیە، تورکیا دەیەوێت نەک تەنها سوود لە شوێنی ستراتیژیی خۆی وەک پردێک لەنێوان ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای دووردا وەر

بگرێت، بەڵکو دەیەوێت سوود لە ڕابردووی عوسمانییانەی خۆی وەر بگرێت و ئەو ڕابردووە وەک سەردەمی برایەتی و دۆستایەتی و هاوسێیەتیی میللەتانی ناوچەکە لەژێر سەرکردایەتیی ئالی عوسمانی تورکدا نیشان بدات. ئاشکرایە ئەم سیاسەتەی تورکیا بە مەبەستی بەهێزکردنی پێگەی ناوچەییی تورکیایە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە ڕاستییشدا گەورەکردن و بەهێزکردنی تورکیایە بۆ ئاستی گەمەکەرێکی جیهانیی بەهێز.

**بازرگانی و بازاڕ و ئاسایش لە ناوچەکەدا**

یەکێک لە دەرکەوتە سەرەکییەکانی سیاسەتی عوسمانیزمی نوێی تورکیا بریتییە لە بەهێزکردنی پەیوەندیی بازرگانی لە ناوچەکەدا و هەوڵدان بۆ بەستنەوەی قووڵی ئابووریی دەوڵەتەکانی ناوچەکە بە ئابووریی تورکیاوە. لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە ئابووریی تورکیا بە پرۆسەیەکی بەرفراوانی بەلیبرالکردندا تێدەپەڕێت و لەمڕۆدا تورکیا پێویستی بە بازاڕی دەرەکی هەیە بۆ گەورەکردن و گەشەپێدانی ئەو ئابوورییە. ئابووریی تورکیا هەندێک جار بە ئابووریی "پڵنگەکانی ئەنادۆڵ" ناو دەبرێت. لە دە ساڵی ڕابردوودا گەڕان بەدوای بازاڕی نوێدا یەکێک بووە لە کۆڵەکە هەرە سەرەکییەکانی سیاسەتی تورکیا لە ناوچەکەدا. لەو ماوەیەدا تورکیا پەیوەندییە ئابوورییەکانی خۆی لە هەموو بوارەکاندا لەگەڵ زۆربەی کۆمەڵگاکانی ناوچەکەدا فراوان کردووە، کۆمپانیا تورکییەکان، بزنسمانە تورکەکان و وەبەرهێنە

تورکییەکان بوون بە بەشێکی گرنگی ئابووریی ناوچەکە. هاوکات تورکیا سنوورەکانی خۆی زیاد لە هەر کاتێک بۆ گەشتیاریی ناوچەکە کردۆتەوە و خەڵکانێکی زۆر لەم ناوچەیەدا دەتوانن بەبێ وەرگرتنی ڤیزا، یان بە وەرگرتنی ڤیزا بە شێوەیەکی ئاسان، سەردانی تورکیا بکەن.

ئامادەگیی ئابوورییانەی تورکیا تەنها دراوسێ هاوسنوورەکانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو لە باکووری ئەفریقادا لە تونس و لیبیادا و لە ناوچەکەشدا وڵاتانی کەنداوی عەرەبی بەشێکی گرنگی ئەو بازاڕانەن کە تورکیا بەخەستی تیایاندا ئامادەیە. بۆ نموونە، لە ناوچەی کەنداوی عەرەبیدا، تورکیا هەم بڕی ئاڵوگۆڕی بازرگانییەکەی بە ڕادەیەکی زۆر گەشەی کردووە، هەم بڕی وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆش لەو وڵاتانەدا. بڕی بازرگانیی تورکیا لەساڵی ١٩٩٨ لەگەڵ وڵاتانی کەنداودا تەنها ١.٦ ملیار دۆلار بووە، بەڵام لە ٢٠٠٩ بەرز بۆتەوە بۆ ١٧.٥ ملیار دۆلار. بە دیوی ئەودیویشدا وڵاتانی کەنداو گەشەیان بە توانای وەبەرهێنانی خۆیان لە تورکیادا.داوە و لە ساڵی ٢٠٠٦دا ئەم وڵاتانە بڕی ١.٧ ملیار دۆلاریان لە تورکیادا خستۆتە گەڕ، بەتایبەتی لە کەرتی کشتوکاڵدا، بۆ بەهێزکردنی توانا ستراتیژییەکانی تورکیا لە بواری بەرهەمهێنانی خۆراکدا. ئەمە جگە لە وەبەرهێنانی سەرمایەی کوێتی لە مەجالی کۆمپانیای تەلەفۆن و بواری خانووبەرە لەناو تورکیا خۆیدا. پەیوەندیی نێوان تورکیا و وڵاتانی کەنداو بە ڕادەیەک گەشەی کردووە تورکیا لە ساڵی ٢٠٠٨دا "بەیاننامەی هاریکاری و پێکەوەکارکردن"ی لەگەڵ

وڵاتەکانی کەنداودا ئیمزا کردوە و لەم ڕێگەیەشەوە تورکیا یەکەمین وڵاتێکی دەرەوەی کەنداو خۆیەتی کە ناونیشانی "شەریکی ستراتیژی"ی لە کەنداودا پێ بەخشراوە. بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە وڵاتانی کەنداو و تورکیا لە ئاڵوگۆڕ و گفتوگۆی بەردەوامدا دەبن لەسەر ئاستی وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتانە.(٦)

ئەم سیاسەتە نوێیە تورکیای لەوە دەر کردووە تەنها شەریکێکی ئابووریی سەرەکی بێت لە ناوچەی کەنداودا، بەڵکو کردووشیەتی بە شەریکێکی سیاسیی ستراتیژئی گرنگی وڵاتەکانی کەنداو. ئەم شەراکەتە سیاسییە تەنها هۆکاری ئابووریی لەپشتەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵێک هۆکاری "ئاساییشی ناوچەیی"شی لەپشتە. سەردانی پادشای سعودیە لە ساڵی ٢٠٠٦دا بۆ تورکیا، یەکەمین سەردانی پادشای ئەو وڵاتەیە بۆ تورکیا بە درێژاییی ٤٠ ساڵی ڕابردوو، دووبارەکردنەوەی هەمان سەردان لهساڵی ٢٠٠٧دا ڕەهەندە ئاساییشییەکانی ئەم پەیوەندییە نوێییەی نێوان تورکیا و وڵاتانی کەنداومان بۆ ڕوون دەکاتەوە. شارەزایەکی بواری سیاسەتی تورکی و سعودی دەڵێت: مەبەست لهو سەردانانە مسۆگەرکردنی هاریکاری و یارمەتیی تورکیایە بۆ "تەوەرەی دەوڵەتە سوننە مەزهەبەکان لە ناوچەکەدا بەرامبەر بە ئێران." (٦) وڵاتانی کەنداو بەگشتی و شانشینی سعودیە بەتایبەتی، تورکیا وەک هێزێکی گەورە دەبینن کە توانای ئەوەی هەیە لەبەرامبەر دەسەڵاتی ئێران لە ناوچەکەدا ئامادە بێت و هاوسەنگییەک

دروست بکات لە ململانێی تائیفیی نێوان دەسەڵاتی شیعە و سوننە لە ناوچەکەدا.

بەڵام ئەم پەیوەندییە تایبەتەی نێوان تورکیا و وڵاتانی کەنداو، تورکیای نەکردوتە دوژمنی ئێران. ڕاستە ململانێیەکی گەورە لەنێوان ئێران و تورکیادا لە ناوچەکەدا لەسەر نفووزی سیاسی هەیە، ڕاستە تورکیا پرۆژە ئەتۆمییەکەی ئێران وەک هەڕەشەیەکی گەورە وێنا دەکات، بەڵام تورکیا کارێکی نەکردووە ئێران بکات بە دوژمنی خۆی. ئێران تا ئێستاش ٢٠ لە سەدی پێداویستیی تورکیا بۆ گازی سروشتی دابین دەکات. لە ساڵانی داهاتووشدا پێداویستیی تورکیا بە وزەی گاز بۆ گەشەدان بە ئابوورییە بەهێزەکەی زیاد دەکات و ئەمەش وا دەکات پێداویستیی تورکیا بە ئێران زیاد بکات و کەم نەکات. ئەمە جگە لەوەی هەم تورکیا و هەم ئێران پێویستیان بە هاریکاریی یەکترییە بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسییەکانی مەسەلەی کورد لەو دوو وڵاتەدا. هاوکات هەم تورکیا و هەم وڵاتانی کەنداو لە گەورەبوونی دەسەڵات و تواناکانی ئێران لە سووریا و لوبنان و بەتایبەتی لە عێراقی دوای پاشەکشەی هێزەکانی ئەمەریکا دەترسن.(٧)

بە شێوەیەکی گشتی گەڕان بەدوای بازاڕی نوێدا بەشێکە لە هەوڵی تورکیا بۆ دۆزینەوەی بازاڕی جیاواز و خۆڕزگارکردن لەوەی کە تەنها پشت بە بازاڕی ئەورووپا ببەستێت، ئەگەرچی تا ئێستاش بازاڕی ئەورووپا گەورەترین بازاڕە کە تورکیا هەناردەکانی خۆی بۆ ڕەوانە دەکات.(٨).

**کولتوور وەک هێزێکی نەرم**

تا ناوەڕاستی سالانی هەشتا بەهێزترین دەوڵەت لە ڕووی کاریگەریی کولتوورییەوە لەسەر کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، میسر بوو، میسر سەرچاوەی گۆرانی و مۆسیقا و فیلم و کتێب و نووسین بوو، بەلام لە پازدە ساڵی ڕابردوودا، بەتایبەتی لەپاڵ سیاسەتی "عوسمانیزمی نوێ"دا، ڕۆڵی کولتووریی تورکیا لە ناوچەکەدا گەشەیەکی گەورە و بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە. سینەمای تورکی، مۆسیقای تورکی و بەتایبەتی تەلەفیزۆنی تورکی، بوون بە سینەما و مۆسیقا و تەلەفیزۆنی بالادەست لە ناوچەکەدا. ئەمەش سیاسەتێکی بەئاگاو ئاراستەکراوی تورکیایە و بەشێکە لەستراتیژیەتی بەهێزکردنی کاریگەرییەکانی تورکیا لە ناوچەکەدا. لە ماوەی دەساڵی ڕابردوودا، بۆ نموونە، لانی کەم چل زنجیرەی تەلەفیزۆنی درێژی تورکی لە جیهانی عەرەبیدا بلاو کراوەتەوە. زنجیرەی تەلەفیزۆنیی "نور" لانی کەم لەلایەن ٢١ ملیۆن تەماشاکەرەوە لە جیهانی عەرەبیدا بینراوە.(٩) زۆر هۆ هەیە وا دەکات ئەم زنجیرە تەلەفیزیۆنانە ئەو هەموو تەماشاکەرەی هەبێت، یەکێک لەوانە ئەو ڕۆڵە پێشکەوتوو و ئەو برە ئازادییەیە کە ئافرەت و گەنجان لەم زنجیرانەدا دەیگێڕن، بە بەراورد بە ولاتانی تری ناوچەکە.

لە وتارێکی گرنگیدا بیریاری سووری (سادق جەلال ئەلعەزم) باس لە گرنگی ئەزموونی ئەمڕۆکەی تورکیا بۆ سەرجەمی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و دونیای ئیسلامی دەکات و گرنگیی ئەم ئەزموونە دەبەستێتەوە بە دروستبوونی

کولتوورێکی سیاسیی نوێ و جۆرێکی تر لە هەڵسوکەوت و پراکتیکیی سیاسی لە تورکیادا. سادق ئەلعەزم باس لەوە دەکات چۆن هێزێکی ئیسلامی بە شێوەیەکی دیموکراسییانە، لە ڕێگای سندوقەکانی دەنگدانەوە، بەهێمنی و بێ خوێنڕشتن، بێ وێرانکردنی سیستمە سیاسییەکە، (وەک لە جەزائیردا ڕووی دا) و بێ سەپاندنی دین و دینداریش بەسەر هەمووان‌دا، حوکمڕانیی گرتە دەست. چۆن ئەم سیستمە قۆناغی دیکتاتۆریەت و پاوانکردنی دەسەڵات و بەسەربازیکردنی دەسەڵاتی تێپەڕاندوە و گەشەی بە پرۆژەی کۆمەڵگای مەدەنی داوە و لە ڕێی ئابوورییەوە لیبراڵ و کەمترگەندەڵ و لە ڕووی سیاسییشەوە کراوەیە. ئەلعەزم ئەزموونی ئەمڕۆکەی گۆڕانکاریی سیاسی لە تورکیادا، بە ئەزموونی گواستنەوەی وڵاتانی وەک ئیسپانیا و یۆنان و پورتوگال و ئیرلەندا بەراورد دەکات، وڵاتانێک کە توانییان پشت بکەنە ڕابردووی فاشی و سەربازیی خۆیان و بگوازنەوە بۆ دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسیی پێشکەوتوو. (١٠) بە بۆچوونی ئەلعەزم ئەزموونی سیاسیی تورکی هێما بۆ جۆرێکی نوێی کولتوور و پراکتیکی سیاسی لە ناوچەکەدا دەکات.

## تورکیا و عێراق

لە ئاستی ئابووریدا تورکیا وڵاتی عێراق وەک دەروازەیەکی گرنگ بۆ پەلکێشان بۆ بازاڕە گەورەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبینێت، ئەمە جگە لەوەی عێراق خۆشی بازاڕێکی گەورەیە بۆ تورکیا. ٢٤ لە سەدی هاوردەی

عێراق لە تورکیاوە دێت، ٢٦ لە سەدی هەناردەی تورکیاش بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە خاکی عێراقدا تێدەپەڕێت.(١١) عێراق هاوکات سەرچاوەیەکی گرنگی وزەیە بۆ ئابووریی تورکیا. لە ئاستی سیاسی و ئەمنییشدا عێراق یەکێکە لەو گەمەکەرە ناوچەییانەی کە لهچۆنیەتیی مامەڵەکردنی مەسەلەی کورد و لە سنووردارکردنی خەون و تەماحەکانی کوردستاندا، دەتوانێت هاوڕا و هاریکاری تورکیا بێت. هیچ شتێک بە ڕادەی سەردانەکەی ئەردۆگان بۆ بەغدا لە مانگی ئازاری ساڵی ٢٠١١دا دەربڕی گۆڕانی سیاسەتی تورکیا نییە بەرامبەر بە عێراق. لەو سەفەرەدا ئەردۆگان یەکەم سەرۆک دەوڵەتی بیانی بوو سەردانی پەرلەمانی عێراق بکات، یەکەمین سەرۆکی سوننی بوو سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی شیعە بکات، یەکەمین سەرۆک وەزیرانی تورکیا بوو سەردانی هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان بکات. هەموو ئەمانەش وەک نووسەرێک دەڵێت "پەیامێک بوو تورکیا ناردی بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە لە خەمی یەکپارچەییی عێراقدایە و هاوپەیمانە لەگەڵ هەموو پێکهاتەکانی عێراقدا". (١٢)

جگە لەو هۆکارانەی سەرەوە، شتێکی دیکە کە وا دەکات تورکیا گرنگی بە عێراق بدات، بریتییە لە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری و تواناکانی ئێران لە عێراقدا. بەم مەبەستە تورکیا لە هەموو ئەو هێزانە نزیک دەکەوێتەوە کە دژایەتیی سیاسەتی ئێرانی لە عێراقدا دەکەن، یان ناکۆکن بە حیساباتی سیاسەتی ئێران لە عێراقدا. نزیکبوونەوەی تورکیا

لە لیستەکەی ئەیاد عەلاوی و لە سیاسییە سوننییەکان بەگشتی، بەشێکە لە پیادەکردنی ئەم ستراتیژە. هەر ئەمە بوو وای لە تورکیا کرد لە ساڵی ٢٠٠٥ هانی سوننەکانی عێراقی دا بەشدار بن لە هەڵبژاردنەکاندا و بایکۆتی نەکەن. هاوکات هاریکاریکردنی تورکیا بۆ سەرۆکی هەرێم و بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان بە هەمان مەبەستە، واتە بەشێکە لە ستراتیژیەتی بەگژاچوونەوەی دەسەڵاتی ئێران لە عێراقدا و هەوڵدانە بۆ ڕێگرتن لە بەهێزبوونی زۆری ئەو کاریگەرییە. لە ئاستی ناوچەییشدا تورکیا و وڵاتانی کەنداو و سعودیە بەیەکەوە لەپەک هاوکێشەی سوننیدا کۆ بوونەتەوە بۆ ڕێگرتن لە فراوانبوونی دەسەڵاتی ناوچەیی ئێران. لە سەرێکی دیکەشەوە هەموو ئەم دەوڵەتە سوننیانە بەستراونەتەوە بە سیاسەتی ئەمەریکاوە لە عێراقدا، ئەمەریکاش وەک ئەو هێزە سوننییانە نایەوێت عێراق ببێتە ئێرانێکی تر لە ناوچەکەدا. لەم وێنە گشتییەدا پارتی دیموکراتی کوردستانیش بەشێکە لەم ستراتیژە و بەتوندی گرێ دراوە بە سیاسەتی تورکیاوە لە عێراقدا.

### تورکیا و کوردی باکوور

کورد لە تورکیادا لە دۆخێکی سەخت و لە بێمافییەکی گەورە و ترسناکدا دەژی، زیندانەکانی تورکیا پڕن لە منداڵ و گەنجان و ئافرەتانی کورد، ڕۆژنامەنووسان و پەرلەمانتارانی کورد دەگیرێن و پەلامار ئەدرێن، هێرشی سەربازی بۆ سەر ناوچە جیاوازەکانی ئەو بەشەی کوردستان هەمەلایەن و ڕۆژانەییە.

بەڵام هاوکات خەڵکی ئەو بەشەی کوردستان لە ڕاپەڕینێکی ڕۆژانەی بێبڕانەوەدان، لە زۆر ڕووەوە دۆخی ئەمڕۆکەی کوردستانی باکوور لە دۆخی ڕاپەڕینی فەلەستینییەکانی سالانی نەوەد و دووهەزار دەچێت. تورکیا لە سەرکوتکردنی کورد و هەوڵدان بۆ کۆتاییهێنان بەو دۆخە، سڵ لهپەنابردن بۆ هێزی ڕووت ناکاتەوە و سڵ لەوەش ناکاتەوە سنوورەکان ببەزێنێت و لە کوردستانی باشووریشدا ناوچە کوردنشینەکان بۆمباران بکات و دانیشتوانەکانیان ئاوارە بکات. بەکورتی لهئاستێک لە ئاستەکاندا دەوڵەتی تورکی لە شەڕێکی دەستەویەخەی ڕۆژانەدایە لەگەڵ خەڵکی کوردستاندا. ئەوەی شوێنی گومان نییە ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی لە دە ساڵی ڕابردوودا پارتی عەدالەت و پێشکەوتن لەسەر دەسەلاتە و عەبدوڵا ئۆچ ئالانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە زینداندایە، ناسیۆنالیزمی کوردی لەو بەشەی کوردستاندا و لە دەرەوەی کوردستاندا لەناو کۆچبەرانی ئەو بەشەی کوردستاندا بەهێز بووە، لاواز نەبووە.(١٣) ئەمڕۆ وزەیەکی سیاسیی گەورە و گرنگ لەو بەشەی کوردستاندا ئامادەیە و ئیرادەیەکی سیاسیی گەورە و کۆڵنەدەر، کار دەکات.

خاڵێک کە ئەمڕۆ نە دەوڵەت و نە کۆمەڵگای تورکی ناتوانن نکوڵیی لێ بکەن، مەسەلەی بوونی ناسیۆنالیزمی کوردی و بوونی "مەسەلەی کورد"ە، لە تورکیادا بە یەکێک لە کێشە سەرەکییەکانی ئەو وڵاتە و بە یەکێک لەو تەحەدا گەورانەی ڕووبەڕووی تورکیا بووەتەوە. نووسەری ئیسرائیلی (ئۆفرا بینگیۆ)، شارەزا لە بواری مەسەلەکانی عێراق و کورد و

تورکیادا، باس لەوە دەکات تەنانەت تا ساڵی ١٩٩٦ تورکیا نکوڵیی لە بوونی شتێک بە ناوی مەسەلەی کورد لە تورکیادا دەکرد، تا ئەوکاتەش کەسێکی وەک نەجمەدین ئەربەکانی سەرۆک وەزیران دەیگوت: تورکیا کێشەی کوردی نییە، بەڵکو کێشەی تیرۆریزمی هەیە.(١٤) بەلام ئەوەی ئەمڕۆ بە ڕێبوارییش ڕێی بکەوێتە تورکیاوە، دەزانێت کێشەی کورد گەورەترین کێشەی ئەو وڵاتەیە، تا ئەو ڕادەیەی عەبدوڵا گولی سەرۆکی تورکیا چەند ساڵێک لەمەوبەر دانی بەوەدا نا کە لە ڕۆژی دروستبوونی دەوڵەتی تورکییەوە، مەسەلەی کورد گەورەترین کێشەی تورکیا بووە.(١٥)

هاوکات لە سەردەمی تورگوت ئوزالەوە لە سەرەتای سالانی نەوەدەوە گۆڕانێک لە سیاسەتی تورکیدا بەرامبەر بە کورد بەدی دەکرێت، ئەم گۆڕانە لە سەردەمی دەسەلاتدارێتیی پارتی عەدالەت و پێشکەوتندا زیاتر دەبینرێت. یەکێک لە دیارترین ئاماژەکانی ئەو گۆڕانە ئەوەیە ئەردۆگان نەک تەنها ئینکاریی بوونی کێشەی کورد لە تورکیادا ناکات، بەڵکو لە سەفەرێکیدا بۆ دیاربەکر لە ساڵی ٢٠٠٥دا وتی تورکیا دەبێت دان بە هەڵەکانی ڕابردوویدا بنێت و ئەو ڕاستییە ببینێت کە "کێشەی کورد کێشەی هەموو کەسێکە. کێشەی منیشە". لە ساڵی ٢٠٠٨ تا ٢٠١٠ دەسەلاتدارانی تورکیا باسیان لە "کرانەوە کرد بە ڕووی کوردا". لەم ماوەیەدا هەندێک گۆڕانکاریی بچووک ڕوویان دا، بەلام هاوکات ئەردۆگان لەدوای ٢٠١٠ خۆی زیاتر و زیاتر لە چارەسەری کێشەی کورد لە تورکیادا ئەدزێتەوە و تا ئەو ڕادەیەی لەو پێشنیارانەدا کە لە ئازاری

ساڵی ٢٠١٠دا ناردی بۆ پەرلەمانی تورکیا بۆ داڕشتنەوە و دەسکاریکردنی دەستوری تورکیا، کە نکوڵی لە بوونی کورد دەکات، ئەردۆگان هیچی لەسەر کورد نەوت. لە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠١١شدا ئەردۆگان هەڵوێستێکی توندی بەرامبەر بە کورد نیشان دا.(١٦) بەکورتی تورکیا تا ئێستا نەیتوانیوە مەسەلەی کورد لەو وڵاتەدا بە شێوەیەکی قابیلی قبووڵکردن چارەسەر بکات، جگە لە بەدوژمنکردنی پەکەکە، لە ساڵی ١٩٩٠ تا ساڵی ٢٠١٠ تورکیا پێنج پارتی سیاسیی تری یاساغ کردوە کە لە پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی تورکیادا بەشدارییان کردووە.

**تورکیا و هەرێمی کوردستان**

ئەوەی لە چەند ساڵی ڕابردوودا تێبینی دەکرێت گۆڕانی سیاسەتی تورکیایە بەرامبەر بە حکومەتی هەرێم، تورکیا لەم چەند ساڵەدا وازی لە دوژمنایەتیکردنی حکومەتی هەرێم هێناوە و هەوڵێکی گەورەی داوە بۆ نزیکبوونە لە دەسەڵاتدارانی کوردستان، بەتایبەتی لە پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەگەرچی زۆربەی جار ئەم نزیکبوونەوەیە وا دەر دەکەوێت وەک ئەوەی پەیوەندییەکی شەخسیی نێوان ئەردۆگان و بنەماڵەی بارزانی بێت. بە هەرحاڵ تێگەیشتن لەم پەیوەندییە تایبەتە دەبێت لەناو سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا، واتە دروستنەکردنی کێشە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا، ببینرێت. بە بۆچوونی من تورکیا سێ وێنەی سەرەکی لەسەر هەرێمی کوردستان و حکومەتەکەی هەیە. یەکەم: تورکیا هەرێم وەک

بازاڕێکی گەورە بۆ ساغکردنەوەی شتومەک و بەگەڕخستنی سەرمایەی تورکی دەبینێت، مەبەستی لەمەش بەستنەوەیەکی توندی ئابووریی کوردستانە بە ئابووریی تورکیاوە، تا ئەو شوێنەی ئابووریی کوردستان نەتوانێت بەبێ تورکیا هەناسە بدات.

دووهەم: تەماشاکردنی کوردستان وەک چاڵەنەوت و چاڵەغازێکی گەورە و سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ وزە. من پێشتر هێمام بەوە کرد کە تورکیا لە دەیەکانی داهاتوودا پێویستییەکی زۆری بە وزە دەبێت بۆ گەشەکردنی ئابووری، ئەوەشم وت تورکیا لەم ڕووەوە پێویستییەکی گەورەی بە غازە سروشتییەکەی ئێران هەیە. لەسەر هەمان هێڵ تورکیا لە دەیەکانی داهاتوودا پێویستیی بە نەوت و غازی کوردستان دەبێت و دەیەوێت سوودی تەواو لەم سەرچاوە نزیکە وەر بگرێت. بۆ ئەم مەبەستەش چەندان کۆمپانیای تورکی لە بواری گەڕان و دۆزینەوەی نەوت و غازدا لە کوردستاندا ئامادەن کار دەکەن. بەستنەوەی غاز و نەوتی کوردستان بە ئابووریی تورکیاوە و کردنی ئەو غاز و نەوتە بە یەکێک لە سەرچاوەکانی وزە بۆ خۆی، یەکێکە لە پلانەکانی تورکیا لە کوردستاندا. خاڵی سێهەم ئەوەیە تورکیا چاوەڕوانیی ئەوەی لە حوکمڕانانیی کوردستان هەیە هاریکاری بن لەهەڵناوبردنی هێزە چەکدارییەکەی پەکەکەدا و لەم ڕووەوە کارئاسانیی بۆ تورکیا بکەن.

بە بۆچوونی من هەر سێ مەبەستەکەی تورکیا لە ڕووی ستراتیژییەوە شوێنگەی کوردستان لاواز دەکەن و دەیکەنە

پاشکۆیەکی ئابووری و سەربازی و سیاسی و کولتووریی تورکیا.

**دەرەنجام**

پرۆژەی تورکیا بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، خەونی تورکیا بۆ بوونی بە زلهێزێکی ناوچەیی و جیهانی ئاراستەی دەکات، لەمەشدا هەم هەوڵی دروستکردنی پەیوەندییەکی هێمن و ئارام لەگەڵ دراوسێکان و ناوچەکەدا ئەدات، لە ڕێگای پەنابردن بۆ هێزی نەرمەوە، هەم بە هەموو شێوەیەک بەرگری لەئاساییشی نەتەوەیی و بەرگری لە قازانج و دەسکەوتەکانی خۆی لە ناوچەکەدا دەکات. ئەم خەونە وای لە تورکیا کردوە لە سەرێکەوە دەستی هاریکاری بۆ وڵاتێکی وەک ئێران درێژ بکات، بەڵام لە سەرێکی دیکەوە لە ململانێ و کێشمەکێشیشدا بێت لەگەڵیدا لەسەر ڕووبەری نفووز و دەسەڵات لە ناوچەکەدا. گەرچی تورکیا بۆ پیادەکردنی ئەم خەونە سیاسییە گەورەیە کۆمەڵێک گۆڕانی ناوەکی و دەرەکی بەسەردا هاتووە، بەڵام تا ئێستاش بەگژاچوونەوەی مەسەلەی کورد و ڕێگرتن لەوەی ئەم مەسەلەیە گەشە بکات، یەکێکە لە خاڵە سەرەکییەکانی سیاسەتی تورکی لە ناوچەکەدا. نەک هەر ئەمە، بەڵکو تورکیا تا ئێستاش توانای کۆکردنەوەی ئێران و سووریا و عێراقیشی هەیە بۆ ڕێگرتن لە گەشەکردنی مەسەلەی کورد و وەڵامدانەوەی پێکەوەیی بە تەحەداکانی ئەم مەسەلەیە. لە پەیوەندیدا بە ئەگەری دروستکردنی دوڵەتی کوردییەوە، گۆڕانی تورکیا لە پەنابردن

لە هێزی زبرەوە بۆ هێزی نەرم لە سیاسەتی تورکیدا مانای قبووڵکردنی دەوڵەتی کوردی نییە لەلایەن تورکیاوە. هاوکات تا ئێستاش تورکیا نە ئیرادە و نە توانای چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی لە باکوری کوردستاندا نیشان نەداوە، چ جای بێدەنگبوون یان هاریکاریکردنی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە بەشەکانی تری کوردستاندا.

لە پەیوەندیدا بە هەرێمی کوردستان و حکومەتەکەیەوە تورکیا تەنها دەستی لەناو ئابووریی هەرێمدا نییە، بەڵکو دەستی لەناو کولتوور و سیستمی خوێندن و پەروەردەی هەرێمیشدایە. تەنها لە شارێکی وەک هەولێردا نزیکەی ١٥ هەزار تورک کار دەکەن و زیاد لە٧٠٠ کۆمپانیای تورکی لە هەرێمدا دەستبەکارن، ئەمەش دوو لەسەر سێی ژمارەی ئەو کۆمپانیا بیانییانەن کە لە هەرێمدا کار دەکەن. هاوکات تورکیا زانکۆی تایبەتی لە هەولێر کردۆتەوە و بزووتنەوە دینییەکانی تورکیاش خاوەنی ١٩ نۆزدە قوتابخانەن لە هەرێمدا کە ٥٥٠٠ قوتابی تیایاندا دەخوێنن. ئەمە جگە لە ئامادەگیی ژمارەیەک سەربازی تورکی لە هەرێمدا بە ناوی بەگژاچوونەوەی پەکەکەوە.(١٧) هەموو ئەمانە ئەوە نیشان ئەدەنکە تورکیا خەریکی بەتورکیاکردنی هەرێمە، خەریکی دارشتنەوەی ئابووری و کولتوور و سیستمی خوێندنی هەرێم و بڵاوکردنەوەی جۆرێکی تایبەتە لە هەستی ئایینی، کە هەرێم بەتوندی بە تورکیاوە ببەستێتەوە. بەم مانایە تورکیا نەک هەڵگری پرۆژەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە هەرێمدا نییە، بەڵکو یەکێکە لە ڕێگرە هەرە گەورە و

سەرەکییەکانی بەردەمی دروستبوونی دەوڵەتێکی لەم بابەتە، تورکیا تا ئەم ساتەش ڕێککەوتنی لەگەڵ وڵاتانی دەوروبەردا هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر خەونێکی بەدەوڵەتبوونی کوردستان.

# سەرچاوەکان


١- بڕوانە:

Damla Aras and Mustafa Aydin, “Political Conditionality of Economic Relations between Paternalist States: Turkey>s Interaction with Iran, Iraq and Syria,” Arab Studies Quarterly, Winter/Spring, 2005, pp. 21-43.

٢-بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان تورکیا و سووریا بڕوانە ئەم وتارە گرنگەی دەملهئاراس:

Damla Aras. <Turkish-Syrian Relations Go Downhill The Syrian Uprising>, The Middle East Quarterly,Spring 2012, pp. 41-50.

٢- بڕوانە:

Damla Aras and Mustafa Aydin, “Political Conditionality of Economic Relations between Paternalist States: Turkey>s Interaction with Iran, Iraq and Syria,” Arab

Studies Quarterly, Winter/Spring, 2005, pp. 21-43.

٣- بڕوانە سەرچاوەی دووهەم.

٤-بڕوانە:

ÖMER TAŞPINAR. <Neo-Ottomanism and Kemalist foreign policy>, Today>s Zaman, 22 September 2008.

هەروەها بڕوانە:

Omer Taspinar, "Turkey>s Middle East Policies: Between Neo-Ottomanism And Kemalism," Carnegie Endowment for International Peace, Washington, D.C., Sept. 2008.

٥- بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦- بۆ وردەکاریی ئەو ژمارە و زانیارییانە دەربارەی پەیوەندیی نێوان تورکیا و ولاتانی کەنداو بڕوانە:

Larrabee, F. Stephen. <Turkey and the Gulf Cooperation Council>. Turkish Studies, 12:4, 689-698.

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٩٣.

٩- بڕوانە:

-Damla Aras. <Turkish-Syrian Relations Go Downhill The Syrian Uprising>, The

Middle East Quarterly,Spring 2012, pp. 41-50.

١٠- بڕوانە:

Al-azm, Sadik J.>The “Turkish Model”: A View from damascus>. Turkish Studies, 12:4, 633-641.

١١- بڕوانە:

Barkey, Henri J. <Turkey and Iraq: The making of a partnership>. Turkish Studies, 12:4, p. 670.

١٢-هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٦٣.

١٣- بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بڕوانە ئەم وتارەی گرنگەی ڕۆبرت ئۆلسۆن:

Olson, Robert.>Turkish-Kurdish Relations: A Year of Significant Developments,>. Insight Turkey, Vol. 10, No. 3 (2008), p, 24.

١٤- بڕوانە:

-Bengio, Ofra.>The “Kurish Spring” in Turkey and its Impact on Turkish Foreign Relations in the Middle East>. Turkish Studies, 12:4, p .

١٥- بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٣١.

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٦٢٣

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٢٨-٦٢٧

# بەشی چوارەم

## کورد و پرۆژە گەورەکان

## پرۆژەی ئێران و خەونی بوونی ئێران بە هێزێکی ئەتۆمی

## پرۆژەی ئێران و خەونی بوونی ئێران بە هێزێکی ئەتۆمی

**سەرەتا**

ئێـران یەکێکـە لـە وڵاتـە گـەورە و دەوڵەمەندەکانـی ناوچـەی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت. هـەم خاوەنـی ژمارەیەکـی گـەورەی دانیشـتووانە، هـەم خاوەنـی نـەوت و غازێکـی زۆرە، هـەم شـوێنە جوگرافییەکـەی شـوێنێکی سـتراتیژییە، هـەم جۆرێـک لـە حوکمڕانیـی دینـی و مەزهەبیـی هەیـە کـە خەونـی بەزلهێزبـوون لـە ناوچەکـە و جیهانـدا دەبینێـت. ئـەم وڵاتـە بـە درێژاییـی نیـوەی دووهەمـی سـەدەی بیسـتەم یەکێـک بـووە لەهێـزە ناوچەییـە گەورەکانـی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت، سـەردەمێک شـای ئێـران ڕۆڵـی پۆلیسـی خـاوەن بڕیـاری لـە ناوچەکـەدا دەبینـی، ئەمڕۆش ڕژێمەکـەی ئەحمـەدی نـەژاد و خامەنەئـی هەمـان خـەون دەبینن.

لە دوای شۆڕشی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩ ئێران بووە بە دەوڵەتێکی دینی و بە ناوی شیعەکانی دونیاوە قسە دەکات. لەم ڕووەوە وەک چۆن ئیسرائیل خۆی وەک دەوڵەتی جوولەکەکانی دونیا نیشان ئەدات، ئێرانیش خۆی وەک دەوڵەتی هەموو شیعەکانی دونیا نماییش دەکات، یان لانی کەم هەوڵ ئەدات ئەم وێنەیە بە

خۆی بدات. شۆڕشی ئێرانی دۆخێکی نوێی بۆ هێزە دینییەکانی ناوچەکە بەگشتی و بۆ شیعەکان بەتایبەتی دروست کرد. لە دوای ئەم شۆڕشەوە بەشێکی زۆری شیعەکانی ناوچەکە هەستیان بە هێز و گوڕێکی تازە کرد و زیاتر لە جاران کەوتنە داواکردنی مافە سیاسی و کۆمەلایەتی و دینی و فەرهەنگییەکانیان. لەهەندێک شوێنیشدا سلّیان لەوە نەکردەوە، بە هاریکاریی ئێران، دەست بدەنە چەک و داوای ڕووخانی ڕژێمەکانی ناوچەکە بکەن. ئەم دۆخە لە سەرەتای هەشتاکانەوە پرۆسەی بەسیاسیکردنی شیعیزمی لە سەرجەمی ناوچەکەدا چالاک کرد و چەندان گروپی شیعیی چەکدار لە عێراق و لوبنان و سعودیە و بەحرێندا دروست بوون. ئەمڕۆش شیعەکان لە عێراقدا بەشێکی زۆری دەسەلاتی ئەو ولاتەیان بەدەستەوەیە و لە لوبناندا ژمارەیەکی سیاسی و سەربازیی بەهێزن و لە بەحرێنیشدا هەڕەشەیەکی گەورەن بۆ سەر ئەو سیستمە پاشایەتییە سوننییە کەمینەیەی لەسەر کارە، لە سعودیەشدا هێزێکی ناڕازین و تووڕەن، ئەمە جگە لە هێزی شیعەکانی ئەفغانستان و پاکستان و شوێنەکانی تری ناوچەکە، کە ئێران وەک هەوادارای خۆی تەماشایان دەکات و هەولّی ئەوە ئەدات کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر بەجێ بهێلّێت. ئێرانی ئەمڕۆ، بە پشتبەستن بە ژمارە و توانای هێزە شیعییەکان لە ناوچەکەدا، خەون و پرۆژەی ئەوەی هەیە ببێت بە یەکێک لە زلهێزە گەورەکانی ناوچەکە، ببێت بەیەکێک لەو گەمەکەرە سیاسییانەی ولاتانی ناوچەکە ناچار بکات گوێ لە خواست و ویست و چاوەڕوانییەکانی بگرن. ئەوەشی ڕۆلّی ئێران لە ناوچەکەدا چالاک و کاریگەر دەکات، ئەو ناکۆکییە

سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەربازییە گەورەیەیە کە لە چەند ساڵی ڕابردوودا لەنێوان شیعە و سوننە لە ناوچەکەدا دروست بووە.

## ململانێی شیعە و سوننە

ژمارەی شیعە لە دونیادا لەنێوان ١٣٠ تا ١٩٥ ملیۆنە، ئەمەش ڕێژەی ١٠ تا ١٥ لە سەدی ڕێژەی سەرجەمی مسوڵمانانە لە دونیادا، کە بەسەریەکەوە نزیکەی ملیارێک و سێ سەد ملیۆنە. چڕیی ئامادەگی شیعەکان لە ناوچە جیاوازەکانی دونیادا جیاوازە، لەو شوێنەدا کە بە ناوجەرگەی دونیای ئیسلامی دادەنرێت، واتە لەو ڕووبەرەدا کە دەکەوێتە نێوان لوبنان و پاکستانەوە، ژمارەی شیعە و سوننە لەیەک نزیکن، بەڵام لە ناوچەی کەنداوی عەرەبی یان فارسیدا، ڕێژەی شیعە ٨٠ لە سەدی ڕێژەی دانیشتووانی وڵاتەکانی ئەو ناوچەیەیە. لە سێ وڵاتی ئەم ناوچەیەدا، لە عێراق، لوبنان و بەحرێندا، شیعە زۆرینەی دانیشتووان پێک دەهێنن، لە سعودیە و سووریا و وڵاتانی تری کەنداودا کەمایەتییەکی گەورەی شیعە هەن. ئەمانە هەموویان هێزی مرۆییی گرنگن و ناکرێت لە حیساباتی سیاسی لە ئاستی ناوچەکەدا وەلا بنرێن و حیسابیان بۆ نەکرێت. ئەم ژمارە زۆرەی شیعە لە ناوچەی کەنداودا وا دەکات شیعەکانی ئەم ناوچەیە خاوەنی هێز و توانایەکی گەورە بن و بەشێکی سەرەکی بن لە هەر هاوکێشەیەکی سیاسی لەم ناوچەیەدا دروست ببێت.(١) لەپاڵ بەهێزبوونی ململانێی تائفی و مەزهەبی لە ناوچەکەدا، ئێران

وەک دەوڵەتێکی شیعی، بووهتە خاوەنی قووڵاییەکی مرۆیی و ستراتیژیی گەورە.

ململانێی نێوان شیعە و سوننە ململانێیەکی دێرینە و ڕەگەکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام خۆی. ئەم ململانێیە گەرچی لە دەرەوەڕا وەک ململانێ لەسەر مسوڵمانبوون و ئیمانداربوونی ڕاستەقینە دەر دەکەوێت، لە قووڵاییدا ململانێیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەتنییە. ململانێیەکە لەسەر ئەوەی کێ دەسەڵاتی دینی و دونیایی بەدەستەوە بێت و کێ مافی ئەوەی هەبێت پێناسی ئەوە بکات ئیسلامی ڕاستەقینە کامەیە، هتد.... لە مێژووی ئیسلامدا ململانێی نێوان شیعە و سوننە بە قازانجی سوننە کۆتایی هات. لە دوای کوشتنی ئیمام حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلییەوە، شیعەکان، هەوڵیان دا لە ئاستی سیاسیدا بێدەنگی هەڵبژێرن و پشت بکەنە دەسەڵاتی دونیایی، تا ئەو شوێنەی هەموو دەسەڵاتێکی سیاسی وەک دەسەڵاتێکی گوناهبار و ناڕەوا ببینن و ئامادە نەبن بەشدار بن تیایدا. بە حوکمی ئەوەش لەناو ئیسلامدا کەمینە بوون، هەوڵی سەرەکییان بۆ ئەوە بووە لەناو نەچن. ئەمە وای کرد بە درێژاییی مێژووی ئیسلام ستراتیژیەتی سەرەکیی شیعەکان بە شێوەیەکی گشتی بریتی بێت لە دوورکەوتنەوە و خۆپاراستن لە ململانێ سیاسییەکان لەسەر دەسەڵات و خۆخەریککردن بە مەسەلە دینی و مەزهەبی و فەرهەنگییەکانەوە. ئەم ململانێ مێژووییە درێژە وای کردووە تا ئەمڕۆش ئیسلامی سوننی بە چاوێکی هێجگار نزم و دوژمنکارانەوە تەماشای شیعەکان بکەن و لە پاکستان، بۆ نموونە، پێیان بگوترێت "مێشوولە"و لە

سعودیه وه‌ك "كافر" وێنا بكرێن و له زۆر شوێنی تردا پێیان بگوترێت "ڕافیزه" و ته‌وقه‌كردن له‌گه‌ڵیاندا وه‌ك كارێكی گڵاو بنرخێنرێت. له هیچ شوێنێكی دونیای سوننیدا شیعه‌كان وه‌ك هاوولاتی و هاونیشتیمانی یه‌كسان و خاوه‌ن ماف وێنا و مامه‌ڵه ناكرێن. له مێژووی هاوچه‌رخدا ئێران یه‌كه‌م ده‌وڵه‌تی دینیی شیعه‌یه و بوونی شیعیزم خۆشی به "ئایدیۆلۆژیایه‌كی سیاسی" شۆڕشگێڕ له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی بیسته‌وه ده‌ست پێ ده‌كات و له سه‌رده‌ستی خومه‌ینیدا به‌ته‌واوی به‌رجه‌سته ده‌بێت.(٢)

له دونیای نوێدا خومه‌ینی یه‌كه‌مین پیاوی ئاینیی شیعییه كه تێزه‌ی "ده‌سه‌لاتی فه‌قیه" به به‌رفراوانی تیوریزه ده‌كات و داوای ئه‌وه ده‌كات پیاوانی دین ببنه ده‌سه‌لاتدارانی سیاسی. ئه‌گه‌رچی تا ئێستاش بڕێك له ئایه‌تولڵا گه‌وره‌كانی شیعه ئه‌م دیده‌ی خومه‌ینییان بۆ ڕۆڵی پیاوانی دین قبووڵ نییه، له‌وانه ئایه‌تولڵا سیستانی له عێراقدا، به‌لام ئه‌م دیده‌ی خومه‌ینی له‌مڕۆدا دیدی بالاده‌سته له‌ناو هێزه شیعه سیاسییه‌كاندا و به‌شێكه له‌و دۆخی گه‌شه‌كردن و به‌هێزبوونه سیاسییه‌ی شیعیزم له ڕۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاستدا به‌خۆیه‌وه بینیوه. ئه‌م به‌سیاسیبوونه نوێیه‌ی شیعیزم ململانێی نێوان شیعه و سوننه‌ی لهناوچه‌كه‌دا كردووه به یه‌كێك له ململانێ گه‌وره‌كان و هه‌ندێك كه‌س قسه له دروستبوونی ڕۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاستێكی نوێ ده‌كه‌ن، كه شووناسی شیعیزم ڕۆڵێكی گرنگ و سه‌ره‌كیی تێدا ده‌بینێت.(٣)

به‌كورتی ململانێی نێوان شیعه و سوننه گه‌رچی وه‌ك ململانێیه‌كی تائیفیی دینی دێرین ده‌ر ده‌كه‌وێت و وا

نیشـان ئەدرێـت وەک ئـەوەی دووبارەکردنـەوەی ململانێکانـی ڕابـردووی ئیسـلام بێـت، بـەڵام لەڕاسـتیدا ئـەم ململانێیـە لەمڕۆدا ململانێیەکی نوێیـە و تێکەڵێکی ئاڵۆز لـە ناسیۆنالیزم و پێداگرتن لەسـەر شووناسـی ئەتنی و ناوچەیی و حیسـاباتی جیۆپۆلەتیکـی و هەیمەنـی سیاسـی و پـرۆژەی جیهانـی لـە ناوچەکـەدا، بەڕێـوەی دەبـات. وەک نووسـەرێک دەڵێـت: ئـەم ململانێییـە لـە یـەک کاتـدا "هـەم ململانێیەکی زۆر زۆر کۆنـە، هـەم ململانێییەکـی زۆر زۆر تازەیـە".(٤)

### ئێرانی دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین

بـەر لـە هێرشـی ئەمەریـکا بـۆ سـەر عێـراق و بـەر لـە ڕووخاندنـی ڕژێمەکـەی سـەدام حوسـەین، ئێـران بـە کۆمەڵێـک دەوڵەتـی سـوننی ناحـەز چـواردەوری گیرابـوو، لـە دیـوی ڕۆژهەڵاتیـەوە پاکسـتان و ئەفگانسـتانی تاڵیبـان، دوو دەوڵـەت کـە سـەلەفیەتی دینـی دژ بـە شـیعە تیایانـدا هێجـگار بەهێـز بـوون و لەڕۆژئاواشـییەوە عێراقـی سـەدام حوسـەین هەبـوو، کـە ئەمیـش تێکەڵێـک بـوو لـە دەسـەڵاتێکی خێڵەکتـی سـوننی و ناسیۆنالیسـتیی عـەرەب، کـە خـۆی بـە نوێنـەری مێژوویـی ئەو دەسـەڵاتە عەرەبییانـە دەزانـی کـە هـەم لـە ململانێدا بـوون لەگـەڵ ئێرانـدا و هـەم لـە ڕێـگای جەنـگ و پێکدادانیشـەوە بـە گژیشیدا چوونەتەوە. بەڵام لە دونیای دوای ١١ی سێپتێمبەردا، بەتایبەتی دوای ڕووخاندنی دەوڵەتەکەی تاڵیبان لە ئەفغانسـتان و دوای خسـتنی ڕژێمەکـەی سـەدام حوسـەین لـە عێراقـدا، ژینگەیەکی نـوێ دروسـت بـوو تیایدا ئێران لـەو دوو دوژمنـە گـەورە و سـەرەکییەی خـۆی ڕزگاری بـوو، نـەک هـەر ئەمـە،

بەڵکو ئەو هێزانەی کە دۆستی ئێرانن لەو دوو وڵاتەدا بوون بە دەسەڵاتدار یان بە بەشێکی هێجگار گرنگی دەسەڵات تیایاندا. ئەم ژینگە نوێیە خەونی بەزلهێزبوونی ئێرانی لە ناوچەکەدا گەورەتر کرد. هەوڵدانی ئێران بۆ دروستکردنی بۆمبایەکی ئەتۆمی؛ هەم دەربڕی ئەم خەونەیە و هەم بەشێکە لەو خەونە. ئەمە جگە لەو ڕاستییەی کە یەکێک لە وڵاتە سوننییە ناحەزەکانی ئێران، مەبەستم پاکستانە، خاوەنی بۆمبای ئەتۆمییە. زانایەکی سیاسیی شارەزا لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە باسی پاکستاندا دەڵێت، کاتێک (زولفەقار عەلی بۆتۆ)ی سەرۆکی پاکستان بۆمبا ئەتۆمییەکەی پاکستانی دروست کرد، ناوی نا "بۆمبای ئیسلامی،" ئەم بۆمبایەش بۆمبایەک بوو دژ بە "بۆمبای هیندۆسی" لە هیندستاندا، بەڵام ئەم "بۆمبا ئیسلامی"یەی پاکستان لە ساڵانی نەوەدا و بە دروستبوونی بەرەیەکی سیاسی بەهێز لەنێوان "سعودیە و پاکستان و تاڵیباندا" و بە قووڵبوونەوەی زیاتری ململانێی نێوان سوننە و شیعە لە ناوچەکەدا، لە بۆمبایەکی ئیسلامییەوە گۆڕا بۆ "بۆمبایەکی سوننی".(٥) یەکێک لە دوژمن و ناحەزە سەرەکییەکانی ئەم بەرە تازەیە لە ناوچەکەدا، ئێران و دەسەڵاتی شیعەیە. ئەم گۆڕانە لە تەرەفگیرییە تازەکانی ناوچەکەدا ئێرانی بە شێوەیەکی قووڵ ترساندووە. بیرکردنەوەی ئێران لهدروستکردنی بۆمبای ئەتۆمی، وەک ئەو نووسەرە دەڵێت، پەیوەندیی بە ترسی ئێرانەوە لەم بەرە سوننییە بەهێزە هەیە.(٦) نەک بۆ نموونە ترس لە ئیسرائیل یان ویستی دوژمنایەتیکردنی ئیسرائیل لەلایەن ئێرانەوە. بۆمبای ئەتۆمیی ئێرانی گەر لە ناوچەکەدا

دروست بێت، بۆمبایەکی ئیسلامی نابێت، بەڵکو بۆمبایەکی شیعی دەبێت.

بێگومان هێزی ئێران لە ناوچەکەدا تەنها پابەستی هەوڵدانی دروستکردنی بۆمبایەکی ئەتۆمی نییە، بەڵکو پابەندی ئەو گۆڕانکارییە گەورانەن کە دوای ١١ سێپتێمبەر لە ناوچەکەدا ڕوویان داوە. بۆ نموونە ڕوخاندنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین نەک تەنها کۆتایی بە دەسەڵاتی یەکێک لە دوژمنە دینی و نەتەوەییەکانی ئێران هێنا، بەڵکو ئەو هێزە شیعییانەشی گەیاندە دەسەڵات کە دۆستی نزیکی ئێرانن. ئەمڕۆ قووڵایی کاریگەرییەکانی ئێران لەسەر ناوچەکە بەگشتی و لەسەر عێراق بەتایبەتی لهمێژووی خۆیدا بێوێنەیە. ئێران ئەمڕۆ دەستی لەناو بڕیارە گەورە و گرنگەکانی حکومەتی عێراقیدایە. بە شێوەیەکی گشتی ئێران لە عێراقدا سێ مەبەستی سەرەکیی هەیە. یەکەمیان ڕێگرتن لەوەی سوننەی عەرەب لەژێر هەر ناوێکدا بێت جارێکی تر دەسەڵات لەو وڵاتەدا بگرنەوە دەست. دووهەم کردنی عێراق بە ڕێگایەک بۆ گەیشتن بە سووریا و لوبنان و شیعەکانی سعودیە و کوەیت، سێهەم ڕێگرتن لە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی و هەوڵدان بۆ ڕێگەگرتن لە گەڵاڵەبوونی پرۆژەیەکی لەو بابەتە. بەشیعەکردنی دەسەڵات لە عێراقدا یەکێکە لە ستراتیژە هەرە سەرەکییەکانی ئێران بۆ پیادەکردنی ئەم پلانە سێ مەبەستە.

جگە لەمانە ئێران ئەمڕۆ کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر حوکمەتەکەی بەشار ئەل ئەسەد هەیە، لە ڕێگای حیزبوڵای لوبنانییەوە گەمەکەرێکی گەورەیە لە سیاسەتی لوبنانیدا، لە ڕێگای حەماسی فەلەستینییەوە ژمارەیەکی گرنگە لە ململانێی نێوان فەلەستینی و ئیسرائیلییەکاندا، لە ڕێگای ئەو کەمایەتییە

شیعییانەی کەنداوەوە کاریگەریی بەرچاوی لەسەر سیاسەتی بەشێکی زۆر لە کۆمەڵگا و دەوڵەتەکانی کەنداو هەیە. بەکورتی ئێران ئەمڕۆ بە هەزاران هەزار چەکداری ئایدیۆلۆژی و مەزهەبیی لە ناوچەکەدا هەیە، لە لوبناندا ئامادەگیی حیزبوڵڵای لوبنانی بۆ گوێگرتن لە ئێران جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ ئامادەگیی سوپای پاسدارانی ئێران خۆیدا، ئەمە جگە لە هێزی فەیلەقی بەدر و جەیشی مەهدی و هێزە چەکدارییەکانی تری شیعە لە عێراقدا، هەروەها بێجگە لەهێزی "سوپای موحەمەد" لە پاکستاندا، کە هێزێکی زۆر نزیکە لە ئێرانەوە. زۆربەی هەرەزۆری ئەم هێزە شیعییە چەکدارانە لە ناوچەکەدا لە ئێراندا ڕێک خراون و لەو وڵاتەدا مەشقیان پێ کراوە و کۆمەکی مادی کراون.(٧) بەکورتی دۆستەکانی ئێران لەمڕۆدا بریتین لە: شیعەی عێراق، سووریای حافز ئەسەد، حیزبوڵڵای لوبنانی، کەمایەتییە شیعەکانی کەنداو و شیعەکانی ئاسیای دوور. لە ئاستی جیهانیشدا چین و ڕوسیا و تەنانەت ئەورووپاش ئەو پەیوەندییە دوژمنکارانەیان بەرامبەر بە ئێران نییە، کە بۆ نموونە، ئەمەریکییەکان هەیانە.

**ئێران و هێزی نەرم**

لەپاڵ ئەو توانا مرۆیی و سەربازییانەدا ئێران لە ناوچەکەدا هەیەتی، ئەم وڵاتە خاوەنی "هێزێکی نەرم"ی گەورەشە. مۆسیقای ئێرانی مێژوویەکی درێژی بڵاوبوونەوەی لە ناوچەکەدا هەیە، ئەدەبیات و هونەری سینەمای ئێرانیش لە دوو دەیەی ڕابردوودا بە ناوچەکەدا و بە بەشێکی گەورەی دونیادا بڵاو بۆتەوە، بەڵام لە هەموو ئەمانە گرنگتر پەیوەندییە مەزهەبی و دینییەکانی ئێرانە لە ناوچەکەدا. شاری قوم، بۆ نموونە،

شارێک نییە کە تەنها دینی تیادا بەرهەم دێت بۆ ئێران خۆی، شارێک نییە تەنها شیعیزم تییایدا خۆی تازە دەکاتەوە، بەڵکو شوێنێکە دین هەناردەی دەرەوە دەکات، هەناردەی پاکستان و ئەفغانستان، ولاتانی کەنداو، کەمایەتییە شیعییەکانی ناوچەکە، عێراق و بەشێکی زۆری شیعەکانی تری دونیا دەکات هتد... وەک شارەزایەکی ئەم بوارە دەڵێت قوم ئەمڕۆ شوێنی نزیکەی ۳۰۰ قوتابخانە و پەیمانگای دینییە و بەردەوام زیاد لە پەنجا هەزار خوێندکاری دینی لە شارەکەدا هەن، کە زۆربەیان لە شوێنی جیاوازەوە هاتوون، بۆ نموونە شەش هەزاریان لە پاکستانەوە هاتوون. هاوکات لەو شارەدا چەندان قوتابخانە و بنکەی دینی هەن بۆ ئافرەتان، ئەمانە کاریان ئەوەیە پرنسیپەکانی شیعیزم و مێژووی ئیسلام بە خانمان بڵێن. بڕێکی زۆر لە قوتابییانی ئەم فێرگە دینییانە لە دونیای عەرەبەوە هاتوون، ئەمانە لە قومدا دەرس دادەرێن و دەڕۆنەوە بۆ ئەوەی گەنجانی شیعەی ولاتانی دەوروبەر و سەرکردە دینییە گەنجەکانی نەوەی نوێی شیعە، لە ناوچەکەدا پەروەردە بکەن.(۸) بەکورتی ئەم فێرگە دینییانە ڕۆڵێکی ئایدیۆلۆژیی گرنگ دەبینن لە بەرگریکردن لە شیعیزمی دینی و سیاسیدا.

جگە لە دین، ئێران لە ڕێگای چەندان ڕێکخراوی خێرخوازیی حکومی و ناحکومییەوە لە ناوچەکەدا ئامادەیە و ئەم ڕێکخراوانەش سەرچاوەیەکی تری هێزی نەرمی ئێرانن لە ناوچەکەدا. ئەمە جگە لە بوونی چەندان کەناڵی تەلەفیزۆنیی ئێرانی یان لەلایەن ئێرانەوە ئاراستەکراو، وەک کەناڵی عالەم و کەناڵی ئەل مەناری حیزبوللا لە لوبنان، کە سەرچاوەیەکی گرنگی بلاوکردنەوەی دید و بۆچوون و

چاوەڕوانییەکانی ئێرانن و کۆمەکێکی ڕاستەوخۆی دەسەڵاتی ئێران لە ناوچەکەدا دەکەن.

بێگومان مەرج نییە ئەم هێزە نەرمەی ئێران هەمیشە ئامانجی خۆی بپێکێت. بۆ نموونە جیاوازیی سەرەکی هێزی نەرمی ئێران لە هێزی نەرمی تورکیا لەوەدایە ئەوەی ئێران ئاکارێکی دینی بەهێزی هەیە، لە کاتێکدا ئەوەی تورکیا ئاکارێکی عەلمانی و دونیاییی بەهێزی هەیە. بە حوکمی ئەوەی خەڵکی ناوچەکە لە هەموو ئاراستەیەکەوە بە دین، بە حیجاب و ڕیش، بە گریان و قوڕپێوانی دینی، بە گەورەکردن و قووڵکردنەوەی هەستکردن بە گوناهباری، گەمارۆ دراون، بۆیە خەڵک بۆ هەڵاتن لەو دونیا ڕەشپۆشە، زیاتر بەدەم ئەو دونیا ڕەنگاوڕەنگەوە دەچن کە هێزی نەرمی تورکیا پێشنیاری دەکات. سینەما و مۆسیقا و زنجیرە تەلەفیزۆنییە تورکییەکان دونیایەکی سادەی پڕ ڕەنگ و نەرمی و قەشەنگی نماییش دەکەن، کە تەواو ناکۆکە بەو دونیا تاریکە دینییە پڕ گوناه و فرمێسکەی هێزی نەرمی ئێران بە ناوچەکەدا بڵاوی دەکاتەوە.

### ڕێگرەکانی بەردەم پرۆژەی ئێرانی

ئەگەرچی ئێران خاوەنی هێزێکی تایبەتە لە ناوچەکەدا و ئەو گۆڕانکارییانەی لە دونیای دوای ١١ی سێپتێمبەردا ڕوویان داوە، تا ئێستاش لە قازانجی ئێراندان، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە پرۆژەی ئێرانی لە ناوچەکەدا ڕووی بە کۆمەڵێک ڕێگر و تەحەدای گەورەدا نەتەقیوەتەوە. ڕێگرەکانی بەردەم پرۆژەی ئێرانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆرن، هەندێکیان ڕێگری ناوەکین و پەیوەندییان بە کۆمەڵگای ئێرانی خۆیەوە هەیە،

هەندێکی تریان ڕێگری ناوچەیین و پەیوەندییان بە کۆنتاکتی ئێران و وڵاتانی ناوچەکەوە هەیە و ئەوانی تریشیان ڕێگریی جیهانین و بەتایبەتی پەیوەندییان بە کۆنتاکتی نێوان ئێران و ئەمەریکاوە هەیە.

## کۆمەڵگای ئێرانی وەک ڕێگرێکی گەورە

زانای سیاسیی ئێرانی، موجابەت مەهداوی، مێژووی کۆمەڵگای ئێرانی دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ بەسەر چوار قۆناغدا دابەش دەکات(٩) قۆناغی یەکەمیان بە "قۆناغی شۆڕشگێڕی" ناو دەبات و لە ساڵی ١٩٧٩ بۆ ١٩٨٩ دەخایەنێت. ئەمە قۆناغی بەرپاکردنی شۆڕشی ئێرانی و دامەزراندنی دەوڵەتی دینییە شیعییەکەیە لە ئێراندا بە سەرۆکایەتی خومەینی، وەک چۆن قۆناغی جەنگ و پێکدادانە ناوەکیو دەرەکییە خوێناوییەکانی ئەو وڵاتەیە لەگەڵ هێزە ناوخۆییەکان و لەگەڵ ڕژێمەکەی سەدام حوسەین لە دەرەوەدا. قۆناغی دووهەم قۆناغی ١٩٨٩-١٩٩٧، ئەم قۆناغە "قۆناغی بونیادنانەوە"ی دونیای وێرانبووی دوای جەنگە، هەروەها قۆناغی دروستبوونی نوخبەیەکی سیاسی و ئابووریی نوێیە لە وڵاتەکدا، لەژێر دەسەڵاتی هاشمی ڕەفسەنجانیدا. قۆناغی سێیەم، قۆناغی ساڵانی ١٩٩٧-٢٠٠٥، "قۆناغی چاکسازی"یە، تیایدا ڕووبەرێکی گەورەتر بۆ ئازادیی ڕادەربڕین و ئازادیی نووسین و ئازادیی ڕێکخراوەیی، لە سێبەری حوکمڕانیی محەمەد خاتەمیدا دروست دەبێت. قۆناغی چوارەمیش قۆناغی ئێرانی ئەمڕۆکەی ئەحمەدی نەژادە، کە ئەو نووسەرە بە "قۆناغی پۆپۆلیسم" ناوی دەبات، تیایدا پاشەکشێیەکی

بەرچاو بەدی دەکرێت لە هەموو ئاستەکانی ژیانی سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیدا، ڕووبەری ئازادی و کرانەوە و دیالۆگ بە ڕادەیەکی ترسناک بچووک کراوەتەوە و وڵاتەکە نوقمی ناو پرۆسەیەکی بەرفراوانی بەسەربازیکردنێکی فرەلایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کراوە. بڕی فشار و پەلامار و سیاسەتی سەرکوتکردن و بێدەنگکردنی کۆمەڵگای ئێرانی لە ئاستێکی هێجگار بەرز و بەهێزدایە.

لە هەریەکێ لەو چوار قۆناغەدا کۆمەڵگای ئێرانی کێشەی گەورەی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێراندا هەبووە. ڕەنگە گەورەترین هێمایەک کۆمەڵگای ئێرانی بۆ ڕەفزکردنی دەسەڵاتدارانی ئێرانی لە دوای شۆڕشی ئێرانییەوە نیشان دابێت، هەڵبژاردنی محەمەد خاتەمی بێت لە ساڵی ١٩٩٧دا. لەو هەڵبژاردنەدا خاتەمی زیاد لە ٧٠ لە سەدی دەنگەکانی بردەوە و دژ بە ویستی بازنە سەرەکییەکانی دەسەڵات و هێزە کۆنەپارێزەکان، بوو بە سەرۆکی ئێران. لەگەڵ هەموو کەموکوڕی و کورتهێنانەکانی ئەزموونی خاتەمیدا، بە بەراورد بەوانەی پێش و دوای خۆی، ئەم ئەزموونە کراوەتر و دیموکراسیتر و لیبراڵتر بوو، پەراوێزی گرنگی بۆ ئازادی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری کردەوە و پێشنیاری ئەوەشی دەکرد کە دەشێت خوێندنەوەیەکی تر بۆ ئیسلام ئەنجام بدرێت کە بکرێت لەگەڵ بەها لیبراڵ و دیموکراسییەکاندا بگونجێت.(١٠) ئەگەرچی خاتەمی چوار ساڵ دواتر و لە دەورەی دووهەمی هەڵبژاردنەکەیەدا بە ڕێژەیەکی زیاتری دەنگ، ٧٧ لە سەدی دەنگەکان، سەرلەنوێ بە سەرۆکی ئەو وڵاتە هەڵبژێردرایەوە، بەڵام لە دوادەرەنجامدا

نەیتوانـی ئـەو دەزگا و بونیـاد و کۆڵەکـە سـەرەکییەکانەی دەسـەڵات بگۆڕێـت، کـە کـۆی سیسـتمە سیاسـییە دینییەکـەی لەسـەر دروست کراوە. بە زۆر مانا کەوتنی خاتەمی و هاتنی ئەحمـەدی نـەژاد مانـای گەڕانـەوە بوو بۆ هەموو بەها کۆنەپارێز و داخـراو و نادیموکراسـەکانی شۆڕشـی ئیسـلامی. ئـەوەی خاتەمـی لـە مـاوەی هەشـت سـاڵی سـەرۆکایەتیدا دروسـتی کردبوو، ئەحمـەدی نـەژاد لە دەورەی یەکەمی هەڵبژاردنەکەیدا وێرانـی کـرد. ئـەم پیـاوە کۆنزەرڤاتیـڤ و کورتبینـە، زۆربـەی ڕۆژنامـە لیبـراڵ و ڕەخنەییەکانـی داخسـت، یـان فشـارێکی گـەورەی خسـتە سـەریان، دەسـتی کـرد بـە "پاکسـازیکردن" لـە زانکۆکانـدا، ژمارەیەکـی زۆری ئـەو دەنگـە ڕەخنەیـی و چاکسـازیخوازانەی ئێرانـی گـرت و ڕاو نـا و کوشـت، کە داوای گۆڕانـکاری و ڕیفۆرمکردنیـان دەکـرد. دەسـەڵاتدارێتییەکەی ئەحمـەدی نـەژاد بەئاشـکرا گاڵتـە بـە مافەکانـی مـرۆڤ دەکات و بـە ڕۆحێکـی پۆپۆلیسـتییەوە وادە و مـژدەی گـەورە بـە کۆمەڵگایـەک ئـەدات کـە لـە هەمـوو سـەرێکەوە گەمـارۆ دراوە. لە ناوچە کوردییەکاندا ژمارەیەکی زۆری چالاکەوانـی سیاسـی و کۆمەڵایەتیـی گـرت و کوشـت و کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات لـە زۆرر ڕووەوە گەڕاوەتـەوە بۆ سـاڵە خوێناوییەکانـی سـەرەتای هەشـتاکان و تودنوتیژییە تۆقێنەرەکانی سوپاسـی پاسداران لە کوردسـتاندا. بەکورتـی هاتنـی ئەحمـەدی نـەژاد بزووتنـەوەی گۆڕانخـواز و چاکسـازیخوازی وڵاتەکـەی گەڕانـدەوە بـۆ قۆناغـی بـەر لـە هاتنی خاتەمـی، بەسـەربازیکردنی ئابووری و کۆمەڵگاکەشـی گەڕانـدەوە بـۆ سـاڵەکانی سـەرەتای شـۆڕش و ئیسـلامییەکەی ئێـران خـۆی.(١١)

دەسەڵاتدارێتیی ئەحمەدی نەژاد تەنها دەستێکی شێوێنەرانەی بەناو ژیان و خواستی چاکسازیی سیاسیی لە وڵاتەکەدا نەهێنا، بەڵکو هەمان دەستی شێوێنەرانەی بەناو ژیانی شەخسی و تاکەکەسیی ئینسانی ئێرانییشدا هێنا. لە سەردەمی ئەم پیاوەدا سێنتەرەکانی ئینتەرنێت، شوێنی یەکتربینینی گەنجان، بەتایبەتی شوێنی یەکتربینینی کوڕان و کچان، دەرکەوتنی ئینسان لە فەزای گشتیی شارەکاندا خرانە ژێر فشار و سانسۆر و چاودێرییەکی توندتر و فراوانترەوە. لەبەرامبەر ئافرەتاندا سیاسەتێکی کۆنەپارێزتر و خنکێنەرتری پیادە کرد، لەوانەش سەپاندنی حیجابێکی "ئیسلامیتر" واتە "ئەستوورتر"، و بەهێزکردنێکی بەرچاوی زیاتری "پۆلیسی ئەخلاق". هاوکات داخستن و زەحمەتکردن و بەمەحاڵکردنی کاری بەشێکی زۆری ئەو ئۆرگان و ڕێکخراوانەی بەرگرییان لە مافی ژن و زیادکردنی پانتاییی ئازادییە تاکەکەسییەکان دەکرد(١٢) ئەمە جگە لە زیادکردنی بڕی چەوساندنەوەی کەمایەتییە دینی و ئەتنییەکانی ناو ئێران و کوشتن و لەسێدارەدانی چالاکەوانەکانیان، لەوانەش کوردەکانی ئەو وڵاتە.

بوونی ئەحمەدی نەژاد بە سەرککۆماری جمهوریی ئیسلامیی ئێران، هاوکات بوو بە دروستبوونی بزووتنەویەکی نارەزایی گەورە لە ئێراندا، ساڵی ٢٠٠٩ ساڵی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی گرنگ بوو، کە بەشە جیاوازەکانی لەژێر ناوی "بزووتنەوەی سەوز"دا کۆ بوونەوە. ململانێی ئەم بزووتنەوەیە لەگەڵ دەسەڵاتدارێتییەکەی ئەحمەدی نەژاددا بەتەواوی لە دوای هەڵبژاردنەکانی

ساڵی ٢٠٠٩ تەقییەوە. هێشتا ٢٤ سەعات بەسەر داخستنی سندوقەکانی هەڵبژاردندا تێنەپەڕیبوو، حکومەتی ئێران ئاشکرای کرد کە ٤٠ ملیۆن دەنگیان جیا کردۆتەوە و ڕێژەی ٦٢ لە سەدی ئەو دەنگانەش بەر ئەحمەدی نەژاد کەوتووە، ئیتر دوای ئەمە سەدان هەزار، بگرە ملیۆنان ئینسان ڕژانە سەر شەقامەکان و حوکمەتی ئێرانیان بە تەزویرکردنێکی بێوێنە و خراپبەکارهێنانێکی بەرفراوانی دەسەڵات تاوانبار کرد. دروشمی "کوا دەنگەکەم؟" ئەو دروشمە سەرەکییە بوو کە خەڵک لە خۆپیشاندانە گەورەکاندا هەڵیان گرتبوو. ئەم خۆپیشاندانانە کە سەرەتا وەک کاردانەوە بە ڕووی تەزویرکردنی هەڵبژاردنەکاندا دەستی پێ کرد، لە هەفتە و مانگەکانی دواتردا گۆڕا بۆ داواکردنی ڕوخاندنی حکومەتە دینییەکەی ئێران و کۆتاییهێنان بەو سیستمە سیاسییەی لەدوای شۆڕشی ئێرانییەوە دروست کراوە و بەسەر کۆمەڵگای ئێرانیدا سەپێنراوە. خۆپیشاندانەکانی مانگی شەش و مانگەکانی دواتری ساڵی ٢٠٠٩، کە دوو ساڵ بەر لە بەهاری عەرەبی دروست بوو، کەشوهەوایەکی شۆڕشگێڕانە و گۆڕانخوازیی لە وڵاتەکەدا دروست کرد.

هەم بەشێکی زۆری کۆمەڵگای ئێرانی و هەم دونیای دەرەوە چاوەڕوانیی گەورەیان لەو بزووتنەوە تازەیە هەبوو، بەڵام ڕژێمەکەی ئەحمەدی نەژاد لە ڕێگای بەکارهێنانێکی گەورە و بەرفراوانی توندوتیژییەوە توانی کۆتایی بە خۆپیشاندانەکان بهێنێت و خەڵکانێکی زۆر بگرێت و بکوژێت و لە دوادەرەنجامیشدا کۆمەڵگای ئێرانی جارێکی تر و بۆ ماوەیەکی تر ناچار بە بێدەنگی بکات.(١٣) سەپاندنی ئەم

بێدەنگییە تا ئەمڕۆ درێژەی هەیە و بۆ درێژەدانیش بەم بێدەنگییە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو وڵاتە بە ڕادەیەکی گەورە بەسەربازی کراوە. یەکێک لە ڕێگرە گەورەکانی بەردەم بەهێزبوونی ئێران لە ناوچەکەدا؛ پەیوەندیی بەم دۆخە ناوەکییەوە هەیە، ئەو دوژمنایەتییە ناوەکییەی کە ئەحمەدی نەژاد جارێکی تر و بە شێوەیەکی بەرفراوانتر لە هەموو کات لەنێوان کۆمەڵگای ئێرانی و دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتەدا دروستی کردوە. ئەمڕۆ ئەم کۆمەڵگایە داواکاری و خواستێکی هەیە تەواو ناکۆک بەوەی دەسەڵاتدارانی وڵاتەکە هەیانە، لە ڕاستیدا ڕووخاندنی ئەو دەسەڵاتدارێتییە یەکێکە لە خەون و چاوەڕوانییەکانی ئەو کۆمەڵگایە.

**ناکۆکی لەگەڵ دراوسێکاندا**

ترسی وڵاتانی ناوچەکە لە ئێران ترسێکی گەورەیە، بەتایبەتی ترسی سعودیە و وڵاتانی کەنداو و ئیسرائیل. بوونی ئێران بە هێزێکی خاوەن بۆمبای ئەتۆمی هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیە لەسەر ئەو وڵاتانە و لەسەر ئاسایش و هاوکێشەی هێز و دەسەڵات لە ناوچەکەدا. بۆیە یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی سیاسەتی دەوڵەتانی ئەو ناوچەیە، ئیدی لە دراوسێکانی ئێرانەوە بیگرە، تا ئەو وڵاتانەی تر کە "بۆمبا شیعی"یەکەی ئێران وەک هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەییان دەبینن، هەوڵدانە بۆ ڕێگەگرتن لە بەهێزبوونی ئێران و بوونی بە هێزێکی ئەتۆمی لە ناوچەکەدا. دروستکردنی ڕێگریی گەورە لەبەردەم ئێراندا بۆ بوونی بە هێزێکی ناوچەیی ئەتۆمی، بەشێکی گرنگی لە سیاسەتی تورکیا و سعودیە و ئیسرائیل و ئەمەریکا و

دەوڵەتانی ئەوروپایە. لەم ڕووەوە سەپاندنی ئابڵۆقەی ئابووری بەسەر ئێراندا تەعبیر لە ویستی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ئەکات بۆ ڕێگرتن لەوەی ئێران ببێت بە هێزێکی ئەتۆمی.

وەک پێشتریش ئاماژەم پێ کرد، دونیای دوای ڕوخاندنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین و تاڵیبان لە ئەفگانستاندا، دونیایەکە تیایدا ئێران بە شێوەیەکی بەرچاو بەهێز بووە، عێراق لە دوژمنێکی سەرسەختی ئێرانەوە گۆڕاوە بۆ دەسەڵاتدارێتییەکی شیعیی دۆستی ئێران. ئەمە وای کردوە بەشێکی زۆری دەوڵەتانی ناوچەکە لە بە"عێراقیبوونی" وڵاتانی ناوچەکە بترسن، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی کە هێزی شیعەی بەهێزیان تێدایە، وەک لوبنان و بەحرێن و تەنانەت سووریا. لە ڕاستیدا سەرجەمی وڵاتانی کەنداو، عێراقی ئەمڕۆ وەک بەشێک لە ئێران وێنا دەکەن. بۆیە بە هەر شێوەیەک بووە هەوڵ ئەدەن لە ڕێگای دروستکردنی کێشەوە لە عێراقدا بۆ ئێران نەهێڵن ئێران کاتی ئەوەی هەبێت خەریکی بەشەکانی تری ناوچەکە بێت. لە ساڵانی ڕابردوودا فیدائییە سونییەکانی ئەردەن و سعودیە و وڵاتانی کەنداو دەهاتن و خۆیان بە شوێن و کەس و دەزگا شیعییەکاندا دەتەقاندەوە. بەشێکی زۆری ئەو خوێنەی لە ساڵانی ڕابردوودا لە عێراقدا ڕژا، خوێنێکە دەست و پەنجەی وڵاتان و هێزە سونییەکانی دراوسێی عێراق لێی بەرپرسیارن. ئەم دۆخە تا ئەمڕۆش چارەسەر نەکراوە، ئەوەی ئەمڕۆکە بڕ و ڕادەی توندوتیژی لە عێراقدا کەمی کردوە، پەیوەندیی بە دروستبوونی پەیوەندییەکی تەندروستەوە لەنێوان شیعە و سوننەی عێراق و شیعە و سوننەی ناوچەکەوە هەیە، هەروەها پەیوەندی بە سەرلەنوێ داڕشتنەوەی پەیوەندیی نێوان ئێران و ناوچەکەوە

نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە سەرکەوتنی شیعەکانی عێراقەوە هەیە لە دروستکردنی دەزگای مەحکەمی هەواڵگری و پۆلیس و سوپا و هێزی ترەوە بۆ دۆزینەوە و بەرهنگاربوونەوەی ئەو توندوتیژییە، لەمەشدا پێناچێت ڕۆڵی ئێران بچووک بووبێت.

**ئێران و کورد**

بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندیی نێوان ئێران و کورد پەیوەندییەکی نابەرابەر و پڕ فشار و توندوتیژی و کوشتن و بڕین و پەلاماردانە. کوردەکانی ڕۆژهەڵات ئەمڕۆ لەبەردەم هەڕەشە و پەلاماری سەربازیی بەردەوامدان، ڕۆژانە خەڵکیان لێ دەگیرێت و دەکوژرێت، ژمارەیەکی زۆریان ڕاو ئەنرێن و ئاوارەی وڵاتانی تر دەکرێن، لە سەروو هەموو ئەمانەشەوە دەسەڵاتدارانی ئێرانی بە شێوەیەکی بەردەوام نکوڵی لە مافە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی کوردەکانی ئەو وڵاتە دەکات.

لە پەیوەندیدا بە بەشەکانی تری کوردستانەوە، ئێران بە درێژاییی بیست ساڵی ڕابردوو زۆر لهنزیکەوە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و تورکیا و سووریادا کاری کردووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی خواست و ویستی خەڵکی ئەو پارچانەی کوردستان. لە دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین و دروستبوونی هەرێمێکی نیمچە سەربەخۆوە لە کوردستانی باشووردا، ئێران ئەو هەرێمەی هەم وەک بازاڕێکی گرنگ بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکانی بینیوە و مامەڵە کردووە، هەم وەک شوێنێک تیایدا کاریگەریی گەورەی هەبێت و بەکاری بهێنێت بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی لە عێراقدا، هەروەها وەک

شوێنێک تیایدا هێزە سیاسییەکانی کوردستانی خۆرهەڵاتی تێدا لاواز بکات و سڵیش لەوە نەکاتەوە بەدزییەوە کادر و کەسایەتییە چالاک و ناسراوەکانیشیان تیرۆر بکات. ئەگەر کاریگەریی تورکیا لەسەر پارتی دیموکراتی کوردستان و لەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتی گەورە بێت، ئەوا کاریگەریی ئێران لەسەر یەکێتیی نیشتیمانی و لەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا گەورەیە. ئەگەر پارتی ئەمڕۆ لە بەرەی تورکیا و سوننەی عەرەبی عێراقیدا خۆی ببینێتەوە، ئەوا یەکێتی خۆی لە بەرەی ئێران و شیعەی عەرەبی عێراقدا دەبینێتەوە. ئەم دابەشبوونەی دوو هێزە دەسەڵاتدارەکەی هەرێم بەسەر ئەو دوو هێزە ئیقلیمییە گەورەیەدا، نەک ئەگەری دروستکردنی دەوڵەتی کوردی لە کوردستانی باشووردا بەهێز ناکات، بەڵکو ئەگەری تەقینەوەی زیاتر و دابەشبوونی ناوەکیی گەورەتر لەناو هەرێمدا زیاتر و گەورەتر دەکات.

# سەرچاوەکان

١-بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

Nasr, Vali (2006). The Shia Revival: How Conflicts within Islam Will Shape the Future .New York, W. W. Norton.p. 34.

٢-بۆ سەرلەنوێ پێناسەکردنەوە و دارشتنەوەی شیعیزم وەک ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕ بڕوانە ئەم کتێبە گرنگەی حەمیدی عینایەت:

Enayat, Hamid. (2004). Modern Islamic political thought: the response of the Shī>ī and Sunnī Muslims to the twenthieth century. London ; New York, I.B. Tauris. p 180-188.

٣- بڕوانە سەرچاوەی یەکەم لە پەڕەکانی ٢١و ٢٢و ٢٣.

٤- بڕوانە هەمان سەرچاوە ل ٢٠.

٥- هەمان سەرچاوە ل ٢٢٢

٦- هەمان سەرچاوە ل ٢٢٢

٧- هەمان سەرچاوە ل ٢٢٣

٨- هەمان سەرچاوە ل ٢١٧

٩- بڕوانە:

Dries, Tim (2010). De groene beweging en haar strijd voor politieke en sociale hervormingen: een nieuwe revolutie voor Iran?. UGent. Faculteit Politieke en Sociale Wetenschappen. p. 15.

١٠- بڕوانە ئەم دوو سەرچاوەیە:

Ahmadi, S. (2010). Not their parents revolution. [29.03.2010, Le Monde Diplomatique: http://www.wsws.org/articles/2010/feb2010/pers-f20.shtml].

Jafari, P. (2009). The Resilient Republic: can civil society bring change? Symposium Facing the Future: 30 years of the Islamic Republic of Iran. Amsterdam: University of Amsterdam

١١- بڕوانە:

Takeyh, R. (2007). Hidden Iran: Paradox and Power in the Islamic Republic. New York: Holt Paperbacks.

١٢: بڕوانە:

Hoodfar, S. en Sadr. (2009). Can women act

as agents of a democratization of theocracy in Iran?. Genève: United Nations Research Institute For Social Development.

Siamdoust, N. (15.06.2009). Tehran>s Rallying Cry: <We Are the People of Iran>". [20.06.209, Time Magazine: http://www.time.com/time/world/article/0,8599,1904764,00.html?xid=rsstopstories].

١٣- بڕوانە:

Dries, Tim (2010). De groene beweging en haar strijd voor politieke en sociale hervormingen: een nieuwe revolutie voor Iran?. UGent. Faculteit Politieke en Sociale Wetenschappen.

# بەشی پێنجەم

## پرۆژە گەورەکان

## عەرەبستانی سعودیە و خەونی بەسەلەفیکردنی ناوچەکە

## عەرەبستانی سعودیە و خەونی بەسەلەفیکردنی ناوچەکە

**سەرەتا**

عەرەبستانی سعودیە یەکێکە لە وڵاتە هەرە دەوڵەمەند و هەرە دینی و هەرە داخراوەکانی دونیا، هەم گۆمێکی گەورەی نەوتە و هەم بیابانێکە پڕ لە دین. لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا یەکێکە لە گەمەکەرە سیاسییە گەورەکان، لە ئاستی جیهانیشدا ئەندامە لە یانەی بیست وڵاتە دەوڵەمەندەکەی دونیادا. عەرەبستانی سعودیە لە دوای شۆڕشی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩ لە ململانێیەکی توندداپە لەگەڵ ڕژێمە ئیسلامییەکەی ئێراندا. سعودیە ئەمڕۆکە لە زۆر شوێنی ناوچەکەدا، بۆ نموونە، لە میرنشینەکانی کەنداو و لە عێراق و سووریا و لوبنان و یەمەندا، لە بەگژاچوونەوە و ململانێیەکی سەرسەختدایە لەگەڵ دەسەڵاتی ئێراندا. جگە لەمە عەرەبستانی سعودیە خەریکی بەگژاچوونەوەیەکی ڕۆژانەی دەرەنجامەکانی بەهاری عەرەبی و پاراستنی خۆی و پاراستنی ڕژێمە پادشایی و میرنشینییەکانی کەنداوە لەو شەپۆلی گۆڕانکارییەی لەگەڵ بەهاری عەرەبیدا ناوچەکەی گرتۆتەوە.

## نەوت و دین و دەسەڵات

سیتسمی سیاسیی عەرەبستانی سعودیە سیستمێکی پاشایەتی دەسەڵاتگەر و ستەمگەرە، وڵاتەکە نە دەستووری هەیە، نە پارتی سیاسیی مۆڵەتدراوی تێدایە، نە سەندیکای یاسایی و ڕێپێدراوی هەیە، نە دەسەڵاتەکان تیایدا لەیەکتری جیا کراونەتەوە، نە دەزگا و یاسا و لایەنێک هەیە بتوانێت لە چۆنیەتیی پیادەکردنی دەسەڵات و لە کار و کردەوەی دەسەڵاتداران بپرسێتەوە. هەروەها هیچ ڕێکخراو و ئۆرگانێکی سیاسی و ناسیاسی بۆیان نییە هەبن، گەر دەسەڵاتداران پێشوەخت ڕێگەیان بە دروستبوونیان نەدابێت.(١)

دەسەڵات لە عەرەبستانی سعودیەدا دەسەڵاتێکی بنەماڵەییە. لە ڕۆژی دروستکردنی دەوڵەتی سعودیەوە لە ساڵی ١٩٣٢ەوە، بنەماڵەی ئال سعود دەستیان بەسەر هەموو بازنە سەرەکییەکانی دەسەڵاتدا گرتووە. ئەندامانی ئەم بنەماڵە دەسەڵاتدارە لەمڕۆدا هێجگار زیادی کردوە، ژمارەی ئەو ئەمیرە و ئەمیرانەی سەر بەم خانەوادەیەن لەنێوان ٣ تا ٥ هەزاردان و چاوەڕوان دەکرێت لە چەند ساڵی داهاتوودا بە هۆی ژنخوازی و منداڵبوونی زۆرەوە ئەم ژمارەیە دووقات ببێت. زۆربەی هەرەزۆری ئەم شازادانە هیچ ئیش و کارێکی ڕەسمییان نییە، بەڵام هەریەکێکیان مانگانە دەیان هەزار دۆلار مووچە وەر دەگرێت، بە ئارەزووی خۆیان و بەخۆڕایی بۆ کوێ بیانەوێت بە فڕۆکەکانی سعودیە بێ پارەدان سەفەر دەکەن و چۆنیشیان بوێت ئاوا زەویوزاری وڵاتەکە

بە نرخێکی زۆر هەرزان بەسەر خۆیاندا دابەش دەکەن.(٢) هەموو پۆستە سیاسی و ئەمنی و سەربازی و ئیدارییەکانی وڵاتیش بەسەر ئەندامانی ئەم بنەماڵەیەدا دابەش کراون. سەرەڕای زۆریی ژمارەی ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە، هاوکات هیچ وڵاتێک لە دونیادا ئەوەندەی سعودیە دەسەڵاتداری پیری تیادا نییە، ئەم وڵاتە کۆمەڵێک پادشا و ئەمیر حوکمی دەکەن کە زۆربەیان پیر و پەککەوتە و نەخۆشن. لەم ساڵانەی دواییشدا بەشێک لە گەنجانی بنەماڵەکە دەستیان گرتووە بەسەر ئەو کەرتە ئابوورییانەدا کە قازانجی زۆر و ئاسان دەکەن، خۆکردن بە شەریکی ئەو بازرگان و خاوەن کۆمپانیایانەش کە سەرکەوتوون و قازانجی زۆر و گەورە دەکەن، بەشێکە لەم سیاسەتە.(٣)

بەپێی هەندێک سەرچاوە ڕێژەیەکی سەدیی گەورەی پارەی نەوتی ئەو وڵاتە ناچێتە حیساباتی ڕەسمیی دەوڵەتەوە و نابێت بە بەشێک لە بودجەی ڕەسمیی وڵاتەکە، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەچێتە گیرفانی ئەم لەشکرە لە شازادەی کچ و کوڕەوە. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە نەوت پایە هەرە سەرەکییەکەی دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە بنەماڵەییە دەستنیشان دەکات، ئەم پارەیەش پارەیەکی بێشومارە. عەرەبستانی سعودیە تەنها لەنێوان ساڵی ٢٠٠٨ و ٢٠١٠ بایی ٥٠٠ ملیار دۆلار نەوتی لە بازاڕەکانی دونیادا فرۆشتوە، ئەم پارەیەش لە قاسەیەکی مەرکەزیدا کۆ کراوەتەوە، کە لەژێر دەستی بنەماڵەی ئال سعوددایە. سعودیە نزیکەی ٢١ لە سەدی وزەی بەکارهاتووی هەموو دونیا بەرهەم دەهێنێت و نزیکەی

٢٥ لە سەدی یەدەگی نەوتی ئەم ئەستێرەیەش لەو وڵاتەدایە. ئەمەریکا گەورەترین وڵاتی دونیایە کە نەوتی سعودیە دەکڕێت و بەکار دەهێنێت.(٤) سەرەڕای ئەو هەموو پارەیەی لەو وڵاتەدا هەیە، کەچی هێشتا زیاد لە ٢٠ لە سەدی کۆمەڵگای سعودی نەخوێندەوارە، نزیکەی ٣٠ لە سەدی بێئیشە، ڕێژەی بێئیشی لەناو ئافرەتاندا هێجگار بەرزترە و لە هەندێک شوێندا ٧٠ تا ٨٠ لە سەدە. هاوکات نزیکەی ٥ ملیۆن کرێکاری کۆچکردوو لەو وڵاتەدا کار دەکات و زۆربەی هەرەزۆریان وەک کۆیلە مامەڵە دەکرێن. ئەم کرێکارانە زۆربەیان خەڵکی هەژار و نەداری پاکستان و ئەندەنوسیا و فلیپین و وڵاتانی تری ئاسیای دوورن و ئەو کارانەی سعودییەکان خۆیان نایکەن بە پارەیەکی کەم بەم کرێکارە کۆچکردووانە ئەنجامی ئەدەن. خانمێکی هۆڵەندیی دۆستی من، ساڵی پار نامەیەکی دکتۆرای هێجگار گرنگی لەسەر دۆخی کرێکاری کۆچکردوو بۆ سعودیە نووسی، ئەو کتێبە پڕیەتی لەحیکایەتی تۆقێنەری مامەڵەی نائینسانیی سعودییەکان بۆ ئەو کرێکارانە و ئەو لێکۆڵەرەوەیە هەلومەرجی ژیانی ئەو کرێکارە کۆچکردووانە بە هەلومەرجی "کۆیلایەتیی نوێ" ناو دەبات.(٥)

بنەماڵەی دەسەڵاتداری ئال سعود بۆ پاراستنی ئەم دۆخە، هەموو دەسەڵاتەکانیان لە دەستی خۆیاندا کۆ کردۆتەوە، هێزێکی گەورەی سەربازی و پۆلیس و ئاسایشی نهێنی و ئاشکرایان دروست کردوە، هیچ ڕێکخراوێک، چەند بچووک و کەمکاریگەریش بێت، بۆی نییە بەبێ پرس و وەرگرتنی مۆڵەتی ڕەسمی لە دەسەڵاتداران، دروست ببێت. مافی خۆپیشاندان و

نارەزاییدەربڕین قەدەغە و یاساغ کراوە و تێگەیشتنی ڕەسمی بۆ دەسەڵات لە وڵاتەکەدا بریتییە لە گوێڕایەڵیی تەواوی کۆمەڵگا بۆ پادشا و بنەماڵەی دەسەڵاتدار. ئەم ستەمگەرییە سیاسی و کۆمەڵایەتییە لە وڵاتەکەدا لە ڕێگای لێکدانەوەیەکی تایبەتی ئیسلامەوە ڕەوا کراوە و دەسەڵاتدارانی سعودیە ژمارەیەکی زۆری پیاوانی ئاینیی وەهابییان لەبەردەستدایە، کە ئەرکی سەرەکییان بەخشینی ڕەوایەتییە بەو سیستمە. بوونی قەبری پێغەمبەری ئیسلام و شوێنەوار و ڕەمزە دینییەکانی تری ئیسلام لەو وڵاتەدا، وای کردوە سعودییە دەسەڵاتێکی دینیی گەورەی هەبێت، واتە خاوەنی "دەسەڵاتێکی نەرم"ی گەورە بێت و ئەم دەسەڵاتەش بە شێوەیەکی بەرفراوان بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی عەرەبستانی سعودیە لە ناوچەکە و لە دونیادا بەکار بهێنێت. بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە دۆخی ئەمڕۆکەی سعودیە، سەرنجێکی کورت و خێرا لە مێژووی ئەو وڵاتە پێویستە.

## سێ دەوڵەت

لە مێژووی سعودیەدا باس لە سێ قۆناغی دروستبوونی دەوڵەتی سعودی دەکرێت. حیکایەتی دروستبوونەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٤٤، کاتێک محەمەدی کوڕی سعود، سەرۆکی خێڵی ئال سعود، لەگەڵ محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب (١٧٠٣-١٧٩٢)، دامەزرێنەری ڕێبازی وەهابیزم، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن ناوچە جیاوازەکانی جەزیرەی عەرەبی داگیر بکەن و یەک بخەن. بەپێی ئەم ڕێککەوتنە

ئەرکـە سیاسـی و دینییـەکان لەنێـوان ئـەو دوو کەسـەدا بـەم شـێوەیە دابـەش کـرا. محەمـەدی کـوڕی سـعود لـە ڕووی سیاسـییەوە ببێـت بـە سـەرۆکی دەوڵەتەکـە و لـە ڕووی دینییشـەوە محەمـەد عەبدوەلوەهـاب ببێت بـە سـەرۆکی ئاینـی. (٦) ئەم دابەشکردنە تایبەتەی دەسـەڵات و ئەم کارە پێکەوەییە بووە هـۆی دروسـتبوونی "دەوڵەتـی یەکەم"ی سعودیە. بـەڵام ئـەم دەوڵەتـە زۆری نەخایاند، بە هۆی یاخیبوون و پەلاماردانی ناوچەکانی دەورروبـەر و ترسـاندنی دانیشـتووانی ئـەو ناوچانـە، عوسـمانییەکان لـە سـاڵی ١٨١٨دا پەلامـاری ئـەم دەوڵەتەیـان دا و ڕووخاندیـان، بـەڵام هـەم نەوەکانـی ئـال سـعود و هـەم پیـاوە دینییـە وەهابییـەکان توانییـان جارێکـی تـر خۆیـان کـۆ بکەنـەوە و بەیەکـەوە "دووهـەم دەوڵـەت"ی سـعودی لـە سـاڵی ١٨٢٤ دروسـت بکـەن. ئـەم دەوڵەتـەش جارێکـی تـر لەلایـەن عوسـمانییەکانەوە پەلامـار درا و لـە سـاڵی ١٨٩١ ڕووخێنـرا. "دەوڵەتـی سێهەم"ی سعودی، ئـەو دەوڵەتـەی ئەمڕۆ هەیە، لە سـاڵی ١٩٣٢ بـە یارمەتیـی بەریتانیـا دروسـت کـرا.

لـە هەمـوو ئـەو قۆناغانـەی سـەرەوەدا و تا ئەمڕۆکـەش ئـەو ڕێککەوتنـە سیاسـییەی نێوان ئالی سـعود و ڕێبازی وەهابیـزم پارێزراو بووە. ئـەم ڕێککەوتنـە لـە زۆر ڕووەوە ڕۆڵێکی گرنگی بینیـوە و دەبینێـت لەدەستنیشـانکردنی سیاسـەتی سـعودیە لـە ناوخـۆی وڵاتەکـە و لـە ناوچەکـە و لـە ئاسـتی جیهانیشـدا. لەپـاڵ ئـەم ڕێککەوتنـەدا دەوڵـەت و کۆمەڵگای سـعودی لـە پشتی بەهێزکردن و قەڵەوکردنـی بڕی هـەرەزۆری بزووتنـەوە سـەلەفییە سـوننییەکانی ئەمڕۆکـەی ناوچەکـە و دونیـاوەن،

مێژووی ئیسلامی سیاسیی سوننی لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا لە سیاسەتی سعودیە و توانا مادی و مەعنەوییەکانی ئەو وڵاتە جیا ناکرێتەوە. هاوکات ڕۆڵی سعودیە لە دروستبوون و بەهێزبوونی ئیسلامی جیهادی و توندوتیژدا ڕۆڵێکی بەرچاوە و بەشێکی زۆری گروپە چەکدارە توندڕەوە ئیسلامییەکانی ساڵانی هەشتا و نەوەدی سەدەی بیستەم، لەلایەن سعودیەوە هاریکاری کراون، ئیتر لە موجاهیدینی ئەفغانییەوە بیگرە تا بە گروپەکەی تالیبان و هێزە دینییە سوننییەکانی ناو پاکستان و شوێنەکانی تر دەگات. ئەلقاعیدە خۆشی بەرهەمێکی سعودیە بوو و بە ڕادەیەکی زۆر هەم ئەو فەزا دینییە وەهابییە دروستی کرد کە لەسعودیەدا ئامادەیە، هەم ئەو دۆلاری نەوتەی کە دەچێتە ناو قاسەکانی ئەو وڵاتە و سەر حیسابی بانکی خێزانە دەوڵەمەندەکانی وەک خێزانەکەی بن لادن.

### وەهابیزم وەک ئایدیۆلۆژیا

وەک وتم، ئیسلامی وەهابی، یان وەهابیزم، یەکێکە لە پایە سەرەکییەکانی دەسەڵات لە شانشینی سعودیەدا. وەهابیزم جۆرێکی هێجگار داخراوی سەلەفیەتی دینییە و لەسەر لێکدانەوەیەکی حەرفیی قورئان و گوتەکانی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی دروست بووە، هاوکات لاساییکردنەوەی کار و کردەوەی نەوەی یەکەمی مسوڵمانەکان بە تاقە شێوازی ڕاستەقینەی ئیسلام دەزانن. وەهابییەکان پێیان وایە ئەوان خاوەنی تاقە لێکدانەوەیەکی ڕاستەقینەی ئیسلامن و هەموو

شێوازەکانی تری ئیسلام هەڵە و لادانن لە دینی خودا، تا ئەو شوێنەش دەڕۆن کە پەیڕەویکەرانی ڕێبازەکانی تر بە کوفر تۆمەتبار بکەن و تەکفیریان بکەن. ئیسلام لای وەهابییەکان دەبێت هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی تاکەکەسی و ژیانی دەستەجەمعی بگرێتەوە و ئامۆژگارییەکان چۆن ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر نووسراون، بێ هیچ لێلادان و زیاد و کەمییەک و بێ هیچ لێکدانەوە و دەسکاریکردنێک، وەک خۆی چۆن بووە ئاوا پەیڕەو بکرێن. لە مێژووی ئیسلامدا کەم گروپ هەبووە بە ڕادەی وەهابییەکان ئامادە بن مسوڵمانەکانی تر تەکفیکر بکەن و بەئاسانی بکوژن و لەناو ببەن. وەهابییەکان هەموو لێکدانەوەیەک لە دەرەوەی تێڕوانینی خۆیاندا بۆ ئیسلام بە "بیدعە" دادەنێن و بەگژیدا دەچنەوە. دوژمنە سەرەکییەکانی وەهابیزم ئیسلامی شیعە و ئیسلامی سۆفییەکانە، ئەوان ئەم دووانە وەک کوفر و بێدینی وێنا دەکەن. شوێنی دروستبوونی ئەم سەلەفیەتە دینییە دۆگمایی و داخراوە ناوچەی نەجدی سعودیەیە، کە یەکێکە لە ناوچە هەرە دواکەوتوو و خێڵەکی و داخراوەکانی ئەو وڵاتە.(٧) پارەی نەوتی سعودیە وای کردووە ئەم دیدە داخراو و دۆگمایی و کۆنەپارێزە بۆ ئیسلام بە بەشێکی زۆر گەورەی دونیادا بڵاو ببێتەوە و ببێت بە یەکێک لە تێڕوانینە هەرە سەرەکییەکان بۆ ئیسلام لەمڕۆدا. ئەم دیدە بۆ ئیسلام لەناو سعودیە خۆیدا نەوەیەکی توندڕەوی دروست کرد، بە ڕادەیەکی وا ١٥ کەس لەو ١٩ کەسەی خۆیان لە١١ی سێپتێمبەردا لە ئەمەریکا تەقاندەوە، سعودی بوون.

ئەگەرچی وەهابییەکان بەردەوام ڕەوایەتییەکی دینی بە کاروکردەوە و شێوازی حوکمڕانیی دەسەڵاتدارانی عەرەبستانی سعودیە دەبەخشن، بەڵام داخرانیان بە ڕادەیەکە تەنانەت دەسەڵاتدارانی سعودیە خۆشیان چەندین جار لەگەڵ باڵە ڕادیکاڵ و پەڕگیرەکانی ئەم قوتابخانەیەدا تووشی بەرەنگاربوونەوە بوونەتەوە. یەکەم بەرەنگاربوونەوەی گەورەی نێوان ئال سعود و وەهابییەکان لهساڵی ١٩٢٩دا ڕووی دا. ئەوکات پادشای سعودیە ژمارەیهکی زۆری لە وەهەبییەکان گرت و کوشت و ڕاو نان و زیندانی کرد. بەرەنگاربوونەوەی دووهەم لە ساڵی ١٩٧٩ ڕووی دا، لەو ساڵەدا و لەژێر کاریگەریی شۆڕشی ئێرانیدا گروپێکی ڕادیکاڵی وەهابی مزگەوتە گەورەکەی مەکە (کە کەعبەی تێدایە) داگیر کرد، سعودییەکان بە هاریکاریی هێزێکی کۆماندۆی تایبەتی مەشقپێکراوی فەرەنسی توانییان کۆتایی بەو داگیرکردنە بهێنن و کەعبەی لەژێر چنگ دەر بهێنن و زۆربەی هەرەزۆری یاخیبووەکانیش لەناو مزگەوتەکەدا بکوژن. بەرەنگاربوونەوەی سێیەمیش بەرەنگاربوونەوەی نێوان ئالی سعود و ئەو وەهابییانەیە کە لە دوای داگیرکردنی سەدام حوسەینەوە بۆ کوەیت و دوای پەنابردنی پادشای سعودیە بۆ ئەمەریکییەکان بۆ پاراستنی سعودیە لە سەدام حوسەین، ڕەخنەی توندیان لە پادشای سعودیە گرت و تاوانباریان کرد بە هێنانی لەشکری کافران بۆ سەرزەمینی ئیسلام. ئەم گروپە زۆربایەن سەر بە ڕێکخراوی ئەلقاعیدەی بن لادن بوون و لە دوای ساڵی دووهەزارەوە گلەیی و

گازەندەکانیـان لـە دەسـەڵاتدارانی سـعودی گواسـتەوە بـۆ ئاسـتی کەوتنـە چالاکیی خۆتەقاندنـەوە و پەلاماردانی دەوڵـەت خۆی. لە ٢٠٠٢ و ٢٠٠٤دا ژمارەیـەک لـەو وەهابییـە جیهادییانـە پەلامـاری کۆمەڵێـک بنکـەی نـاو سـعودیەیان دا و دەوڵەتـی سـعودیش کەوتـە گرتـن و ڕاوانـان و قەلاچۆکردنیـان.

دەسەڵاتی پیاوانی دینی وەهابی لە سعودیەدا هێجگار بەهێزە، وەهابییەکان لە هەموو شوێنێکی کۆمەڵگای سعودیدا ئامادەن و تێڕوانینەکانی وەهابیزم بووە بە بەشێکی گەورە لە یاساکانی ئەو وڵاتە، سیستمی خوێندن و پەروەردە لەژێر چاودێرییەکی بەردەوامی وەهابییەکاندایە، تا چەند ساڵێک لەمەوبەر بەشێکی زۆری میدیا و تەلەفیزۆن و ڕادیۆکانی ئەو وڵاتە تەرخانن بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونی ئەم گروپە، چالاکیی فەتوادەرکردن، کە کردەیەکی ڕۆژانەیە، لەژێر دەستی ئەماندایە. هەموو سیستمی داوەریی سعودییە لهژێر دەستی داوەر و پارێزەرە وەهابییەکاندایە. ئەمە جگە لهدەسەڵاتی پۆلیسی ئەخلاق، کە لە سعودیە ناوی "هەیئەی ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر"ی لێ نراوە و دەسەڵاتێکی هێجگار گەورەیان هەیە، بەتەواوی لەژێر دەستی وەهابییەکاندایە. لە ڕووی مێژووییەوە ئالی سعود و وەهابییەکان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە ئالی سعود خەریکی کاروباری دەوڵەت و حوکمڕانی بێت و شوێن و پێگە دەوڵەتییە گرنگەکانیان لەژێر دەستدا بێت، وەهابییەکانیش کۆمەڵگایان لەژێر دەستدا بێت. ئەگەرچی ئەمڕۆ ئەم دابەشکردنە هەندێک گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، بەڵام تا ئێستاش دابەشکردنی سەرەکیی کارکردنە لەنێوان دەوڵەت و

هێزە دینییەکەی ئەو وڵاتەکەدا. وەک پێشتریش وتم، بەخشینی ئەم هێزە زۆرە بە ئیسلامی وەهابی و کردنی بە تاقە شێوازێکی خاوەن دەسەڵات، بەشێکە لە سیاسەتی ناوەکی و ناوچەیی و دەرەکیی ئەم دەوڵەتە.

**ماف و ئازادی**

وەک وتم دەوڵەتی سعودی دەستورێکی نییە کە ماف و ئەرکەکانی هاووڵاتیان و حوکمڕانانی تیادا دەستنیشان کرابێت، دەسەڵاتەکەشی دەسەڵاتێکی سیاسی و دینیی ستەمگەر و دەسەڵاتگەرە. تا ئێستا شێوازی پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتداران و کۆمەڵگا لەم وڵاتەدا شێوازی پەیوەندیی نێوان ئاغا و ڕەعیەتە. پادشای وڵات وەک "وەلی عەهد" و ئەندامانی کۆمەڵگاش وەک منالی ئەو پادشایە نمایش دەکرێن. هەموو ئەو گروپە دینییانەی لە سعودیەدا دەژین و سوننەی وەهابی نین لە دۆخی بێمافییەکی ترسناکدا دەژین. ئەمانەش گروپگەلێکی زۆرن، لە ئیسماعیلییەکانەوە بیگرە بۆ سوفییەکان و لەوانیشەوە بۆ شیعەکان، ئەمە بێجگە لە گروپە دینییە نامسوڵمانەکانی وەک مەسیحیی کاتۆلۆیکی و پرۆتستانی و هیندۆسی. شیعەکانی سعودیە نموونەیەکی بەرچاوی سیاسەتی بێمافی و هەلاوێردن و خراپمامەڵەکردنن، ڕێژەیان لەنێوان ١٠ تا ١٥ لە سەدی دانیشتووانی وڵاتەکەیە، بەڵام بڕی ئامادەگییان لەناو دەزگا و دامەزراوە گرنگەکانی دەوڵەتدا نزیکی سفرە، ئەگەر سفریش نەبێت. لەو سەفەرەدا کە لە مانگی یەکی ساڵی ٢٠١١دا بۆ سعودیە کردم و

لـە شـاری دەمـام لـە ڕۆژھەلاتـی ولاتەکـەدا، کـە زۆربـەی دانیشـتووانی شـیعەن، چـاوم بـە حەسـەن سـەفار، یەکێـک لـە ڕۆشـنبیرە دنییـە هـەرە سیاسـی و هـەرە کاریگەرەکانـی شیعەکانی سعودیە کەوت. حەسەن سەفار ئەم وێنە تاریکەی بارودۆخی شیعەکانی سعودیەی کێشا: "شـیعەکانی سـعودیە لە ڕووی سیاسییەوە بەتـەواوی پەراوێز خـراون، ناتوانن هیچ پۆستێکی گرنگ لە دەوڵەتدا وەر بگرن، لە هەمـوو ولاتەکـەدا نـە وەزیرێـک و نـە بریـکاری وەزیرێکـی شـیعە بوونـی نییـە. تەنانـەت لـە ناوچـە شـیعییەکاندا یـەک بەڕێوەبـەری گشـتی شیعە لەناو دەزگا بیرۆکراسییەکانی حکومەتدا بوونـی نییە. لە ئاستی دینیدا شیعەکان ناتوانن مزگەوتـی تایبـەت بـە خۆیـان دروسـت بکـەن، لـە شـارێکی وەک نەجرانـدا، کـە نزیکـەی نیـو ملیۆن شـیعە هەیـە، شـیعەکان ناتوانـن یـەک مزگەوتـی تایبـەت بەخۆیـان دروسـت بکـەن. لـە شـارێکی وەک دەمامـدا، کـە ٢٥ لـە سـەدی دانیشـتووانەکەی شـیعەن، شـیعەکان قەبرسـتانێکیان نییـە مردووەکانـی خۆیانـی تێدا بنێژن و بەزەحمـەت شـوێنێک ئەدۆزنـەوە بـۆ ناشـتنی مردووەکانیـان. لـە ناوچـەی ئەحسـادا کـە ٦٠ لـە سـەدی دانیشـتووانەکەی شـیعەن ٤٠٠ قوتابخانـە هەیە، تەنانـەت تەنها یـەک بەڕێوەبـەری ئـەو قوتابخانانە شـیعە نییـە. ئەمـە جگـە لـەوەی کـە تـا ئێسـتاش لـە کتێبـی قوتابخانـە سـەرەتاییەکاندا نووسـراوە، کـە شـیعەی بێدینن، لـە هەندێـک شـوێندا ئەمـە لا بـراوە، بـەڵام چونکـە زۆربـەی هـەرەزۆری مامۆسـتاکان وەهابیـن، دیسـانەوە منداڵانـی ئـەم ولاتـە فێـر دەکرێـن کـە ئێمـە بێدیـن و بێئیمانیـن".(٨)

لە شیعەکان بێمافتر لە شانشینی سعودیەدا ئافرەتانی ئەو وڵاتەیە. هەموو سیستمە کۆمەڵایەتییەکە لەو وڵاتەدا، بەتایبەتی سیستمە ئەخلاقی و دینییە باڵادەستەکە، لەسەر جیاکردنەوەیەکی هەمەلایەن و قووڵی نێر و مێ لەیەکتری دروست کراوە. دابڕانی نێر لە مێ شووناسی ئەو لۆژیکە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەیە کە ساڵانێکی درێژە لە سعودیەدا ئامادەیە و ئەوەشی ئەم لۆژیکە دەپارێزێت و سەرلەنوێ بەرهەمی دەهێنێتەوە، بە پلەی یەکەم، ئەو نوخبە وەهابییە کۆنەپارێزە دەسەڵاتدارەیە کە ڕەوایەتی بە سیستمە سیاسییەکە دەبەخشێت. بێگومان ئەم لۆژیکە کۆمەڵایەتییە تاکە لۆژیکێک نییە لە سعودیەدا ئامادە بێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەم لۆژیکە لۆژیکی باڵادەستە و باڵادەستییەکەشی شانی داداوەتە سەر توانای بەکارهێنانی دەزگا و دامەزراوەکانی دەوڵەت و دەزگا و دامەزراوەکانی ئەو نوخبە وەهابییە باڵادەستە کە ئامادەیە لەلایەن ئەم لۆژیکەوە. ئەمڕۆ هێدی هێدی هەڵگران و پارێزەرانی ئەم لۆژیکە دەکەونە ژێر فشارەوە، فشارێکی هەمەلایەنیش، هۆکارەکانی دروستبوونی ئەم فشارەش زۆرن و من لێرەدا کات و شوێنی ئەوەم نییە بەوردی باسیان بکەم، بەڵام گێڕانەوەی چیرۆکی گڕگرتنی قوتابخانەیەکی کچان لە ساڵی ٢٠٠٢ هەندێک هێڵی ئەو نارەزایەتییە کۆمەڵایەتییانەمان بۆ نیشان ئەدات کە کۆمەڵگای سعودیدا بەرامبەر بەم لۆژیکە دروست بووە.

ساڵی ٢٠٠٢ لە شاری مەکە ئاگر بەر بووە قوتابخانەیەکی کچان، بەر لەوەی قوتابییە کچەکان بتوانن بینای گڕگرتووی قوتابخانە جێ بهێڵن، ئەندامانی "لیژنەی ئەمر بە مەعروف و

نەهی لە مونکەر" دەگەنە بەردەمی قوتابخانەکە. لەبەر ئەوەی کچە قوتابییەکان جلی ئیسلامییان لەبەردا نەبووە و ئەو ئاگرکوژێنەوانەش کە هاتبوون ئاگرەکە بکوژێننەوە پیاو بوون، پۆلیسی ئەخلاق، واتە "هەیئەی ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر"، ناهێڵن نە کچەکان قوتابخانەکە بەجێ بهێڵن، نە تاقمی ئاگرکوژێنەوەکان بچنە ناو قوتابخانەکە. بۆ ئەوەی ڕێ لە تێکەڵبوونی پیاوان و ژنان بگرن. بۆیە ژمارەیەکی زۆری کچە منداڵەکانی ناو قوتابخانەکە ئاگر دەیانسوتێنێ و دەمرن.(٩). هەواڵی ئەم ڕووداوە بەناو سعودییەدا بڵاو بووەوە و "پۆلیسی ئەخلاق"ی سعودی بۆ یەکەم جار بووە شوێنی ڕەخنەگرتنێکی سەخت لە هەموو لایەکەوە. ئەم ڕووداوە ترسناکیی ئەو لۆژیکە دینی و کۆمەڵایەتییە باڵادەستەی نیشان دا کە لەسەر دابڕانێکی ڕەهای نێر لە مێ دروست بووە و کار دەکات. نموونەیەکی تر کە لۆژیکی بێمافکردنی ئافرەتان لەو وڵاتەدا نیشان ئەدات مەسەلەی بوونی مافی لێخوڕین و لێنەخوڕینی ئۆتۆمبێلە لەلایەن ئافرەتانی سعودیەوە. ئەگەرچی سعودیە وڵاتێکی دەوڵەمەندە و بە ملیۆنان ئوتومبێلی گرانبەهای تێدایە، بەڵام ئافرەتانی سعودی بۆیان نییە ئوتومبێل لێبخوڕن. تا ئێستا ئافرەتانی ئەو وڵاتە چەندان جار گردبوونەوە و ناڕەزایەتییان دەر بڕیوە، بەڵام نوخبە وەهابییە باڵادەستەکە ئەم لێخوڕینەی تا ئەم ساتەی ئێستامان حەرام کردوە.[1] دەرکەوتێکی تری بێمافی، بەشوودانی

---

١ - لە زەمەنی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا، هێشتا شوفێریکردن بۆ ئافرەتان لە سعودیەدا ڕێپێدراو نەبوو، بەلام ئێستا ئافرەتی سعودی بۆی هەیە شوفێری بکات بە کۆمەڵێک مەرجی سەرەتاییەوە. (ئەندێشە)

منالانە لە تەمەنێکی زۆر بچووکەوە، هەندێک لە تەمەنی دە ساڵییەوە. مەسەلەیەکی تر نەتوانینی ئەنجامدانی سادەترین کارە بەبێ ڕەزامەندیی پیاو. ئەمە جگە لەوەی بە ملیۆنان ئافرەت هەن کە بێئیشن و ڕێگەی کارکردنیان پێ نادرێت.

ئەم دۆخە بووەتە هۆی دروستبوونی چەندان گرووپی کۆمەڵایەتیی نارازی لە وڵاتەکەدا. ئەم گرووپانە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە کولتووری نووسینی "نامەی کراوە"یان بۆ پادشای ئەو وڵاتە داهێنا. نووسینی ئەم "نامە کراوانە" لە دوای داگیرکردنی عێراقەوە بۆ کوەیت دەستی پێ کرد، ئەودەم دەسەڵاتدارانی سعودیە بۆ پاراستنی خۆیان لە پەلاماری لەشکرەکەی سەدام حوسەین ٥٠٠ هەزار سەربازی ئەمەریکایان هێنایە ناو خاکی سعودیەوە. ڕیفۆرمخوازە دینی و نادینییەکان و چەندان گرووپی ئافرەتان ئەم هاتنەیان بە هەل زانی و دەستیان کرد بە داواکردنی چاکسازی لە سیستمە سیاسی و کۆمەڵایەتی و دینییەکەی وڵاتەکەیاندا. بە درێژاییی ساڵانی نەوەد و دواتریش لە ساڵانی دووهەزاردا، بەتایبەتی دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر، چاکسازیخوازەکان درێژەیان بەم تەکنیکی فشارخستنە سەر دەسەڵاتە دا. ئەگەرچی دەسەڵاتدارانی سعودیە بەشی هەرەزۆری نامەنووسەکانیان گرت و زیندانی کرد، بەڵام دواجار ناچار بوون گوێ لە برێک لە داواکارییەکانیان بگرن.(١٠)

دواهەمین هەڵمەتی نامەنووسین بۆ پادشا لە سەروبەندی بەهاری عەرەبیدا ڕووی دا، هەندێک لەو نامانە داوای ڕیفۆرمی دەوڵەتی سعودی دەکەن لە دەوڵەتێکی

پاشـایەتی ڕەهـای شەخسـی و بنەماڵەییـیـەوە بـۆ دەوڵەتـی مـاف و دەزگاکان، "الحقـوق و الموسسـات". هەندێـک لـە نامـە کراوەکان هێمایـان بـۆ دروشـمی سـەرەکیی بەهـاری عەرەبـی دەکـرد و بەئاشـکرایی نووسـیبوویان "الشـعب یریـد اصـلاح النظام". مەبەستیشیان لە چاکسازیی بریتییە لە دروستکردنی پەرلەمانێکی هەڵبژێـردراو، جیاکردنـەوەی دەسـەڵاتی پادشـا و سـەرۆکی وەزیران لەیەکتری، دروسـتکردنی دەزگای داوەریـی بێلایـەن و خـاوەن دەسـەڵات، بەگژاچوونـەوەی گەندەڵـی، چارەسـەرکردنی کێشـەی نیشـتەجێکردن و خانووبـەرە بـۆ گەنجانـی وڵات، هاریکاریکـردن و ئازادکردنـی "کۆمەڵـگای مەدەنـی"، ئازادکردنـی زیندانییـە سیاسـییەکان و فراوانکردنـی ڕووبـەری ئازادیـی تاکەکەسـی و بەشـداریکردنی سیاسـی. (١١) ئـەم داواکارییانـەش شـتگەلێکن دەسـەڵاتدارانی سـعودیە ئامـادە نیـن جێبەجێیـان بکـەن، ئەگەرچـی بەهـاری عەرەبـی گوڕوتینێکـی تایبەتـی بـەم جـۆرە داواکارییانـە لـە سـەرجەمی ناوچەکـەدا بەخشـیوە. لـە دوای بەهـاری عەرەبییـەوە دۆخـی ململانـێ و ناڕەزایـی لـە سـعودیەدا بـە ڕادەیـەک گـەورە بـووە، پاشـای سـعودیە ناچـار بـوو لـە ماوەیەکـی زۆر کورتـدا زیاتـر لـە ١٣٠ ملیـار دۆلار خـەرج بـکات بـۆ ئـەوەی خەڵکـی نـاڕازی وڵاتەکـەی بێدەنـگ بـکات. ئەگەرچـی لـە ئێسـتادا پێدەچێـت کۆمەڵـگای سـعودی بێدەنگـی هەڵبژاردبێـت، بـەڵام بەردەوامیـی ئـەو دۆخـەی باسـم کـرد ڕەچەتەیەکـی بەردەوامـە بـۆ دروسـتبوونی ناڕەزایەتیـی کۆمەڵایەتـی.

### پرۆژەی سعودیە بۆ ناوچەکە

وەک وتم، سعودیە وڵاتێکی گەورە و بەهێزە لەم ناوچەیەدا. هەم خاوەنی نەوتە، هەم خاوەنی ئیسلامێکی سەلەفیی داخراو و ترسناکە، هام خاوەنی تۆڕێکی گەورەی پەیوەندییە بە ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی ئەو ناوچەیەوە. سعودیە ئەم شتانە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکار دەهێنێت بۆ پاراستنی خۆی و پاراستنی دۆستەکانی لە ناوچەکەدا. بە درێژاییی ساڵانی شەست و حەفتا و هەشتا سیاسەتی سعودیە لە ناوچەکەدا لەسەر بەگژاچوونەوە و لاوازکردنی ڕێبازە سیاسیی نەتەوەیی و سۆسیالیستی و دیموکراسییەکان و لاوازکردنی دەوڵەتە مۆدێرنخوازەکانی ناوچەکە کاری کردوە. هەروەها لەپاڵ سیاسەتی ئەمەریکیدا و بە لۆژیکی جەنگی سارد بە گژ هەموو بزووتنەوەیەکی دیموکراسی و یەکسانخواز و پێشکەوتنخوازدا چۆتەوە لەو ناوچەیەدا دروست بووبێت. لە دوای شۆڕشی ئێرانیشەوە، ململانێکردن لەگەڵ تەماحە سیاسی و دینییەکانی ئێران لە ناوچەکەدا، بووە بە بەشێک لە سیاسەتی سعودیە. لە ئێستاشدا سعودیە لە سێ ئاستدا لە ناوچەکەدا سەرقاڵە.

یەکەم: بەگژاچوونەوەی بەهاری عەرەبی.

دووهەم: بەگژاچوونەوەی دەسەڵاتی ئێران.

سێهەم: پاراستنی ڕژێمە پادشاییەکانی ناوچەکە.

### سعودیە و بەهاری عەرەبی

ئەگەرچی سعودیە یەکێک بوو لەو وڵاتانەی پشتگیریی تەواوی لابردنی قەزافییان کرد لە لیبیادا، چونکە قەزافی

بەردەوام گاڵتەی بە حوکمڕانیی ئال سعود دەکرد و بە حوکمڕانییەکی دواکەوتوو و بەدەویی بەدناو ناوی دەبرد. بە هەمان شێوە ئەگەرچی سعودیە بۆ ململانێکردن لەگەڵ ئێران و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی بلۆکی شیعە لە ناوچەکەدا، پشتگیریی خۆپیشاندانەکانی سووریا دەکات بۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتی بەشار ئەسەد. بەڵام، وەک زانایەکی سیاسی دەڵێت، سیاسەتی سەرەکیی سعودیە بەرامبەر بە بەهاری عەرەبی، بریتییە لە هەوڵدان بۆ وێرانکردنی ئەم بەهارە و ڕێگرتن لەبڵاوبوونەوە و جێبەجێکردنی ئامانجە دیموکراسییەکانی.(١٢) لە ڕاستیدا سعودیە ئەمڕۆ سەرۆکایەتیی هێزە دژە شۆڕشەکان لە ناوچەکەدا دەکات و ئەو وڵاتەیە بە شێوەیەکی بەرفراوان کار بۆ وێرانکردنی ئەم بەهاری تووڕەبوونە دەکات. ئاشکرایە بەهاری عەرەبی هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیە لەو شێوازە لە دەسەڵاتداریتیی بنەماڵەیی لە ناوچەکەدا، لەو شێوازی حوکمڕانەی تیایدا دەسەڵات لە باوکەوە بۆ کوڕ و لەویشەوە بۆ کوڕی کوڕ و کوڕەزاکان دەمێنێتەوە. لە هەنگاوی یەکەمدا بۆ ڕێگرتن لە پەڕینەوەی ڕاپەڕینەکان بۆ سعودیە، دوای سەرکەوتنیان لە تونس و میسردا، دەسەڵاتدارانی سعودیە زیاد لە١٣٠ ملیار دۆلاریان خەرج کرد بۆ کڕینی خەڵک و هێمنکردنەوەی گروپە ناڕازییەکانی ناو سعودیە. بەرزکردنەوەی مووچەی فەرمانبەران، تەرخانکردنی پارە بۆ کردنەوەی خانوو بۆ گەنجان و بەخشینەوەی پارە بەسەر بێکاراندا، دیارترینی ئەو کارانە بوون کە دەسەڵاتداران بۆ ڕێگرتن لە تەقینەوەی

دۆخەکە لە سعودیەدا گرتیانە بەر.(١٣) هەر لە سەرەتای خۆپیشاندانەکانیشەوە نوخبە دینییە وەهابییەکەی سعودیە بەپەلە کەوتنە ئیدانەکردنی خۆپیشاندانەکان ناونانی بە "فیتنە" و دووبەرەکی و تێکدانی ماڵی ئیسلام و موسڵمانان. بە ناوی ڕێگرتن لە فیتنە و "پارچەپارچەبوونی ئوممەی ئیسلامی" فەتوای حەرامکردنی خۆپیشاندانیان دەر کرد. جارێکی تر هەوڵیان دایەوە دەسەڵاتدار وەک "وەلی ئەمر" نمایش بکەن و دیموکراسیەتیش وەک کوفر و وەک خۆفرۆشتن و نۆکەرایەتیکردن بۆ خۆرئاوا نیشان بدەن. بەکورتی دژایەتیکردنی بەهاری عەرەبی و دژایەتیکردنی داواکارییەکانی بەشی هەرەزۆری ئەو گوتارە دینییە بوو کە وەهابییەکانی سعودیە بۆ پاراستنی دەسەڵاتی ئال سعود خستیانە کار. ئەمەش کارێکی چاوەڕواننەکراو نەبوو، چونکە ئەوانەی لە هەر ئاڵوگۆڕێکی دەسەڵات لەو وڵاتەدا دوای بنەماڵەی ئال سعود و پادشا و ئەمیر و ئەمیرە زۆرەکانی ئەو بنەماڵەیە زیانیان لێ دەکەوێت، ئەو هەزاران ئیمامە وەهابییانەن کە بۆ بەخشینی شەرعیەتی دینی بە ڕژێمەکەی ئال سعود دەستکەوتێکی مادیی گەورەیان هەیە و دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیشیان خراوەتە بەردەست.

لەمە تێپەڕێت سیاسەتی سعودی بەرامبەر بە بەهاری عەرەبی لە هەوڵی کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانی ئەو بەهارەدایە لەسەر دۆخی باڵادەستی ناوچەکە و ڕێگرتن لە گۆڕانی تەرازووەکانی هێز لە ناوچەکەدا. لە هیچ شوێنێکدا هەڵوێستی سعودیە لە بەهاری عەرەبی بەئاشکرایی دەر

ناکەوێت وەک لە بەحرێندا. زۆریەتییەکی شیعە لە سعودیەدا دەژی، کەساڵەهایە وەک هاوڵاتیی پلەدوو و پلەسێ لەلایەن ئەو نوخبە سونییە دەسەڵاتدارەوە مامەڵە دەکرێن، کە وڵاتەکە بەڕێوە دەبەن. دەسەڵاتدارانی بەحرێن پەیوەندییەکی پتەویان بە دەسەڵاتی ئال سعودەوە لە سعودیەدا هەیە. کاتێک خۆپیشاندان لە بەحرێندا دەستی پێ کرد، سعودیە هێزێکی گەورەی نارد بۆ ئەم وڵاتە بۆ دامرکاندنەوە و سەرکوتکردنی دەیان هەزار خۆپیشاندەر کە داوای چاکسازیی سیاسی و نەهێشتنی سیاسەتی هەڵاواردن و چەوساندنەوەی تائیفییان دەکرد. ئەگەرچی هەم بەحرێن و هەم سعودیە بەپەلە خۆپیشاندانەکانیان دایە پاڵ ئێران، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەو خۆپیشاندانانە پەیوەندییان بە مامەڵەی خراپ و بێمافی و هەژاریی شیعەکانی ئەو وڵاتەوە هەیە.

سعودیە لە میسریشدا چالاکە بۆ پەکخستنی داواکاری و سنووردارکردنی دەرهنجامەکانی بەهاری عەرەبی. ئەگەرچی بەڵگەی ئاشکرا لەبەردەستدا نییە بۆ دەستێوەردانی سعودیە لە میسردا، بەڵام لهمیسری قۆناغی دوای موبارەکدا باس لەوە دەکرێت سعودیە بە ملیۆنەها دۆلاری خەرج کردوە بۆ بەهێزکردنی ئەو هێزە دینییە سەلەفییانەی لە سعودیەوە نزیکن. شتێک کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە زۆر گروپی سەلەفی لە میسردا ئاڵای سعودیەیان کردوە بە ڕەمزی خۆیان و لە گردبوونەوە سیاسییە گشتییەکانیاندا ئەو ئاڵایە هەڵئەدەن.(١٤) هاتنی پارەی سعودی بۆ سەلەفییەکانی میسر بۆ پەکخستنی پرۆسەی گواستنەوەیەکی ڕاستەقینەی

ئەزموونی سیاسیی ئەو وڵاتەیە بەرەو دیموکراسیەت و پەرەدان بە ئازادییە تاکەکەسی و گشتییەکان.

**سعودیە و ئێران**

پەیوەندی نێوان ئێران و سعودیە لهدوای شۆڕشی ئیسلامیی ئێرانییەوە پەیوەندیی ململانێیەکی هێجگار سەخت و بێئامانە، ململانێ لەسەر پەیداکردنی هەیمەنەی دینی و سیاسی لە ناوچەکەدا. لەلای خۆشیەوە ئێران هەموو هەوڵێکی داوە و ئەدات بۆ لاوازکردنی شوێن و جێی دینی و سیاسی سعودیە لە ناوچەکەدا. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، ئێران هەوڵی زۆری داوە و ئەدات لە گروپە شیعە عەرەبەکانی ناوچەکە و سعودیە نزیک ببێتەوە و بیانبەستێتەوە بە سیاسەتەکانی خۆیەوە لە ناوچەکەدا. وەک چۆن ئێران لە ناوچەی کەنداو و لە عێراق و سووریا و لوبناندا چالاکە و لەگەڵ کۆمەڵێک هێزی شیعی و سیاسیی دیاریکراودا کار دەکات، سعودیەش بە هەمان شێوە لەو وڵاتانەدا ئامادەیە و لەگەڵ هەندێک هێزی دژ بە ئێراندا کار دەکات. پلانی ئێرانیش بۆ بەرهەمهێنانی بۆمبای ئەتۆمی هەموو دەوڵەتەکانی لە ناوچەکەدا ترساندووە. لە تورکیاوە بۆ سعودیە و لە ئیسرائیلەوە بۆ شێخنشینەکانی کەنداو.

لە ململانێکردن لەگەڵ ئێراندا، سعودیە هەندێک هاوڕێی بەهێزی هەیە، لەپێش هەموانەوە ئیسرائیل و تورکیا. سعودیە و ئیسرائیل دوو شتی هاوبەشیان هەیە، یەکەمیان دوژمنێکی هاوبەش و دووهەمیش دۆستێکی هاوبەش، دوژمنە هاوبەشەکەیان ئێران و دۆستە هاوبەشەکەشیان ئەمەریکایە.

لەم ڕووەوە سعودیە کێشەی لەگەڵ ئیسرائیلدا نییە و ئەم دوو هاوبەشە وایان لێ دەکات بتوانن بەیەکەوە و بە هاریکاریی ئەمەریکا پێکەوە کار بکەن و پێکەوە بیر لە ئایندەی ناوچەکە بکەنەوە، بێگومان بە شێوەیەکی نهێنی و شاراوە. سعودیە لەگەڵ تورکیاشدا تەنها پەیوەندیی ئابووری بەهێز و پتەوی نییە، بەڵکو لەوەشدا یەکن کە دەبێت سنوورێک بۆ دەسەڵاتی ئێران لە ناوچەکەدا دابنرێت. وەک لە وتاری پێشوودا ئاماژەم پێ کرد لە سەرەتای نەوەدەکانەوە بەرەیەکی سوننیی وەهابی لەنێوان سعودیە و پاکستان و تاڵیبان لە ئەفغانستاندا دروست بوو بۆ دانانی فشاری بەردەوام لەسەر ئێران. ئەمڕۆکە ئەم بەرەیە دوای ڕووخانی تاڵیبان لاواز بووە، سعودییە لە هەموو کات زیاتر پێویستی بە ئیسرائیل و تورکیا هەیە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی دەسەڵات. بەکورتی ململانێی نێوان سعودیە و ئێران یەکێکە لە تەوەرە سەرەکییەکانی سیاسەت لە ناوچەکەدا و بەشێکی زۆری ڕیزبەستنە سیاسییەکانی ناوچەکە لەپاڵ ئەم ململانێیەدا دروست دەبن و کار دەکەن. ئەگەری پێکدادانی سەربازی لەم ململانێیەدا لەگەڵ ئێراندا ئەگەرێکی کراوەیە.

### سعودیە و ئەمەریکا

بە درێژایی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم سعودیە یەکێک بووە لە دۆستە هەرە نزیکەکانی ئەمەریکا، پەیوەندیی بەهێزی ئەمەریکا و سعودییە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی دروستبوونی دەوڵەتی سعودیە لە سیەکانی سەدەی بیستەمدا.

بەڵام لە دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر و بەشداریی ئەو هەموو سعودییە لە پەلاماردانی ئەمەریکادا، ئەم پەیوەندییە هەندێک کەلێنی تێ کەوت، ڕەخنەی ئەمەریکا لە سعودیە زۆر و فراوان بوو، تەنانەت ئەگەری ئەوە هاتە کایەوە کە ئەمەریکا پشت بکاتە سعودیە و هەوڵ بدات ئەلتەرناتیڤێک بۆ سعودییە لە ناوچەکەدا بدۆزێتەوە. یەکێک لە هۆکارەکانی پەلاماردانی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین بە مەبەستی ئەوە بوو عێراقی خاوەن نەوت بکرێتە بەدیل بۆ سعودیە. بەڵام ڕووداوەکانی دوای خستنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین بە ئاقارێکدا ڕۆیشتن ئەم خەون و ویستەی ئەمەریکا نەیەتە دی. ئەمە وای کرد جارێکی تر پەیوەندیی نێوان ئەمەریکا و سعودیە گەشە بکاتەوە و لەمڕۆدا ئەو کەلێنانە نەمێنن کە دروست بووبوو، لە ئێستادا پەیوەندیی نێوان ئەو دوو وڵاتە گەڕاوەتەوە بۆ دۆخی جارانی. سعودیە یەکێکە لە بازاڕە گەورە و گرنگەکانی ساغکردنەوەی کەلوپەلی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا، بۆ نموونە سعودیە یەکێکە لەو وڵاتانەی زۆرترین چەک لە ئەمەریکا دەکڕێت. سعودیە، تەنها لە ساڵی ٢٠١٠دا بایی ٦٠ ملیار دۆلار چەکیان لە ئەمەریکا کڕیوە. (١٥) سعودیە، نەک تەنها بووهتە بازاڕێکی گەورە و گرنگ بۆ کڕینی چەکی کۆمپانیا ئەمەریکییەکان، بەڵکو بازاڕێکی گەورەشە بۆ خستنەگەڕی خیبرەی سەربازیی ئەمەریکی و کڕینی ئەم خیبرەیە بۆ مەشق و سوودلێوەرگرتنی سەربازی. ئەم سوودوەرگرتنە بە جۆرێکە نووسەرێکی شارەزای سیاسەتی ئەمەریکی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەنووسێت:

لـە سـاڵانی حەفتـاوە بـۆ ئەمـڕۆ، ئەگـەر لـە دونیـادا هێزێـک هەبێت سـوودێکی هێجگار زۆری لـە داهاتـی نەوتـی سـعودی بینیبێت، ئـەوا کۆمپانیاکانـی دروسـتکردنی چـەک و تەقەمەنیـن لـە ئەمەریـکادا.(١٥) بەهـاری عەرەبـی هەندێـک دۆسـتی نزیکـی ئەمەریـکای لـە ناوچەکـەدا لەنـاو بـرد، لەوانـە موبـارەک و سـاڵحی یەمـەن، ئەمـەش جارێکـی تـر بووە هـۆی دروسـتبوونی گوڕوتینێکـی زیاتـر لـە پەیوەندیـی نێوان ئەمەریـکا و سـعودیەدا. هـاوکات چۆنیەتیـی بەرەنگاربوونـەوەی ڕووداوەکانـی بەهـاری عەرەبـی لـە ناوچـەی کەنداودا نیشـانی دایـن کـە ئەمەریکییـەکان لەپاڵ سیاسـەتی سـعودیدا وەسـتاون و بەرگـری لـە هێشـتنەوە و پاراسـتنی شانشـینییەکانی ناوچـەی کەنـداو دەکـەن. هەمـوو دونیـا بـە چـاوی خـۆی بینـی چـۆن سـعودیە بەبەرچـاوی ئەمەریکییەکانـەوە پەلامـاری خۆپیشـاندەرەکانی بەحرێنیـان دا، بەبـێ ئـەوەی ئەمەریکییـەکان تەنانـەت زەحمەتـی ئـەوەش بکێشـن نارەزاییەکـی سـادە بەرامبـەر بـەو ڕووداوانـە دەر ببڕن و ئیدانـەی بکـەن، چجـای هەوڵـی ئـەوە بدەن سـنوور بـۆ دەسـتێوەردانی سـعودیە لـە کاروبـاری ناوخـۆی ئـەو وڵاتـەدا دابنێن. بەکورتـی لـە ململانێی سـعودیەدا لەگەڵ بەهـاری عەرەبـی و بێگومـان لەگـەڵ ئێرانیشـدا، ئەمەریـکا لەپـاڵ سـعودیەدایە.

## سعودیە و عێراق

لـە سـاڵانی هەشـتادا کـە ڕژێمەکـەی سـەدام حوسـەین لەگـەڵ ئێرانـدا کەوتـە شـەڕ، سـعودیە یەکێـک لەپاڵپشـتە گـەورە و سـەرەکییەکانی ڕژێمەکـەی سـەدام حوسـەین بـوو، بـەڵام

داگیرکردنی سەدام بۆ کوەیت و فشارهێنانی بۆ سەر سعودیە و ناچارکردنی سعودیە بۆ پەنابردن بۆ ئەمەریکا بۆ پاراستنی خۆی لە ڕژێمەکەی سەدام حوسەین، هەڵوێستی سعودییەکانی بەتەواوی گۆڕی. لەدوای ئەزموونی هەڕەشەکانی سەدام حوسەینەوە سعودییەکان حەزیان بە بوونی عێراقێکی لاوازە لە ناوچەکەدا، عێراقێک نەتوانێت دراوسێ شانشینییەکانی بترسێنێت. لە دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەینیشەوە لە ساڵی ٢٠٠٣ و لە دوای ئەوەی دەسەڵات لە عێراقدا کەوتە دەستی شیعەکانی ئەو وڵاتە و دۆستەکانی ئێرانەوە، ترسی سعودیە لە دۆخی عێراق بە ڕادەیەکی گەورە زیادی کردووە. هەر لە دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەینەوە سعودیە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ گروپە سونییەکانی عێراقدا خۆش کردوە و لە ڕێگای پارەی زۆری نەوتەوە هاریکاریی کردون و هاریکارییان دەکات. پەیوەندیی بازرگانی و خوێن و دین لەنێوان ناوچە سنوورییەکانی سعودیە و ناوچە سوننییەکانی شاری ئەنبار و شوێنەکانی تری دەوروبەری ڕووباری فوراتدا هەمیشە هەبووە و بەهێز بووە، بەڵام لە دوای بەهێزبوونی دەسەڵاتی شیعەوە لە عێراقدا، سعودیە ئەم پەیوەندییانەی زیاتر بەهێز و فراوان کردوە. هەندێک خێڵی عێراقیی عەرەب درێژکراوەیان لە سعودیە هەیە و هەندێکی خێڵی سعودییش درێژکراوەیان لە عێراقدا هەیە. ئەمە جگە لە بوونی ڕێگاوبانی ڕەسمی و نارەسمی کە ناوچەیەکی زۆری سعودیە بە ناوچە سونییەکانی عێراقەوە گرێ ئەدات. ڕەنگە سعودیە پێی ناخۆش نەبێت عێراق پارچەپارچە ببێت، بەڵام

حەز دەکات ئەم پارچەپارچەبوونەی لە قازانجی ئەو هێزە سوننییە عەرەبانەدا بێت کە لەسعودیەوە نزیکن، بەتایبەتی هێزە سەلەفییە سوننییەکان، نەک بۆ نموونە لە قازانجی کوردا کە کێشە نەتەوەییەکەی ڕەهەندێکی دینیی بەهێزی نییە و کورد و سعودییە هیچشتێکیان نییە پێکەوە بەشی بکەن. بە بۆچوونی من ئەگەرچی ئەکرێت سوود لە حەز و ویستی سعودیە بۆ دروستبوونی عێراقێکی لاواز و بێهەڕەشە بۆ سەر سعودیە و شانشینەکانی ناوچەکە وەر بگیرێت، بەلام ئەم سوودوەرگرتنە هەرگیز ناگاتە ئەو ئاستەی چاوەڕوانی هاریکاری سعودی بین بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی.

# سەرچاوەکان

١-بڕوانە
Pascal Ménoret, The Saudi Enigma (London & New York: Zed Books, 2005). See also: Daryl Champion, The Paradoxical Kingdom: Saudi Arabia and the Momentum of Reform (New York: Columbia University Press, 2003).

٢- بڕوانە
JONES. C, TOBY. <Saudi ArabiaRegional Reaction: The royals have spared no expense in crushing or minimizing the impact of the revolutions. The Nation, September 12, 2011

٢- بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:
http://www.cbc.ca/news/background/saudiarabia/sauds.html

٣- مـن لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی ٢٠١٠ تـا کۆتایـی ٢٠١١،

واتە ساڵ و نیوێک، لە زانکۆی ئەمستردام خەریکی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەیەک بووم لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی سعودی. سێ سەفەری سعودیەم کرد و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری کەسانی سەر بە کۆمەڵگای مەدەنی و بازرگان و سەرمایەداری ئەو وڵاتەدا قسەم کرد. یەکێک لە سەرمایەدارە گەورەکانی ئەو وڵاتە پێی وتم کە هەندێک شازادەی سعودی ناچاریان کردووە کە بەشێک لە کۆمپانیاکانی بە نرخێکی هەرزان بەوان بفرۆشێت، چونکە ئەو کۆمپانیایانە قازانجی زۆریان دەکرد.

٤- بڕوانە:

Jones, Toby Craig. <Saudi Arabia Versus the Arab Spring>, Raritan: A Quarterly review, Rutgers University, p.45.

٥-بڕوانە:

Vlieger، Antoinette (2012).Domestic Workers in Saudi Arabia and the Emirates, a Socio-legal Study on Conflicts Authored by Antoinette Vlieger. Amsterdam.

٦- بۆ مێژووی سعودیە بڕوانە:

Madawi Al-Rasheed (2002). A History of Saudi Arabia, Cambridge, Cambridge University Press.

٧- دەربارەی وەهابیزم بڕوانە:

DeLong-Bas, Natana J. (2004). Wahhabi

Islam: From Revival and Reform to Global Jihad. Oxford University Press, USA.

٨- دەربارەی شیعە لەسعودیە بڕوانە:

Fouad Ibrahim (2006). The Shi>is of Saudi Arabia; (Beirut: Saqi Books, 2006). Madawi Al- Rasheed (1998).

'The Shi'a of Saudi Arabia: A Minority in Search of Cultural Authenticity, British Journal of Middle Eastern Studies, Vol. 25, No. 1, 1998, p. 121. See also: Toby Matthiesen, 'The Shi'a of Saudi Arabia at a Crossroads, Middle East Report Online (May 6, 2009),

٩- بۆ هەواڵی ئەو ڕووداوە بڕوانە:

^ BBC News. 15 March, 2002, Saudi police <stopped> fire rescue.

١٠- دەربارەی بزووتنەوەی ڕیفۆرمخوازی سعودیە بڕوانە:

Pascal Ménoret, The Saudi Enigma (London & New York: Zed Books, 2005). See also: Daryl Champion, The Paradoxical Kingdom: Saudi Arabia and the Momentum of Reform (New York: Columbia University Press, 2003).

١١- بڕوانە:

Roel and and Aarts, Paul (2012). Riyadh Programme. (eds. Amsetrdam. p.32.

١٢-بۆ پەیوەندی نێوان بەهاری عەرەبیو سعودیە بڕوانە:

Jones, Toby Craig. <Saudi Arabia Versus the Arab Spring>, Raritan: A Quarterly review, Rutgers University, p.43-59.

١٣- بڕوانە:

Bernard Haykel, 'Saudi Arabia vs. the Arab Spring, Project Syndicate (16-8-2011), www.project-syndicate.org, website accessed in November 2011. See also: Mehran Kamrava, 'The Arab Spring and the Saudi-Led Counterrevolution, Orbis, Volume 56, Issue 1 (2012), pp. 96-104.

١٤- بڕوانە:

Jones, Toby Craig. <Saudi Arabia Versus the Arab Spring>, Raritan: A Quarterly review, Rutgers University, p.43-59.

١٥- بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٩.

Impulse in Saudi Arabia,East Journal Vol. 57, No. 3 (2003), pp. 400-414. See also Roel Meijer, 'Liberals in Saudi Arabia,

paper presented at the 2011 Gulf Research Meeting, workshop on 'Potential and Limits of Civil Society in the Gulf Region, University of Cambridge (July 6–9, 2011).

# بەشی شەشەم

## کورد و پرۆژە گەورەکان

## ئیسرائیل و ئەمەریکا: تێکەڵبوونی ترس و نەوت و قازانج بەیەکتری

# ئیسرائیل و ئەمەریکا: تێکەڵبوونی ترس و نەوت و قازانج بەیەکتری

**سەرەتا**

قسەکردن لەسەر هاوکێشەکانی هێز و دەسەڵات لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەبێ قسەکردن لەسەر پرۆژەی ئیسرائیل و ئەمەریکا بۆ ناوچەکە کارێکی نەکردەیە. ئەم دوو هێزە کاریگەریی گەورەیان لەسەر ڕووداوەکانی ناوچەکە و لەسەر ڕێزبەستنە سیاسییە گەورەکان و لەسەر چۆنیەتیی ئیدارەدان و ئاراستەکردنی ململنێکان لە ناوچەکەدا هەیە.

**ئیسرائیل و ناوچەکە**

لە ڕۆژی دروستبوونیەوە ئیسرائیل کێشەی گەورەی لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە، ئەم وڵاتانە نەک تەنها بوونی ئیسرائیل وەک دەوڵەت لە ناوچەکەدا بە دروستکراوێکی ئیمپریالی دادەنێن و ساڵانێکی درێژە ئامادە نەبوون هیچ پەیوەندییەکی دیپلۆماسی و ئابووری و فەرهەنگیی لەگەڵدا ببەستن، بەڵکو ئامادەش نەبوون دان

بە بوونیدا بنێن. ئەم دۆخە بووە هۆکاری دروستبوونی کۆمەڵێک جەنگی خوێناوی و وێرانکارییەکی گەورە لە ناوچەکەدا، بەڵام سەرجەمی ئەو جەنگانە لە قازانجی ئیسرائیل و بە زیانی عەرەبەکان بەگشتی و فەلەستینییەکان بەتایبەتی شکاوەتەوە. بە درێژایی مێژووی دروستبوونی وەک دەوڵەت، ئیسرائیل دەیهوێت بە عەرەب و ناوچەکەی بسەلمێنێت کە یەکەیەکی سیاسیی لەبنەهاتووە و دروست بووە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە. هەروەها دەیەوێت بە دەوڵەتانی ناوچەکە بڵێت ئیسرائیل دەوڵەتێکە باشترە بۆ هەموو لایەک وەک بەشێک لە سیستمێکی ئیقلیمی قبووڵی بکەن، نەک بیر لە وێرانکردنی بکەنەوە و هەوڵی لەناوبردنی بدەن. پرۆژەی ئیسرائیل لە ناوچەکەدا ئەم ویستە تایبەتە ئاراستەی دەکات، مەبەستم ویستی مانەوە و قبووڵکردنی ئیسرائیلە وەک هێزێکی گەورە لە ناوچەکەدا، نەک هیچ دید و خەونێکی ئایدیۆلۆژی و دینی و فەرهەنگی. لە ڕاستیدا ئەوەی ئەم دیدە دەسەلمێنێت سڵنەکردنەوەی ئیسرائیلە تەنانەت بۆ کارکردن لەگەڵە ئایەتوڵلاکانی تاراندا دوای بەرپابوونی جەنگی ئێران-عێراق و فرۆشتنی چەک لانی کەم تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٣ بە ئێرانێک کە لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە دوژمنێکی سەرسەختی ئیسرائیلە.

هەندێک لە وڵاتە عەرەبییەکان زوو گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ناکرێت ئیسرائیل لەناو ببرێت، عەرەب لەوە لاوازتر و پارچەپارچەترە بتوانێت ئیسرائیل فڕێ بداتە ناو دەریاوە، بۆیە هەوڵی ڕێککەوتنیان لەگەڵدا دا. میسر لە ساڵی ١٩٧٩دا ڕێککەوتننامەی ئاشتیی لەگەڵ ئیسرائیلدا ئیمزا کرد، لە ساڵی

١٩٩٤دا ئیسرائیل و ئەردەن هەمان ڕێککەوتننامەیان ئیمزا کرد، ئەگەرچی سعودیە و مەغریب و وڵاتانی کەنداو ڕێککەوتنی ڕەسمییان لەگەڵ ئیسرائیلدا نییە، بەڵام ئەو گوتارە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەشیان نییە کە ئیسرائیل وەک دوژمنی سەرەکیی عەرەب ببینێت و بەرەنگاربوونەوەی ئیسرائیل بە ئەرکی سەرەکی ئوممەی عەرەبی بزانێت. هاوکات ئیسرائیل زۆر بەوردی تەماشای پرۆسەی بەهێزبوون و خۆچەکدارکردنی وڵاتانی ناوچەکە دەکات و ناهێڵێت هیچ یەکێک لەو وڵاتانە هێزێکی قابیلی هەڕەشە بۆ سەر ئیسرائیل، دروست بکەن. ئەم ستراتیژە وای کرد ئیسرائیل، بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٨١ کۆمەڵێک پێگەی سەربازیی عێراق بۆمباران و وێران بکات، کە گومانی ئەوەی لێ دەکرا سەدام حوسەین تیایاندا بەرنامەی دروستکردنی چەکی ئەتۆمیی هەبێت.

تا جەنگی کوەیتی ساڵی ١٩٩١ سیاسەتی ئیسرائیل لەسەر بوون بە دۆستی وڵاتە ناعەرەبییەکانی ناوچەکە دروست بووبوو، بوون بە دۆستی تورکیا، هەوڵدان بۆ نزیکبوونەوە لە ئێران و ئەسیوبیا، تەوەرە سەرەکییەکانی بوو، بەڵام لەگەڵ لاوازبوون و دواتر کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین و لەگەڵ گۆڕانی لەسەرخۆی ئێرانی جمهوریی ئیسلامی بۆ هێزێکی ئیقلیمیی گەورە، ئەم سیاسەتەی ئیسرائیل گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا هات. شارەزایەکی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەم گۆڕانە بە "تسونامییەکی جیۆسیاسی" ناو دەبات. لە ئێستادا ئیسرائیل نەک تەنها ڕێککەوتنی لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکان هەیە، بەڵکو تەنانەت دەتوانێت پشت

بە هاریکاریی هەندێک لە وڵاتە عەرەبییەکانیش ببەستێت، بەتایبەتی وڵاتی سعودیە و میرنشینەکانی کەنداو. لە ململانێی ناوچەیی نێوان ئیسرائیل و ئێراندا، ئەم وڵاتە عەرەبییانە، هاوسەنگەری ئیسرائیلن. ململانێی نێوان ئیسرائیل و ئێران لە ناوچەکەدا یەکێکە لە ململانێ گەورەکان، ئەمڕۆ ئەم ململانێ سیاسییە ئاکارێکی دینیی وەر گرتوە، ئەمە وای کردوە ئەو گوتارە عەلمانییە تەقلیدییە دژ بە ئیمپریالیزم و زایۆنیزمەی سووریا و هێزە چەپەکانی عەرەب هەڵگرین، ئەو قورساییەی جارانیان نەمابێت. لەباتیی ئەمە گوتارێکی دینی دروست بووە کە جەنگ لەگەڵ ئیسرائیلدا وەک جیهادێکی دینی وێنا دەکات و مردن لەو جەنگەشدا وەک شەهادەتی دینی دەناسێنێت.

گۆڕانی ڕاستەقینە لە هێزی وڵاتانی ناوچەکەدا دوای جەنگی کوەیتی ساڵی ١٩٩١ دەست پێ دەکات، لەم جەنگەدا عێراق، کە یەکێک لە دوژمنە سەرسەختەکانی ئێران بوو، بە شێوەیەکی گەورە لاواز بوو، کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەینیش لە ساڵی ٢٠٠٣دا، هێزی ئێرانی لە ناوچەکەدا زۆر زیاتر کرد. لەمڕۆدا تێکچوونی پەیوەندیی نێوان ئێران و ئیسرائیل پەیوەندیی بەم گۆڕانکارییە جیۆپۆلیتیکییە گەورەیەوە هەیە، نەک بە دوژمنایەتییەکی ئایدیۆلۆژییەوە. کێشەی ئیسرائیل لەگەڵ ئێراندا کێشەیەکی ئایدیۆلۆژی و دینی نییە، بەڵکو کێشەی پڕکردنەوی ئەو بۆشاییە گەورەیە کە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد و لاوازبوونی دەوڵەتە دۆستەکانی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا دروست بووە.

**ئیسرائیل و تورکیا**

تا چەند ساڵێک لەمەوبەر پەیوەندیی نێوان ئیسرائیل و تورکیا هێجگار بەهێز و فرەلایەن بوو، نەک تەنها پەیوەندی ئابووری و دیپلۆماسی، بەڵکو پەیوەندیی سەربازیی بەهێزیشیان هەبوو. ئیسرائیل یەکێک بوو لەو وڵاتانەی کە چەک و تفاقێکی زۆری بە تورکیا فرۆشتوە، هاوکات کاری سەربازیی هاوبەش و مەشقی سەربازیی پێکەوەیی بەشێک بوو لە پەیوەندیی نێوان ئەو دوو وڵاتە. ئاستێکی تری پەیوەندی نێوان ئیسرائیل و تورکیا پەیوەندیی بە تێگەیشتنی تورکیاوە هەیە لە هێز و کاریگەریی ئیسرائیل لە ئەمەریکادا. تورکیا خۆی کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەناو ئەمەریکادا نییە، ژمارەی ئەو تورکانەی لە ئەمەریکادا دەژین کەمن و بەراورد ناکرێن، بۆ نموونە، بە ژمارەی یۆنانی و ئەرمەنییەکان لە ئەمەریکادا. هەم یۆنانی و هەم ئەرمەنییەکانیش دوو دوژمنی سەرەکیی تورکیان. بۆیە تورکیا باوەڕی وایە دەتوانێت لە ڕێگای پەیوەندییەکی باشەوە لەگەڵ ئیسرائیلدا کاریگەریی لۆبیی ئیسرائیلی لەسەر سیاسەتی ئەمهریکی بە قازانجی خۆی بشکێنێتەوە.

لە ئێستادا پەیوەندیی نێوان ئیسرائیل و تورکیا هەندێک گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، وەک لە بەشی یەکەمی ئەم زنیجرە وتارەدا باسم کرد، تورکیا دەیەوێت لە وڵاتە عەرەبییەکان نزیک بکەوێتەوە و سوود لەو گوتارە ئیسلامییە ببینێت کە دۆستی لە ناوچەکەدا بۆ دروست دەکات. لە چەند ساڵی ڕابردووشدا زیاد لە جارێک پێکدادان لەنێوان دید و سیاسەتەکانی ئیسرائیل و ئەوانەی تورکیادا ڕوویان داوە.

بەڵام هەموو ئەمانە مانای ئەوە نییە کە تورکیا تا ئێستاش یەکێک نییە لە دۆستە گەورە و نزیکەکانی ئیسرائیل.

**ئیسرائیل و فەلەستینییەکان**

ململانێی نێوان ئیسرائیلییەکان و فەلەستینییەکان بەشێکە لە مێژووی سەدەی بیستەم لە ناوچەکەدا. ئەم ململانێیە لەم مێژووە درێژەدا شێوازی جیاوازی گرتۆتە خۆی، لە جەنگی گەورەی نێوان دەوڵەتە عەرەبییەکان و ئیسرائیلەوە بۆ خەباتی چەکداری و لەوانیشەوە بۆ راپەڕین و خۆپیشاندانی ڕۆژانەی بێچەک، تا بە تاکتیکی خۆتەقاندنەوە و گۆڕینی لەشی ئینسان بە بۆمبایەکی گەڕۆک. سەرەتا ئەم ململانێیانە لەنێوان ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبییەکاندا بوو، دواتر بووە ململانێی ئەو وڵاتە لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستیندا. لە کۆتایی هەشتاکانیشەوە ئیسرائیل ڕووبەڕووی کۆمەڵگای فەلەستینی بووەوە، لە "ئینتیفازەی یەکەمدا" کە لەساڵی ١٩٨٧دا دەستی پێ کرد، ئیسرائیل ڕووی بە ڕووی ئەو منداڵە فەلەستینیانەدا تەقییەوە کە لە ساڵانی هەفتا و هەشتادا گەورە ببوون و چەکی سەرەکییان بەردهاویشتن بوو. یەکەم جار منداڵانی ئۆردوگای جەبەلیە بەردیان هەڵگرت، بەڵام دواتر هەموو ناوچەکانی غەززە و زیفەی غەربی و ڕۆژهەڵاتی قودسیشی گرتەوە. وێنەکانی ئەم ململانێ ڕۆژانەیە لەنێوان منداڵانی بەردبەدەست و بەهێزترین و پڕچەکترین لەشکر لە ناوچەکەدا بوون بە وێنە هەرە ئامادە و بەهێزەکانی سەر شاشەی تەلەفیزۆنەکانی دونیا. ئیسرائیل جەنگە سەربازییەکەی بردەوە، بەڵام ئەم جەنگە میدیاییەی

دۆڕاند. لەژێر فشاری ئەم دۆخەدا ئیسرائیل لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٣دا ناچار بوو لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی لەژێر سەرکردایەتیی یاسر عەرەفاتدا لە نەرویج دەست بکەن بە گفتوگۆ. ئەم گفتوگۆیانە بە "ڕێکەوتننامەکانی ئۆسلۆ" ناسراون. بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە ئیسرائیل دانی بەوەدا نا کە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی نوێنەری میللەتی فەلەستینییە و ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینییش بەرەسمی دانی نا بە بوونی ئیسرائیلدا وەک دەوڵەتێک لە ناوچەکەدا، بەڵام لە ساڵانی دواتردا بەندەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە جێبەجێ نەکران و ململانێی نێوان هەردوو لا بەردەوام بوو تا تەقینەوەی "ئینتیفازەی دووهەم" لە ساڵی ٢٠٠٠دا. لەم ڕاپەڕینە تازەیەدا فەلەستینییەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان پەنایان بۆ تەکتیکی خۆتەقاندنەوە و گەیاندنی زۆرترین زیان بە خەڵکی مەدەنیی ئیسرائیل برد. ئەم دۆخە نوێیە ژمارەیەکی هێجگار زۆر قوربانیی لێ کەوتەوە. گرنگترین کاردانەوەی ئیسرائیل بەرامبەر بەم دۆخە نوێیە دروستکردنی دیوارێکی درێژ و بەرز بوو بۆ دابڕانی ناوچە فەلەستینییەکان لە ئیسرائیل. ئەم دیوارەی ئیسرائیل ٦٥٠ کیلۆمەتر درێژە، واتە زیاد لە ٤ جار درێژترە لە دیواری بەرلین و ٨ مەتریش بەرزە، دیواری بەرلین ٣.٦ مەتر بەرز بوو.

ململانێی ئیسرائیل لەگەڵ فەلەستینییەکاندا بەشێکە لە کێشە هەرە گەورە و سەرەکییەکانی ناوچەکە و جیهانیش. ئەمڕۆ ئەم ململانێیە تا دێت لە ململانێیەکی نەتەوەیی و کۆلۆنیالییەوە دەگۆڕێت بۆ ململانێیەکی دینی. دەبێتە

ململانێی نێوان ئیسلام لە لایەکەوە و ئایینی جوولەکە و مەسیحیەتلە لایەکەی ترەوە. ئەم گۆڕانە وای کردووە هەم لەناو ئیسرائیلدا هێزی دینیی توندڕە و دروست ببن و هەم بەشی هەرەزۆری ئەو هێزانەی ئەمڕۆ بە گژ ئیسرائیلدا بچێتەوە هێز و ڕێکخراوی دینی بن. ئەم گۆڕانە وای کردوە بەسیاسیکردنی دین و ئامادەگیی هێزە دینییەکان لە ناوچەکەدا بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی لە هەموو کات زیاتر بێت.

## ئەمەریکا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست

لە دوای جەنگی جیهانی دووهەمەوە، ئەمەریکا گەمەکەری هەرەسەرەکییە لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. بە درێژاییی ساڵانی جەنگی سارد، ئەمەریکا چوار دۆستی گەورەی لەم ناوچەیەدا هەبوو کە بریتین لە ئیسرائیل و ئێرانی سەردەمی شا و تورکیا و عەرەبستانی سعودیە. بەشەکانی تری ناوچەکە یان دۆستی سۆڤیەت و دژەئەمەریکا بوون، یان بێلایەن بوون. لەم ململانێیەدا ئەمەریکا هێزە سەربازی و ئابووری و میدیایی و ئایدۆلۆژییەکەی بە هەموو شێوەیەک خستبووە گەڕ بۆ هاریکاریکردنی ئەم وڵاتانە و بەگژاچوونەوەی نفوزی سۆڤیەتی لە ناوچەکەدا. لەدوای شۆڕشی ئێرانییەوە ئێران لەم هاوکێشە ئەمهریکییە چووە دەرەوە و بوو بە یەکێک لە دەوڵەتە ناحەزەکانی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا، بەڵام ئێرانی دوای شۆڕشی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩ ئێرانێک نەبوو بە ناوی دیموکراسیەت و مافی مرۆڤ و ڕێزگرتن لە جیاوازییەوە بدوێت، بەڵکو وڵاتێک بوو بە

ناوی ئایدیۆلۆژیایەکی ئیسلامیی شیعیی ڕادیکاڵەوە دوا، کە دونیای لەسەر دابەشکردنێکی دینی بۆ بەرەیەکی شەیتانی و بەرەیەکی ڕەحمانی دابەش دەکرد. ڕاستە ئەم دابەشکردنە ئایدیۆلۆژییەی دونیا ئەو پاڵنەرە نییە لەپشتی سیاسەتی ئێرانییەوە، چونکە ئێران ئامادەیە لەگەڵ زۆر هێزدا کار بکات کە تەواو ناکۆکە بە ئایدیۆلۆژیا دینییەکەی، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە لە پەیوەندیدا بە ئەمەریکاوە ئەم دیدە ئایدیۆلۆژییەی ئێران هیچ کاریگەرییەکی لەسەر دانیشتووانی ناوچەکە نەبووە. لە دوای بەهێزبوونی ئێرانەوە لە ناوچەکەدا ئەمەریکا ناچار بووە ڕێککەوتنامەی پاراستنی ئاسایشی دوولایەنە لەگەڵ زۆربەی وڵاتانی کەنداودا ئیمزا بکات، ئەمەش مانای ئەوەی ئەمەریکا لە ڕێگای ئەو وڵاتانەوە بووە بە هاوسنووری ئێران.

تورکیا تا ئەمڕۆ یەکێکە لە دۆستە ستراتیژییە گەورەکانی ئەمەریکا، بە درێژایی پەنجا ساڵی ڕابردوو پەیوەندییەکی پتەو و هەمەلایەن لەنێوان تورکیا و ئەمەریکادا هەبووە، ئەگەرچی ئەمڕۆ جۆرێک لەزویربوون و ئاڵۆزی لەم پەیوەندیەدا دروست بووە. بەتایبەتی لە دوای ئەوەی پەرلەمانی تورکیا لەکاتی جەنگی ئەمەریکا دژ بە ڕژێمەکەی سەدام حوسەین لە ساڵی ٢٠٠٣دا ڕێگەی بە هێزەکانی ئەمەریکا نەدا لە خاکی تورکیاوە پەلاماری ڕژێمەکەی سەدام حوسەین بدەن، بەڵام ئەم زویربوونە زیانی قابیلی باسکردنی لە پەیوەندیی نێوان تورکیا و ئەمەریکا نەداوە. ئەمەریکا و تورکیا تا ئەمڕۆش پەیوەندیی سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازیی بەهێزیان

لەگەڵ یەکدا هەیە. لەگەڵ هاتنی ئۆباماشدا بۆ کۆشکی سپی، پەیوەندی ئەمەریکا و تورکیا باشبوونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە. لە مانگی ٤ی ساڵی ٢٠٠٩دا ئۆباما لە پەرلەمانی تورکیا قسەی کرد و باسی لە"شەراکەتی نموونەیی" کرد لەنێوان ئەمەریکا و تورکیادا. مەبەست لەم شەراکەتەش کارکردنی پێکەوەیی ئەو دوو وڵاتەیە لەو شوێنانەدا کە قازانج و مەسڵەحەتی ئەو دوو وڵاتە بەیەکدی دەگەن و یەکتری دەبڕن، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئاشکرایە تورکیا لە چەند ساڵی ڕابردوودا جۆرێک سەربەخۆیی لە سیاسەت و هەڵوێستوەرگرتنیدا لە ناوچەکە و جیهاندا بەدەست هێناوە. ئەمەش وای کردوە تورکیا زۆر لەوە زیاتر بێت کە دەوڵەتێکی گوێلەمستی ئەمەریکا بێت. بۆ نموونە لە مانگی ٥ی ساڵی ٢٠١٠دا تورکیا لهنەتەوە یەکگرتووەکان دژی تازەکردنەوەی دەورەیەکی تر لە گەمارۆدانی ئابووری دژ بە ئێران دەنگی دا و بەگوێی ئەمهریکییەکانی نەکرد.

وڵاتانی کەنداو و عێراقیش وەک دۆستی ئەمەریکا وێنا دەکرێن و ئەمەریکا بەنیاز بوو لە ڕێگای لابردنی ڕژێمەکەی عێراقەوە ناوچەکە بکاتە ناوچەیەکی دیموکراسی. خەونی کۆنزەرڤاتیڤە تازەکانی ئەمەریکا ئەوە بوو کە ئەمەریکا هێزە سەربازی و ئابوورییە گەورەکەی بخاتە کار بۆ بڵاوکردنەوەی دیموکراسیەت بە دونیادا ، بەڵام جەنگی دە ساڵەی ئەمەریکا لە دوای ١١ سێپتێمبەرەوە لە ناوچەکەدا، و ئەو زیانە گەورانەی ئەمەریکا لەم جەنگانەدا کردوویەتی، ئەمەریکای ناچار کرد واز لە خەونی کۆنزەرڤاتیڤە نوێکان

بۆ بڵاوکردنـەوەی دیموکراسـیەت بـە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا بهێنێت.

ئەمـڕۆ سیاسـەتی ئەمەریکـی لـە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا وەک هەمیشـە دوو مەبەسـتی سـەرەکیی هەیـە. یەکەمیـان پاراسـتنی نەوتـی ناوچەکـە و مسـۆگەرکردنی گەیشـتنی ئـەم نەوتـە بـە ئەمەریکا بـە نرخێکی ماقووڵ. دووهەمیان پاراستنی ئەمن و ئاساییشـی ئیسـرائیل لـە ڕێگای ڕێگەگرتن لـە گۆڕینی تـەرازووی هێـز لـە ناوچەکـەدا بـە زیانـی ئیسـرائیل. لـە دوای ١١ی سێپتێمبەریشـەوە بەگژاچوونـەوەی تیرۆریـزم بەشـێکی گرنگی سیاسـەتی دەرەوەی ئەمەریکا بوو لـە ناوچەکـەدا، بەڵام ئەمـڕۆ ئـەم ڕەهەنـدەی سیاسـەتی ئەمەریکـی ئـەو گرنگییـەی نەمـاوە، بەتایبەتی لـە دوای خستنی ڕژێمەکـەی تاڵیبان و دوای خسـتنی ڕژێمەکـەی سـەدام حوسـەین و وێرانکردنـی بەشـێکی زۆری هێـزە سـەربازییەکەی ئـەل قاعیـدە لـە ناوچەکـە و لـە دونیـادا.

### ئەمەریکا و ئیسرائیل و ئێران

ئـەوەی ئەمـڕۆ لـە ناوچەکـەدا گـۆڕاوە بەهێزبوونـی ئێـران و ئـەو هێـزە شـیعە ناوچەییەیـە کـە لـە ئێرانـەوە نزیکـن، لەوانـە حوکمڕانانیی عێراق، حیزبوڵڵای لوبنانـی، ڕژێمەکەی سـووریا، حەماسـی فەلەسـتینی هتـد... ئـەم بـەرە تازەیـە بەرەیەکـە پەیوەندییەکـی زەحمـەت و پڕکێشـەی لەگـەڵ ئیسـرائیلدا هەیـە. بوونـی ئێرانیـش بـە هێزێکـی ئەتۆمـی لـە ناوچەکـەدا هەڕەشـەیەکی ڕاسـتەوخۆیە لەسـەر ئیسـرائیل و دروسـتبوونی

گۆڕانێکی گەورەشە لە هاوسەنگیی پەیوەندییەکانی هێز لە ناوچەکەدا. بۆیە هەم ئەمەریکا و هەم ئیسرائیل و هەم وڵاتە عەرەبییەکانی ناوچەکە ترسێکی گەورەیان لە بوونی ئێران بە هێزێکی ئەتۆمی هەیە. لە ڕاستیدا ڕێگرتن لەوەی ئێران ببێت بە هێزێکی ئەتۆمی هێڵە هەرەسەرەکییەکانی سیاسەتی ئەمهریکی و سیاسەتی ئیسرائیل و سیاسەتی عەرەبستانی سعودییە و وڵاتانی کەنداو و سیاسەتی تورکیاشە. بوونی ئێران بە هێزێکی ئەتۆمی هەڕەشەیە بۆ سەر هەموو ئەو لایەنانە. ئەم کودەنگییە وای کردوە سیاسەتی دیالۆگ لەگەڵ ئێراندا بگۆڕێت بۆ "دیپلۆماسیەتی فشاردانان"، لە ئێستادا فشارەکان لە فۆرمی ئابلۆقەیەکی ئابووریی وێرانەکەردا بەرجەستەیە، کە ئابووریی ئێرانی لە ناوەوە وێران کردووە. جەنگی میدیایش لەگەڵ ئێراندا جەنگێکی واقیعییەوە و دەستی پێ کردووە. هەڕەشەش بە پەلاماردانی سەربازی و جووڵاندنی کەشتییە گەورە پڕ چەکە قورسەکانی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا، ئەمە جگە لە هەڕەشەی ئیسرائیلییەکان، بەشێکی بەرچاوی ئەو جەنگە میدیاییە کە لە ئێستادا لەئارادایە. ئەگەر جەنگ لە ناوچەکەدا دروست ببێت ئەگەری بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی تیایدا ئەگەرێکی کراوەیە.

## سنوورەکانی دەسەڵاتی ئەمەریکا و ئیسرائیل

تێڕوانینێکی هەڵە لە دونیای ئێمەدا ئامادەیە، کە پێی وایە ئەوەی ئەمەریکا و ئیسرائیل بیانەوێت، دەبێت بە واقیع و ئەنجام ئەدرێت. لەم تێڕوانینەدا ئەمەریکا و ئیسرائیل وەک

دوو هێز وێنا دەکرێن کە دەتوانن ویستی خۆیان بەسەر هەموو هێزەکانی تردا بسەپێنن، چی بخوازن و چۆنی بخوازن بەو شێوەیە دەیسەپێنن، بەڵام ئەم دیدە نەک تەنها دیدێکی ناڕاستە، بەڵکو مەترسیداریشە. ڕاستە ئەمەریکا و ئیسرائیل دوو گەمەکەری گەورەن، بەڵام ناتوانن ئەوەی دەیانەوێت، یان ئەوەی بیری لێ دەکەنەوە، بیکەن بە واقیع و بیسەپێنن. ئەمهریکییەکان لە عێراقدا نەیانتوانی بزووتنەوەکەی موقتەدا سەدر لەناو ببەن، گەرچی لە ساتێک لە ساتەکاندا ئەمە یەکێک لە ئامانجە گرنگەکانیان بوو. بە درێژایی ساڵانێکی درێژە ئیسرائیل دەیەوێت لە لوبناندا حیزبوڵڵا لەناو ببات، بەڵام بۆی ناکرێت. لەمەش سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە ئیسرائیل بەو هەموو هێزەی خۆیەوە ڕێکخراوێکی وەک حەماسی بۆ تەمێ ناکرێت. بۆیە هەڵەیە چاوەڕوانیی ئەوە بکرێت ئەمەریکا و ئیسرائیل بتوانن بەئاسانی ڕژێمی ئێرانی بڕوخێنن و شیعەکانی عێراقماڵی بکەن و حافز ئەسەد لە سووریا دەر پەڕێنن و حیزبوڵڵای لوبنانی لەناو ببەن، کۆتایی بە حەماس و هێزە جیهادییەکانی تر لە ناوچەکەدا بهێنن. هەموو ئەمانە هێزی مرۆیی و سەربازی و گەورەن و توانایەکی گەورەی بەرگریکردنیان لە خۆیان و لە دید و بۆچوونەکانی خۆیان هەیە. ئەمە مانای ئەوە نییە ئەم هێزانە ناکرێت فشاری گەورە و بەردەوامیان بخرێتە سەر، ناچار بە هەندێک ڕێککەوتن و تەنازولاتی سیاسی بکرێن، بەڵام ئەوەی پێمان وا بێت ئەم تەوەرە سیاسی و سەربازی و مرۆییە بەئاسانی لەناو ئەچێت، بۆ نموونە لە ڕێگای پەلاماردانی سەربازیی هەندێک

بنکەی بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی ئێرانەوە، هەڵەیەکی سیاسیی گەورەیە.

**کورد و ئەمەریکا و ئیسرائیل**

کورد لە جەنگی ئەمەریکا دژ بە ڕژێمەکەی سەدام حوسەین لە ساڵی ٢٠٠٣دا جێپێیەکی باشی بە ئەمەریکا بەخشی بۆ پەلاماردانی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین، بەتایبەتی کاتێک تورکیا ڕازی نەبوو سەربازە ئەمەریکییەکان لە خاکی تورکیاوە بەشداری شەڕەکە ببن. بەمەش کورد وێنەی خۆی وەک دۆستێکی گەورەی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا کێشا، لەدوای ئەمەشەوە لە هەرێمی کوردستاندا چەند گرێبەستێکی نەوتی لەگەڵ کۆمەڵێک لە کۆمپانیا ئەمەریکییەکاندا ئیمزا کراوە، جگە لەمە بە درێژایی مانەوەی ئەمەریکا لە عێراقدا یەک سەربازی ئەمەریکی لە کوردستاندا خوێن لە لووتی نەهاتوە. ئەمانە هەمووی خاڵی پۆزەتیڤن بۆ دروستبوونی پەیوەندییەکی تەندروست لەنێوان کوردستان و ئەمەریکادا، بەڵام هەموو ئەم خاڵانە نەیتوانیوە و ناشتوانێت لەگەڵ تورکیادا ململانێ بکات بۆ ڕاکێشانی ئەمەریکا بەلای خۆیدا. نووسەری ئیسرائیلی، ئۆفرا بینگیۆ لەم بارەیەوە دەڵێت کە مەسەلەی کورد جۆرێک لهێالۆزیی لەنێوان تورکیا و ئەمەریکادا دروست کرد، بەڵام کاتێک مەسەلەکان هەستیار دەبن و ئەمەریکا ناچار دەکرێت لایەن هەڵبژێرێت، هەمیشە دەچێتە پاڵ تورکیا. بە بۆچوونی من ئەم دۆخە بۆ سەرجەمی پەیوەندییەکانی تری ئەمەریکا لە ناوچەکەدا هەر ڕاستە. ئیسرائیلیش لە ناوچەکەدا لەناو هەمان هاوکێشەدا کار دەکات

و بیر دەکاتـەوە، واتـە بـۆ ئیسـرائیلیش ڕازیکردنـی دەوڵەتانـی ناوچەکـە لەڕازیکردنـی کـورد گرنگتـر و کاریگەرتـرە.

**دەرەنجامێکی گشتی**

ئـەوەی لـە کۆتایـی ئـەم زنجیرە وتـارەدا قابیلی لەسەروەستانە، ئەوەیـە کـە هیـچ یەکێـک لـەم چـوار پـرۆژە سیاسـییە گەورەیـە لـە ناوچەکـەدا، سـەرەڕای ناکۆکییـە ناوەکییەکانـی ناوخۆیـان و سـەرەڕای ناکۆکییـان لەگـەڵ یەکـدا، شـوێنێکی تێـدا نییـە بـۆ دروسـتکردنی دەوڵەتێکـی کـوردی. لـە بەرنامـەی هیـچ هێزێـک لـەو هێزانـەدا و لەنـاو هیـچ یەکێـک لـەو پرۆژانـەدا پلانێکی ڕاسـتەقینە ئامـادە نییـە دەوڵەتێـک بـۆ کـورد دروسـت بـکات. ئەگـەر لـە هەمـوو دونیـادا هێزێـک هەبێـت بیەوێـت دەوڵـەت بـۆ کـورد دروسـت بـکات کـورد خۆیەتـی، کۆمەڵـگای کوردییـە بـە هێـزی ناوەکیـی خـۆی، بـەڵام پرسـیار ئەوەیـە ئایـا کۆمەڵگای کوردی خـۆی دەتوانێت دەوڵەتێکی ڕاگەیەندراو لـە هەلومەرجـی ئەمڕۆکـەی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا دروسـت بکات و بپارێزێـت. دیـارە نـە ئەمەریکییـەکان و نـە ئیسـرائیل و نـە ئێران و نـە سـعودیە و وڵاتانـی کەنداو ئـەم کارە نـەک ناکـەن، بەڵکـو ئەگـەری دژایەتیکـردن یـان لانـی کـەم بەرگریلێنەکردنـی هەڵدەبژێـرن. ئـەوەی لـە کۆتایـی ئـەم زنجیـرە وتـارەدا قابیلـی لەسـەروەستانە هەڵوێسـتی تورکیایـە. ڕاسـتە گۆڕانێکـی بەرچـاو بەسـەر سیاسـەتی تورکیـادا بەرامبـەر بـە حکومەتـی هەرێـم و کوردسـتانی باشـوور هاتـووە. ڕاسـتە ئێسـتا ئەو وڵاتە پێشـوازی لـە سیاسـییە کوردەکان دەکات، بەتایبەتـی لـە سـەرۆکی پارتـی و ئەندامانـی تـری بنەماڵـەی بارزانـی. ڕاسـتە تورکیـا چـاوی

بڕیوەتە نەوت و غازی کوردستان، ڕاستە تورکیا هەرێم وەک بازاڕێکی سوودبەخش و وەک دەروازەیەک بۆ چوونە ناو عێراق دەبینێت، ڕاستە تورکیا لە ململانێیدا لەگەڵ ئێراندا لەپاڵ پارتی و سوننەکانی عێراقدایە، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا بەڕاست تورکیا دەبێت بەو وڵاتەی دەوڵەت بۆ کورد دروست بکات؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە بەڵێ پێویستی بە باوەڕکردن بە دروستبوونی موعجیزە هەیە. بە بۆچوونی من تورکیا کە باوەڕی وایە کورد گەر لەهئەفریقاش دەوڵەتێک دروست بکات ئەوان بڕۆن بیڕوخێنن، نابێتە ئەو هێزەی دەوڵەت بۆ کورد دروست بکات. تورکیا دەشێت هەرێمی کوردستان، بەتایبەت ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتی، وەک بەشێک لە تورکیا خۆی وێنا بکات، تەماحی ئەوەی هەبێت ئیمارەت یان ئیقلیمێکی نیمچە ئۆتۆنۆمیی لێ دروست بکات و بیشیپارێزێت. لە باشترین دۆخدا تورکیا ئەم بەشەی کوردستان وەک قوبرووسی باکوور مامەڵە بکات. بەڵام ئەمە سیناریۆی دروستکردنی دەوڵەت نییە، ئەمە دروستکردنی هەرێمێکە تورکیا تیایدا وەک ئاغایەک ئامادە بێت و کورد تیایدا وەک غوڵامێکی دەستلەسەرسنگ، تورکیا چی بوێت و چۆنی بوێت وا بەڕێوەی ببات و وا بەکاری بهێنێت، کوردیش گوێی بۆ بگرێت و سەری بۆ بلەقێنێت. ئەمەش جگە لە گۆڕینەوەی جۆرێک لە داگیرکردن بە جۆرێکی تر لە داگیرکردن، زیاتر نییە.

بەکورتی کۆمەڵگای ئێمە دراوسێی کۆمەڵێک دەوڵەت و میلەتە لە ناوچەکەدا کە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی لە هەر پارچەیەک لە پارچەکانی کوردستاندا وەک ئیهانەیەکی

نەتەوەیی و نیشتیمانی وێنا دەکەن، هەموو کارێکیش دەکەن بۆ ڕێگرتن لە دروستبوونی ئەم دەوڵەتە. ئەوەی دەمێنێتەوە هێزی کۆمەڵگای کوردستانی خۆیەتی، هێزی کورد خۆیەتی وەک نەتەوە، بەتایبەتی وەک نەتەوەیەکی سیاسی کە هەڵگری ستراتیژێکی سیاسی یەکگرتوو و قبووڵکراو بێت لەلایەن هێزە گەورەکانی ناو کۆمەڵگای کوردییەوە. ئەوەی ئەمڕۆ کورد نییەتی بوونی ئەو ستراتیژە سیاسییەیە، نەک هەر ئەمە، بەڵکو هەر پارچەیەک لە پارچەکانی کوردستان تەواو لە ڕووی سیاسییەوە پارچەپارچە و دابەشبووە، پڕە لە هێزی سیاسیی ناکۆک و ناتەبا و دژ بەیەک، نەک تەنها لەگەڵ یەکتریدا، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵگای کوردیشدا، هێزی سیاسی داخراو و مۆنۆپۆڵخواز، شێوازی بنەماڵەیی و خێزانی دەسەڵاتداریتی، بەهێز لە گەندەڵی و لاواز لە دروستکردنی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی نوێدا، کە شوێنی هەموو کەرت و هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگای ئێمەی تێدا ببێتەوە

بەکورتی ئەگەر کۆمەڵگای ئێمە بە پلەی یەکەم کۆمەڵگایەکی بەرخۆری بێبەرهەم بێت و تیایدا بەرخۆریزم بە زۆر مانا شوێنی ناسیۆنالیزمی گرتبێتەوە، ئەگەر پرۆژە دینییەکانی ئەم کۆمەڵگایە پرۆژەی نادیموکراس و چەپێنەری ئازادی بن، ئەگەر دراوسێکانمان دراوسێی ناحەز و پڕ تەماحی بەهێز بن، ئەگەر واقیعی سیاسیی کوردستان واقیعی پارچەپارچەبوون و مۆنۆپۆڵیزەکردنی دەسەڵات و خراپ بەکارهێنانی بێت، ئەودەم توانا و ئەگەری دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی توانا و ئەگەرێکی هێجگار لاوازە. ڕاستە کۆمەڵگای ئێمە ئەگەری گەورە و گرنگی گۆڕانکاریی

تێدایە، بەڵام ئەو عەقڵیەت و شێوازی حوکمڕانی و مۆدێلە سیاسییانەی ئەمڕۆ باڵادەستن، ئەم ئەگەرانە نەک گەورە ناکەن و هیچ توانایەکی ئەوەیان تێدا نییە هیچ ئەگەرێک لە ئەگەرەوە بکەن بە واقیعێکی دروستکراو و بەرجەستە، بەڵکو لەسەر لەدەستدان و فەوتاندنی ئەو ئەگەرانە دەژین. بۆ ئەوەی دونیای ئێمە بتوانێت بگۆڕێت، شێوازێکی تەواو جیاوازی سیاسەتکردن و حوکمڕانی پێویستە. عەقڵیەتێک پێویستە لە هەوڵی بونیادنانی ئاشتی و ئارامییەکی ناوەکیی دوورخایەن و پەیوەندییەکی ناورژێنەری دوور لە عەنتەریاتی سیاسی بە دەوروبەرەوە بێت. ئەوەی پێویستە هەوڵێکی ڕاستەقینەی بەسیاسیکردنی ئینسان و کۆمەڵگای ئێمە بە شێوەیەک مشوورخواردنی ئینسانی ئێمە بۆخۆی بەشێک بێت لە مشوورخواردنی بۆ ئەو دونیایەی تیایدا دەژی. ئینسانێک خۆی بە هاونیشتیمانەییەکی خاوەن ماف و خاوەن ڕێز و خاوەن قورسایی بزانێت، نەک بە ڕەعیەتێکی بێمافی ئەم یان ئەو خێزان و بنەماڵەی سیاسی.

ئەوەی شوێنی لەسەرڕاوەستانە ئەوەیە: لە کاتێکدا دەسەڵاتدارانی کوردستان ئینسان و کۆمەڵگای ئێمە لە سیاسەت دادەبڕن و هەوڵ ئەدەن لە ڕێگای بەرخۆرییەوە ئارامییەکی کۆمەڵایەتیی لەق و کاتی دروست بکەن، لە کاتێکدا بەرخۆریزم دەکەنە ئایدیۆلۆژیا و کولتووری باڵادەست لە کوردستاندا، ڕێک لەو کاتەدا فوو بە گوتارێکی ناسیۆنالیستیی بۆش و بێناوەرۆکیشدا دەکەن و دەیانەوێت کۆمەڵگای ئێمە لەپاڵ ئەم گوتارەدا گیرۆدەی چاوەڕوانیی هەڵە و ناڕاست و نابەرپرسیار بکەن. دەرچوون لەم دۆخە

ئالوده‌یـه‌ هه‌نـگاوی یه‌كه‌مـی گواسـتنه‌وه‌یه‌ بـه‌ره‌و دۆخێكـی نـوێ، كـه‌ تیایدا كۆمه‌ڵگای ئێمـه‌ بتوانێت بـه‌وردی بیـر لـه‌ خـۆی و بیـر لـه‌ ئاییـنـده‌ بكاتـه‌وه‌.